



# بیرەوەریەکانی جێرزی کوکوشکا

وەرگێڕان لە فارسی بۆ کوردی عوسمان هاشمیزاد

هەولێر - ٢٠١٢

# کورته ژیان و بەسەرهاتی سێ هاوڕێی شاخ

**بیرەوەریەکانی جێرزی کوکوشکا**

سەرچاوە: گۆڤاری «کێو»

وەرگێڕانی لە فارسی بۆ کوردی: عوسمان هاشمیزاد

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب: | بیرەوەریەکانی جیرزی کوکوشکا |
| سەرچاوە: | گۆڤاری «کێو» |
| وەرگێران: | عوسمان هاشمیزاد |
| دیزاین،مونتاژ: | ساسان اقائی papia |
| پیتچن: | پەروین پیرەبابی |
| هەڵەچن: | تامیر کەریمی |

چاپی یەکەم. بەڕیوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری - هەولیر/ ٢٠١٢

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتیبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٧٩٠) ساڵی (٢٠١٢)ی پیدراوە



**کورتەی ژیان و بەسەرهاتی بەرزە شاخەوانی کوردستان محەممەدی ئەوراز**

محەممەدی ئەوراز لە ٢٥ی خەرمانانی ١٣٤٨ی هەتاوی لە شاری نەغەدە لە دایک بوو. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی هەر لەو شارە تەواو کرد و بۆ خوێندنی باڵا چووە زانستگای ورمێ بۆ بەشی ڕاهێنانی لەش. ساڵی ١٣٧٥ بۆ یەکەم جار لە کێبەرکێی شاخەوانی لە پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بەشداری کرد و پلەی یەکەمی وەدەست هێنا. پێویستە ئەوەش بگوترێ کە دوای تەواو کردنی خوێندنی دواناوەندی بۆ ماوەی دوو ساڵان چوو بۆ خزمەتی سەربازی و ساڵی ١٣٦٩، هاوکات لەگەڵ ئامادە کردنی خۆی بۆ زانستگا دەستی بە شاخەوانی کرد و هەر لە سەرەتای هەنگاوەکانییەوە دەریخست کە لەو بوارەدا تواناییەکی بێوێنەی هەیە. محەممەد سەبارەت بە شاخ و کێو ڕوانگەیەکی تایبەت بە خۆی هەبوو و هەر بەو هۆیەش بوو کە لە ماوەیەکی کەمدا توانی وێڕای سەرکەوتن لە شاخەکانی ناوچەی خۆمان لە هەلومەرجی زۆر ئەستەمی هاوین و زستان، زۆربەی چیا بەرزەکانی ئێرانی وەک سەهەند و سەبەلان و دەماوەند و هەزار و ئۆشترانکۆ و دینا و شێرکۆ

و ئەوانی تر بخاتە ژێر پێ. ئەو ڕێگایەی شاخەوانانی تر بە دەیان ساڵ تێکۆشابوون تێپەڕی کەن، ئەو تەنیا بە سێ چوار ساڵان بڕی و گەورەشاخەوانی تیمی میللی ئێران بە گوتەی مامۆستا (محەممەدی نووری): «محەممەدی ئەوراز بێچووە شارستانییەکی نەناسراو تا ئێمە لە خەو هەستاین ئەو هات و پێی لە سەر سەری ئێمە دانا و چوو

محەممەدی ئەوراز لە ٢٥ی خەرمانانی ١٣٤٨ی هەتاوی لە شاری نەغەدە لە دایک بوو. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی هەر لەو شارە تەواو کرد و بۆ خوێندنی باڵا چووە زانستگای ورمێ بۆ بەشی ڕاهێنانی لەش. ساڵی ١٣٧٥ بۆ یەکەم جار لە کێبەرکێی شاخەوانی لە پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بەشداری کرد و پلەی یەکەمی وەدەست هێنا. پێویستە ئەوەش بگوترێ کە دوای تەواو کردنی خوێندنی دواناوەندی بۆ ماوەی دوو ساڵان چوو بۆ خزمەتی سەربازی و ساڵی ١٣٦٩، هاوکات لەگەڵ ئامادە کردنی خۆی بۆ زانستگا دەستی بە شاخەوانی کرد و هەر لە سەرەتای هەنگاوەکانییەوە دەریخست کە لەو بوارەدا توانایيەکی بێوێنەی هەیە. محەممەد سەبارەت بە شاخ و کێو ڕوانگەیەکی تایبەت بە خۆی هەبوو و هەر بەو هۆیەش بوو کە لە ماوەیەکی کەمدا توانی وێڕای سەرکەوتن لە شاخەکانی ناوچەی خۆمان لە هەلومەرجی زۆر ئەستەمی هاوین و زستان، زۆربەی چیا بەرزەکانی ئێرانی وەک سەهەند و سەبەلان و دەماوەند و هەزار و ئۆشترانکو و دینا و شێرکۆ و ئەوانی تر بخاتە ژێر پێ. ئەو ڕێگایەی شاخەوانانی تر بە دەیان ساڵ تێکۆشابوون تێپەڕی کەن، ئەو تەنیا بە سێ چوار ساڵان بڕی و گەورەشاخەوانی تیمی میللی ئێران بە گوتەی مامۆستا (محەممەدی نووری): «محەممەدی ئەوراز بێچووە شارستانییەکی نەناسراو تا ئێمە لە خەو هەستاین ئەو هات و پێی لە سەر سەری ئێمە دانا و چوو هیمالییای بەزاند و گەڕایەوە.»

محەممەدی زۆر بەخێرایی پلە و پایەکانی شاخەوانیی ئێرانی بڕی و گەیشتە جێگایەک کە هیچ کەس بڕوای نەدەکرد وەرزیشی شاخەوانی ئێران ئاوا بەتوانا بەو ماوە کورتە بێنێتە بەر دەستی خۆی. لە ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی پاش بەشداری کردن لە چەند ئۆردووی شاخەوانی تیمی میللی ئێران، بە ئەندامی ئەو تیمە هەڵبژێردرا و نێردرا بۆ دەرەوەی وڵات بۆ پاکستان تا لووتکەی کێوی (ڕاکاپۆشی) بە بەرزایی ٧٧٤٤ میتر

لە زنجیرە کێوەکانی هیمالییای پاکستان ببەزێنێ کە لەو بەرنامەدا محەممەد سەلماندی کە لە نێو تیمەکەدا کەسایەتییەکی بێوێنەیە و سەروگەردنێک لە گشتیان بالاترە· ئەو بە سەرکەوتن بە سەر ئەو کێوەدا توانی میدالیای زێڕینی ئاسیا وەدەست بێنێ و جۆرێک خۆ بناسێنێ کە پاش گەڕانەوەی بەزوویی هەڵبژێرن بۆ بەزاندنی لووتکەی ئێوێرێست کە سالانێکی زۆر بوو ئێران خەونی پێوە دەدیت، ئەگەرچی یەک دوو جاری دیکە و پێشتر هەوڵیان بۆ دابوو، بەلام نەیانتوانیبوو سەربکەون و هەر بۆیەش زۆر تامەزرۆ بوون تا بتوانن بە سەر ئەو لووتکەیەدا زاڵ بن· ئەو جار بۆ ئەو مەبەستە لە بەهاری ساڵی ۱۳۷۷ی هەتاوی پاش تێپەڕکردنی دووبارەی چەند خولی شاخەوانی، محەممەدیان وەک باشترین ئەندامی تیم بەزوویی هەڵبژارد و بۆ وڵاتی نیپاڵ وەڕێکەوتن تا لاپەڕەیەکی سەرکەوتن و شانازی بۆ خۆیان و بۆ نەتەوەکەیان لە مێژوودا بنەخشێنن· لە حاڵێکا لە تیمی ئێران هیچ چاوەڕوان نەدەکرا سەرکەوتنێک وەدەست بێنێ، پاش دوو مانگ تێکۆشان زۆر بەتوانا و سەرکەوتووانە ئێوێرێست کەوتە ژێر پێی ئەو قارەمانانە و محەممەد دەورێکی سەرەکی و بەرچاوی تێدا بینی کە بوو بە هۆی کڕنۆش کردنی دونیای شاخەوانی ئێران لە بەرامبەر ئەودا کە ئەگەر بە وردی لە سەر ئەو بەرنامەیە بدوێین، ئەوجار بەڕاستی جێگە و پێگەی محەممەدیان لەو سەرکەوتنە مەزنەدا بۆ دەردەکەوێ کە توانی پلەی زێڕینی شاخەوانی بۆ ئەو وەرزیشە لە ئێران بەدەست بێنێ و ئەم وڵاتە بە ئاواتی لەمێژینەی خۆی بگەیەنێت· هەروەها نەجاتدانی شاخەوانی ئینگلیزی بە ناوی (بیرگریلز) لە مردن لەو کاتەدا کە هەڵدێردرابوو و دانەوەی بە دەستەی شاخەوانی خۆیان، ناوبانگێکی تایبەتی بۆ تیمی ئێران لە ناوچەی هیمالییادا دەرخست· لە کارە بەرچاوەکانی محەممەد لەو بەرنامەیە، پشتیوانیی زۆر بەتوانا لە شاخەوانانی تر و لێکردنەوەی ماسک لە دەمی لە سەر لووتکە بۆ ماوەی ٤٨ خولەک و ناردنی پەیام لە لووتکە بۆ بیس کەمپ (خێوەتگای تایبەت) نەجاتی شاخەوانی ئینگلیزی و هێنانەوەی کۆڵەپشتییەک بەرد لە لووتکەڕا بەدیاری و کەلک وەرنەگرتن لە هەر جۆرە دەوا و دەرمان و حەبی بەهێزکردن بوو کە ببوو مایەی سەرسووڕمانی گشت ئەندامانی تیم لەکاتێکا کە یەکەم ئەزموونی ۸۰۰۰ میتری ئەو دەهاتە ئەژمار·

کاتێک بە سەرکەوتنەوە لەو بەرنامە گەڕانەوە، بۆ ساڵی دواتر یانی ١٣٧٨ی هەتاوی، لە لایەن فیدراسیۆنی شاخەوانی و بۆ تێپەڕکردنی خولی ڕاهێنان ڕەوانەی (شامۆن)ی فەرەنسە دەکرێ و پاش دوو مانگ بە سەرکەوتنەوە دوو دیپلۆمی بەرپرسایەتی و کردنەوەی شوێنە ئەستەمەکان وەدەست دێنێ و سەرەفرازانە دەگەڕێتەوە زێد و نیشتمانەکەی خۆی و خۆ ئامادە دەکا بۆ بەرنامەیەکی چاوەڕوان‌نەکراوبۆ ساڵی ١٣٧٩ لە وڵاتی چین و تەبەت بۆ بەزاندنی دو کێوی بالای ٨٠٠٠ میتری لە هیمالییا بە ناوەکانی (چۆئایۆ) و (شیشاپانگما) لە وەرزێکی سەرکەوتندا ئەگەر بمانهەوێ بەوردی لە سەر کارەکانی بدوێین،محەممەد لە سەر ئەو دوو کێوە بە گوتەی هاوالانی خۆی کتێبێکە کە لێرەدا ناگونجێ و تەنیا ئەوەندەی باس دەکەین کە بێ محەممەد ئەوراز ئەو سەرکەوتنە محاڵ بوو و هەر لەو بەرنامەیەشدا بوو کە بۆیان دەرکەوت کە ئەو نەک تەنیا لە ئێراندا بێ‌وێنەیە، بەڵکوو لە تاکەکانی جیهانیش دێتە ئەژمار.

چیای (چۆئایۆ) بە بەرزایی ٨٢٠١ میتر و (شیشاپانگی) بە بەرزایی ٨٠٢٤ میتر لە بەر پێیدا بەزی و دوو میداڵیای زێوینی جیهانیان وەدەست هێنا. هەر لەو ساڵەدا بڕوانامەی لیسانسی وەرگرت و وەک یەکەم شاخەوانی ئێرانی تا ئەوکات، بڕوانامەی ڕاهێنانی پلەی یەکی وەرگرت کە تا ئەوکات لە ئێران کەس نەیتوانیبوو وەدەستی بێنێ و بوو بە سالاری شاخەوانی ئێران و تا ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی لێکردین ئەو پلەیەی بۆخۆی پاراست و هەر لەو ساڵەش ئێران بوو بە ئەندام و بەرپرسی شاخەوانیی ئاسیا و محەممەدیش بوو بە ڕاهێنەری لاوانی شاخەوانی ئاسیا.

ساڵی ١٣٨٠ کێوی زۆر ئەستەمی (ماکالۆ) بە بەرزایی ٨٤٦٣ میتر لە هیمالییا کەوتە بەر هەنگاوە قورس و قایمەکانی محەممەد و ئەو تەنیا کەسێک بوو کە بە بێ کەلک‌وەرگرتن لە کەپسووای ئۆکسیژێن زۆر بە هێز و تواناوە سەرکەوت و هەروەک لە فیلمی ئەو کێوەدا دەبیندرێ، کاتێک ئەندامانی تری تیم بە ماسک و کەپسوولی ئۆکسیژێنەوە زۆر بەدژواری و ناڕەحەتی سەردەکەون، ئەو بە بزێک لە سەر لێوانی و بنێشتی نێو زاری لەو هەڵە ئاستەمەی نیزیک لووتکە لەسەریان ڕاوەستاوە و ڕێنوێنییان دەکا و ئاگای لێیانە تا تووشی گرفت نەیەن

و بەم بەزاندنە بێوێنەیە میداڵیای زێڕینی جیهان دەکاتە ئەستۆ و سەرفرازییەکی تر بۆ نەتەوەکەی بەدیاری دێنێ.

ئەوجار نۆرە دەگاتە کێوی (لۆتسە) بە بەرزایی ٨٥١٦ میتر کە وەک چوارەمین لووتکەی بەرزی جیهان بەرامبەر بە ئێوێرێست ڕاوەستاوە. لێرەدا لاوی هەڵکەوتەی بۆکانی (موقبیل هونەرپەژوو) وەک لاوترین شاخەوان بە هەڵبژاردنی خۆی و پاش تێکۆشانێکی زۆر ئەو کێوەش دەبەزێ و بە سەرکەوتن بە سەر ئەو لووتکەدا ئەویش هەر بە بێ کەلک وەرگرتن لە کەپسوولی ئۆکسیژێن، میداڵێکی زێڕینی تر بە خەڵات دێنێ و موقبیلیش وەک لاوترین سەرکەوتووی ئەو لووتکەیە بە جیهان دەناسێنێ کە تاهەتایە ناوی ئەویش لە مێژوودا تۆمار دەکرێ، ئەوە ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی بوو.

ئەوجار بۆ ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوی بڕیار بوو بۆ یەکەم جار بۆ ژنانی ئێرانیش، بۆ بەزاندنی ئێوێرێست هەوڵ بدەن. خولەکانی بۆ دانان و پاش چەند خول تیمی هەڵبژاردەی خۆی بۆ ئەو بەرنامەیە دیاری کرد کە وێڕای سەرکەوتنی خوشکان بۆ ئێوێرێست، خۆشی بە بێ ئۆکسیژێن ئەو کێوەی بۆ جاری دووهەم ببەزێنێ؛ بەڵام بەداخەوە لە کاتی وەڕێکەوتن، ئەو بەرنامەیە بە هێندێک هۆ پەکی کەوت و ناچار هەر بۆ هاوینی ئەو ساڵە بەرنامەیان بۆ (گاشەربرۆمی ١) داڕشت و بە دڵئێشاوی و نابەدڵی وەڕێکەوت کە بەداخەوە پاش گێروگرفتێکی زۆر، لە ٢٦ی گەلاوێژی ١٣٨٢،کاتێک لەگەڵ موقبیل تەنیا ١٦٠ میتریان مابوو کە لووتکە ببەزێنن، بەداخەوە هەردووکیان کەوتنە بەر هەرەسی ڕنوو و زۆر بەتوندی بریندار بوون و پاش ٥ ڕۆژ توانیان لەو کێوە بیانهێننە خوار و بیانگەیەننە نەخۆشخانەی شفای ئیسلامئابادی پاکستان و پاش ٢٠ ڕۆژ بەربەرەکانی لەگەڵ مەرگ، محەممەدی ئەوراز ماڵئاوایی لێکردین و تەرمی پیرۆزی لە ٨٢/٦/٢٠ گەڕایەوە بۆ خاکی نیشتمان و لە داوێنی چیای (سوڵتان یاقووب)ی نەغەدە، یانی هەر ئەو شوێنەی هەنگاوی پیرۆزی نابووە سەر کێو، بە دایکی نیشتمان ئەسپێردرا و سەربەرزی و میداڵەکانی بۆ ئێمە و نیشتمانەکەی بەجێ هێشت.

---

نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا دەژین

~~یادی پیرۆز بێ~~

نووسینی مارفی ئەوراز



## کورتەی ژیانی موقبیل هونەرپەژوو

موقبیل هونەرپەژوو لە ڕۆژی ١٠ی پووشپەڕی ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی (١٩٨٣ز) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لە شاری بۆکان لە دایک بوو. خوێندنی سەرەتایی تا پۆلی دوازدەی دواناوەندی هەر لەو شارە تێپەڕ کرد و لە ساڵی ١٣٨٠ لە بەشی ئەلکترۆنیک دیپلۆمی وەرگرت و هەر لەو ساڵەدا لە بەشی ئەلکترۆنیکی زانکۆی ورمێ درێژەی بە خوێندن دا.

لە تەمەنی یازدە ساڵیدا دەستی کرد بە وەرزیش و لە سەرەتا کاراتە و کۆنگفۆی هەڵبژارد، بەڵام زۆر زوو جوانییەکانی سروشت سەرنجی ڕاکێشا و ژینگەی پێشکەوتوو گەورەترین هۆ بوو بۆ ئەوەی شاخەوانی هەڵبژێرێ.

موقبیل حەزی لە شاخەوانی و گۆرانی و مۆسیقای فۆلکلۆری کوردی بوو و ڕەنگی سوور یەکێک لەو ڕەنگانە بوو کە بە دیتنی گەش دەبۆوە. هەڵگەڕانی بە سەر شاخ و چیاکانی لە ناوچەی موکریان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە دەست پێکرد. زۆر زوو و بە سانایی بە سەر شاخەکانی

(بەردە زەرد، تەرەغە، بێژەنگ بە سەر و…)دا زاڵ بوو و پاش ماوەیەک کە ئەزموونی زیاتر بوو، هاورێ لەگەڵ گرووپە جیاجیاکان توانی ڕوو لە شاخە ناودارەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان و ئێران بکا، وەکوودەماوەند، سەبەلان، عەلەم کێو، قەندیل، ئوشتوران کێو، دێنا و…

ئەم شاخەوانە توانی بە بەشداری لە کلاسەکانی تایبەت بە شاخەوانی، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئەزموون وەدەست بخا، هەر بۆیە لە ساڵی ١٣٧٩ لە لایەن گرووپی نێونەتەوەیی شاخەوانیی ئێران، بانگێشتی ئۆردووەکانی ئەم گرووپە کرا. موقبیل زۆر سوور بوو لە سەر ئەوەی کە ببێ بە یەکێک لە ئەندامانی گرووپی نێونەتەوەیی شاخەوانی. هەر لەو ساڵەدا لەگەڵ گەورە شاخەوانی کوردستان و جیهان، محەممەد ئەوراز ئاشنا بوو.

ساڵی ١٣٨٠ بەم هویە کە لە چالاکی وەرزیشیدا بەشداریکی زۆری کردبوو، لە بەشی ئەلکترۆنیکی زانکۆ ڕێگایان لە خوێندنی گرت و دەریان کرد. بەلام بەو گرفتانە ورەی بەرزی شاخەوان نەشکا و لە بەهاری ساڵی ١٣٨١ توانی بە سەر چیای لۆتسە، چوارەمین لووتکەی جیهانە لە ولاتی نیپاڵ بە بەرزایی ٨٥١٦دا زاڵ بێ و شانازی ئەوەی پێبڕا کە گەنجترین شاخەوانی جیهانە کە توانیویەتی ئەم چیایە ببەزێنێ و نیشانەی زێڕینی جیهانی وەرگرێ و پاشان لە بەشی ڕاهێنانی لەش لە زانکۆی ورمێ دەست بە خوێندن بکاتەوە.

ساڵی ١٣٨٢ لەگەڵ هەواڵ و مامۆستای خۆی (محەممەد ئەوراز) بەشدارییان لە هەڵگەڕان بە سەر چیای (گاشەربرۆمی ١)دا کرد کە بە بەرزایی ٨٠٦٨ لە پاکستان هەڵکەوتووە. بەلام بەداخەوە بە هۆی ڕووداوی ڕنوو، موقبیل و محەممەد لە بەرزایی ٧٩٠٠ میتریڕا ٦٠٠ میتر هەڵدێردرێن. بە هۆی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە شاخەوانی ناوداری کورد و جیهان محەممەد ئەوراز گیانی لە دەست دا و موقبیل بەسەختی بریندار بوو و بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ لە نەخۆشخانەی (شفا) لە ئیسلامئاوا لە ولاتی پاکستان ململانەی لەگەڵ مەرگ کرد و بە هۆی وەی کە هێندێک خوێن لە مێشکیدا چزابوو، پاش مانگێک گەڕانەوە بۆ ولات نەشتەرگەری مێشک کرا. ناوبراو لەو ساڵەدا نیشانەی زێڕی ئاسیایی وەدەست هێنا.

ئەم گرفتانە نەیانتوانی موقبیل لە گەیشتن بە ئامانجەکانی

سارد کەنەوە و لە ساڵی ١٣٨٣ دیسان لەگەڵ گرووپی نێونەتەوەیی شاخەوانیی ئێران، هەڵگەڕانیان بۆ سەر چیای (ئیسپانتیک) بە بەرزایی ٧٠٢٧ میتر لە وڵاتی پاکستان دەست پێکرد و توانیان لەم چیایە سەرکەون و نیشانەی زێوی ئاسیایی بۆ وڵات و نیشتمان بەدیاری بێنن. هەر لەو ساڵەدا چیای ئارارات (ئاگری) بە بەرزایی ٥١٣٧ میتر لە وڵاتی تورکییەی نایە ژێر پێ.

لە ساڵی ١٣٨٤ بۆ یەکەم جار ئەشکەوتی (قەلایچی) لە نیزیک شاری بۆکان بە مەودای ١٢٠ میتر کردەوە و یەکەمین کەس بوو لەو گوندی لگبن دوڵیگەلو کە لە ناوچە ی پیرانشار بە ناوی ڕێگای (شەریف زەردی) بزماری لە سەر بەرد داکوتا. لە ساڵی ١٣٨٦ بوو بە ناوی ڕاهێنەری گرووپی نێونەتەوەیی ئێران و چوون بۆ چیای (برۆدپیک) بە بەرزایی ٨٠٤٧ میتر لە وڵاتی پاکستان. بەلام بەهۆی ناخۆشی دۆخی کەشوهەوا تەنیا تا بەرزایی ٧١٠٠ میتر وەسەر کەوتن و توانی نیشانەی زێوی ئاسیایی وەدەست بێنێ.

موقبیل هەروەها بڕوانامەی ڕاهێنەری شاخەوانی و بەفر و سەهۆڵ و ڕەوەزانی هەبوو و لە گشت شارەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات، کلاسی ڕاهێنانی بۆ گەنجان و شاخەوانان بەڕێوە دەبرد.

هەڵۆی چیا سەرکەشەکانی کوردستان کە تەنیا ئامانج و هیوای ئەوە بوو کە ڕۆژێک هەر ١٤ کێوی ٨٠٠٠ میتری جیهان بنێتە ژێر پێ و بە دامەزراندنی کۆمەڵەی شاخەوانانی کوردستان دژی مادە سڕکەرەکان، لاپەڕەیەکی زێڕینی لە ژیانی وڵاتپارێزیدا کردەوە لە ڕۆژی ١٥ی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٨٦ (٢٠٠٧) لە کاتێکدا هاوڕێ لەگەڵ تاقمێک لە هاوقەتارانی لە سەر چیای بەردەزەرد لە نیزیک شاری بۆکان خەریکی ڕاهێنان بوو، لە بەرزاییڕا کەوتە خوار و بەسەختی بریندار بوو و گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەی بۆکان و بە هۆی نەبوونی ئیمکاناتی پێویست ڕەوانەی نەخۆشخانەی (عارفیان)ی شاری ورمێ کرا و پاش ٩ ڕۆژ بێهۆشی و ململانە لەگەڵ مەرگ، لە بەرەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممە ٢٤ی گەلاڕێزانی ١٣٨٦، ڕووحی بەرەو بەرزایی چیا سەرکەشەکانی کوردستان فڕی. تەرمی هەڵۆی چیاکانی کوردستان ڕۆژی دواتر لە نێو داخ و غەم و پەژارەی دۆستان و هاوالان و خەڵکی شاری بۆکان و شارەکانی دیکەی کوردستان و ئێران، هەر لە سەر (بەردەزەرد) تەسلیم بە خاکی کوردستان کرا و بۆ تاهەتا ماڵئاوایی لێکردین.

ڕووحی هەر شاد و ڕێگای پڕ ڕێبوار بێ.

نووسینی ئوزرا هونەر پەژوو



**له بەرزایی لۆتسەوە**

هەموو ساڵێک بەرنامەیەکی گشتی فیدراسیۆنی شاخەوانی لە زستاندا بەڕێوە دەچێ. هەر بەو هۆیەشەوە لە زستانی ساڵی ١٣٨٠ هەتاوی بەرنامەیەکی گشتی هەروەک ساڵانی پێشوو لە چیاکانی عەلەمکێو و تەختی سلێمان بە ئامادەبوونی پتر لە ٢٠٠ کەس بەڕێوە چوو کە لە نێو بەشداربووواندا ٣٠ کەس بۆ ئۆردووەکانی گرووپی لۆتسە بانگهێشت کران. ئەو کەسانەی کە بە تایبەتی هەڵبژێردرابوون چەند ئۆردوویان بە شێوی تکنیکی شاخەوانی لە سەر کێوی عەلەم و ڕەوەزی ڕێگای ئەڵمانیەکاندا بەڕێوە برد، تێستی تایبەتیان لێ وەرگیرا و لە کۆتایی ئۆردووکان، ١٢ کەس لە نێو بەشداربوواندا هەڵبژێردران و ڕێکخستران بۆ ئەوەی بۆ وڵاتی نێپاڵ بەڕێکرێن. ئەو شاخەوانانە بریتی بوون لە پزشکێک و بەڕێوەبەری گرووپەکە و هەروەها ١٠ کەسی تر کە ناوی شاخەوانانی ئێرانیان بەخۆوە گرت وەڕێکەوتن بۆ نێپاڵ. کەلوپەلی پێداویستی خواردەمەنی و فەننی گرووپەکە بریتی بوو لە ٧٠٠ کیلۆ کە لە مانگی ڕەشەمە بۆ کاتماندۆی پێتەختی نێپاڵ

بەڕێکرا.

گرووپی شاخەوانانی هەڵبژێردراوی ئێرانیش لە ڕێکەوتی ٨ خاکەلێوەی ١٣٨١ هەتاوی لە تارانەوە بەرەو نێپاڵ وەڕێکەوتن و بە هۆی نائارامی نێوخۆی وڵاتی نێپاڵ، بە فەرمانی بەڕێوەبەری بەرنامەکە بەزوویی گرووپەکە لە کاتماندو بەرەو لۆکلا کەوتنەڕێ، بەڵام بە هۆی درەنگ گەیشتنی کەلوپەلەکان، گرووپەکە دوای دە ڕۆژ کێو پێوان و خۆ سازگار کردن لەگەڵ کەشوهەوای مەڵبەندەکە، توانیان خۆیان بگەیەننە خێوەتگای تایبەت. پێویستە ئاماژە بکەین کە گرووپەکە بە نێو گوندەکانی پاکونگ، نامچە بازاڕ، دەنبووچە، پەریچە و لابووچەدا تێپەڕبوون کە لە کۆتایی ئەو ڕێپێوانە، شاخەوانانی ئێران لە ڕێکەوتی ٢٠ خاکەلێوە و لە کەشوهەوایەکی پڕ بەفر و ساردوسڕدا گەینە خێوەتگای تایبەت.

شوێنی خێوەتگای تایبەت لە ڕۆژئاوای لۆتسە و لە سەر پشتی لەتکە سەهۆڵەکانی خۆمبۆ لە بەرزایی ٥٢٥٠ میتری، تێکەڵاو لەگەڵ خێوەتگای تایبەتی ڕێگای باشووری ئێوێرێستە. لە بەهاری ساڵی ١٣٨١ هەتاوی ئەو گرووپانەی کە بۆ بەزاندنی ئێوێرێست و لۆتسە هاتبوونە مەڵبەندەکە، بریتی بوون لە ١٤ گرووپ کە لە وڵاتەکانی وەک، ڕووسیا، ئۆکراین، کۆریا و ئێرانڕا هاتبوون، بەڵام هێندێک لەو کەسانەی کە لە گرووپەکانی بەزاندنی ئێوێرێستدا بەشدار بوون، بەو نیازە بوون لە دواییدا لۆتسەش ببەزێنن، لە شاخەوانانی گورجستان، باهاما و ئوستراڵیا پێکهاتبوون.

ئەو کاتەی شاخەوانانی ئێران گەینە خێوەتگای تایبەت، زۆربەی ئەم گرووپانەی زووتر گەیشتبوونە خێوەتگا، توانیبوویان خێوەتگای دووهەمیش هەڵدەن. گرووپی شاخەوانانی ئێرانیش لە ڕێکەوتی ٢٤ مانگی خاکەلێوە بۆ هەڵدانی خێوەتگای یەکەم و بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسمی دۆعای بوودایی لە لایەن شێرپاکانەوە دەستبەکار بوون و بەرەو خێوەتگاکان بۆ هەڵدانی خێوەتەکان وەڕێکەوتن. بۆ باشتر بەڕێوەچوونی کارەکان لە خێوەتەکانی سەروو و بە هۆی ئەوە کە لە ڕێگادا ڕووداوێک پێش نەیا، لە لایەن بەڕێوەبەری بەرنامە، شاخەوانان بە دوو گرووپ دابەش کران و هەر دوو گرووپەکە بە شێوەی دابەشبوونی کاتی بەیەکەوە دوای خووگرتن بە کەشوهەوای

ئەو بەرزاییانە دەستبەکار بوون و خێوەتگای یەکەمیان لە بەرزایی ٦١٠٠ میتری و پاش تێپەڕکردنی سەهۆڵەکانی سامناکای خۆمبۆ، لەسەر ئاوهەڵدێرەکەوە هەڵدرا.

ئەو ڕێگایە پڕ بوو لە لەتکە سەهۆڵی سامناک و قەڵشەسەهۆڵی زۆر قووڵ کە هەر بە هۆی پەیژە ئالمینیۆمەکان دەیانتوانی لێیان بپەڕنەوە، بەلام زۆربەی شاخەوانەکان ڕۆژانە شاهیدی تێکڕووخانی سەهۆڵەکان و لێکئاواڵە بوونەوەی قەڵشەکان بوون و شوێنی خێوەتگای یەکەمیش لە نێو قەڵشە سەهۆڵەکاندا بوو. هەرچەند قەڵشەکان زۆر لێک ئاواڵە نەبوون، بەلام زۆر قووڵ بوون. زۆربەی شاخەوانان بۆ کەلک وەرگرتن لە خێوەتگای یەک، بە شێوەی عەمباری بارەکانیان لە وێ دەنا و بە هۆی مەترسی زۆر، شەوانە ئەو شوێنەیان چۆل دەکرد.

دوای خووگرتن بە کەشوهەوای مەڵبەندەکە و ڕاگواستنی کەلوپەلە پێویستەکان بۆ خێوەتگای یەکەم، لە ڕێکەوتی ٣١ مانگی خاکەلێوە شاخەوانانی ئێران توانیان خێوەتگای دووهەمی خۆیان لە بەرزایی ٦٥٠٠ میتری و لە کۆتایی دۆڵی لای ڕۆژئاوایی و دروست بەرامبەر بە ڕەوەزەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئێوێرێست، هەڵدەن.

ڕێگای نێوان خێوەتەکان حەوت کیلۆمیتر دەبێ و بە نێو دۆڵێک لە نێوان دوو کێودا تێپەڕ دەبێ کە لایەکی ئەو خێوەتگایە شانی ڕۆژئاوای ئێوێرێستە و لای تریشی ڕۆژئاوای نۆپتسەیە و پڕە لە بەفر و لە هەر دووک لا هەمیشە لە کەمینی ڕنووردایە. لە ڕۆژانی تاو و ساودا ئەو دۆڵە وەک چۆلگە و ویشکارۆ وایە و زۆر جار پلەی گەرما دەگاتە ٣٥ پلەی سەرەوەی خاڵ، بەلام هەرکە پەڵە هەورێک وەدی بێ بەخێرایی پلەی سەرما دێتە ژێر خاڵ. بەو شێوەیە خێوەتێکی گەورە بۆ چێشتخانە و شەشی چکۆڵە، خێوەتگای دووهەم پێکدێنن بەلام بۆ گەیشتن بە خێوەتگای سێهەم شاخەوانان دەبێ دوو کاتژمێر ڕێگا بڕۆن و دەگەنە بەرزایی ٦٧٠٠ میتری لەوێوە دەگەنە یەکەمین لای ڕۆژئاوای لۆتسە و لە وێشەوە بە ڕێگایەکی ڕژد و هەڵەمووتدا کە ٦٠ هەتا ٦٥ پلە ڕژدە، ڕێپێوانێکی ٨ هەتا ٩ کاتژمێری دەخایەنێ تا بگەی بە خێوەتگای سێهەم.

بە هۆی ڕژد و هەڵەهووتی ئەو شوێنە و ترس لە ڕووداو بەزووترین کات شێرپاکان خێوەتگای سێهەم جێ دێلن و بەرەو خێوەتگای چوار وەڕێ دەکەون شاخەوانەکانیشی بە هۆی مەترسیداربوونی شوێنەکە

دەبێ کەلک لە تەناف ورگرن و تەنافەکان ڕایەڵ■کەن، زۆر جار کە کاری پێویست و چوونە سەر ئاویان بۆ دەهاتە پێشێ دەبوو لە کەوش و گرانپۆن و تەناف کەلک ورگرن. شاخەوانانی ئێران لە ڕێکەوتی ٧ مانگی بانەمەڕدا خێوەتگای سێهەمی خۆیان هەڵدا بەڵام بەهۆی تێکچوونی دۆخی هەوا و بارینی بەفری زۆر، ناچار بوون بگەڕێنەوە خێوەتگای تایبەت، بە داخەوە لەو ڕۆژەدا شاخەوانێکی ئەمریکایی بە هۆی کەمتەرخەمی، لە کاتی دەبەرکردنی سەندەڵی■ شاخەوانی، لە خێوەتگای سێهەم لە دەرەوەی خێوەتەکەیان بە هۆی بای توند، هەڵدێرا و بۆ هەمیشە لە بەر چاوان ون بوو.

ئەوجار بە کۆتایی هاتنی ئەم هەوا ناخۆشە، شاخەوانانی وڵاتەکەمان توانیان خێوەتگای چوارەمیش لە ڕێکەوتی ١٦ مانگی بانەمەڕدا لە بەرزایی ٧٩٠٠ میتریدا هەڵدەن.

بۆ دەست وێڕاگەیشتن بە خێوەتگای چوار، شاخەوانان دەبێ هەتا بەرزایی ٧٦٠٠ میتری و لەوێو بە لابەلایەکدا بۆ لای باکوور، وێڕای ئەوە کە دەبێ بە سەر تیرەگی کێوێکی چکۆلەدا، بە نێوی Yellow band لە بەرزایی ٧٧٠٠ میتری تێپەڕ بن و بەر لە وەی بگەنە تیرەگی ژنۆیەکان، دووبارە دەبێ بۆلای ڕۆژهەڵاتی خێوەتگاکە بڕۆنە پێشەوە و لە نێو ئەو پۆلە بەردانەی کە لەوێ جێگیربوون خێوەتەکەیان هەڵدەن.

شاخەوانان دوای گواستنەوەی کەلوپەلی پێویست بۆ خێوەتگاکانی سەروو، بۆ حەسانەوە و بەهێزکردنی خۆیان گەڕانەوە خێوەتگای تایبەت و بە هۆی ئەو زانیاریانەی کە لە بارەی چۆنیەتی کەشوهەوادا بە دەستمان گەیشتبوون لە ڕێکەوتی، ١٦ مانگی مەی، و ٢٦ بانەمەڕ باشترین کاتی بەزاندنی لووتکەیان پێ ڕاگەیاندبووین و بڕیار درا دەستبەکار بین. ئەگەرچی گرووپێکی ڕووسی کە بریتی بوون لە ٧ کەس و یەکی گورجستانیشیان لەگەڵ بوو، توانیان لە ڕێکەوتی ٢٤ بانەمەڕ لووتکە ببەزێنن، بەڵام بەهۆی بای توند نەیانتوانیبوو هەتا کاتژمێر شەشی بەیانی دەستبەکار بن، بەو شێوەیە هەوا مۆڵەتی دابوون و کاتژمێر چواری ئێوارە لووتکەیان بەزاندبوو، ئەو کات ١٢ شاخەوانی ئێرانیش بەو جۆرە لەگەڵ ٤ شێرپا، لە ڕێکەوتی ٢٥ و ٢٦ بانەمەڕدا خۆیان گەیاندە خێوەتگای چوارەم. گرووپی یەکەم بریتی بوون لە بەڕێزان چەشمە قەسابانی، نەجاریان، مێهدیزادە، بەهادورانی لە

■ بەستنی تەناف لە شوێنێک بۆ خۆ ڕاگرتن

■ شتێکە لە بەر دەکرێ و تەنافی لێ گرێ دەدرێ.

کرماشان، عەزیمی و بەڕێز موقبیل هونەرپەژوو، لەگەڵ دوو شێرپا بە ناوکانی مینگما و داوا، کە هەردووک برا بوون.

ئەو گرووپە کاتژمێر ١/٣٠خولەکی بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٦بانەمەڕ لە خێوەتگای چوار بەرەو لووتکە وڕێ کەوتن و لە کەشوهەوایەکی زۆر خۆشدا وێڕای ڕایەڵکردنی ٢٠٠ میتر تەناف، لەسەر هەڵدێری جوانۆی لای ڕۆژئاوای لۆتسەوە توانیان کاتژمێر ١١/٥٥ خولەک لووتکە ببەزێنن و ئالای سێڕەنگی ولاتی ئێران لە سەر چوارەمین لووتکەی کێوی دنیا بەرز کەنەوە. هەر لەو ڕۆژەدا جیا لە شاخەوانانی ئێران، سێ ئۆکراینی و یەک ئۆستڕالیایی و سێ کۆریایی توانیان لووتکەی کێوی لۆتسە و ٥٤ شاخەوانی تر لەگەڵ ٢٦ شێرپا، توانیان لووتکەی بەرزی جیهان یانی ئێوێرێستیش ببەزێنن.

گرووپی دووهەمی شاخەوانانی ئێران بریتی بوون لە بەڕێزان، ئەفلاکی، خادیم، ڕەزا زارعی و بەڕێز محەممەدی هەوراز، ناسری، سلیمانی و هاوڕێ لەگەڵ شێرپا لاکپا، کە ساڵی ١٣٨٠ لە بەزاندنی لووتکەی ماکالۆ لەگەڵ شاخەوانانی ئێراندا بەشداری کردبوو. هەرکە گەینە خێوەتگای چوارەم، وێڕای پیرۆزبایی و دەستخۆشیکردن لە گرووپی یەکەم بە بۆنەی بەزاندنی لووتکە، لەو شوێنە جێگیربوون و بە هۆی تێکچوونی دۆخی کەشوهەوا بە فەرمانی سەرۆکی گرووپ سۆنۆمدەندۆ، شاخەوانان تا کاتژمێر ٢ بەرەبەیانی بە شێوەی پێویست چاوەڕوان بوون و لە دوای ئەوە کە هێندێک با هێور بۆوە، شاخەوانان بە کەلکوەرگرتن لە کەلوپەلی پێداویستی گرووپی هەوەڵ توانیان دوای ١٠ کاتژمێر خۆیان بگەیەننە لووتکە و بیبەزێنن.

ئەو ساڵە کە لە لایەن ئێرانییەکانەوە بە ناوی ساڵێکی پیرۆز ناودێر کرابوو، بوو بە لاپەڕەیەکی ڕەنگینی تر لە مێژووی ئێراندا و بەو شێوەیە شاخەوانانی بەرزەناوی ئێران بە هیوای ئەو ڕۆژە کە بتوانن ئالای بەرزی ئێران لە سەر هەموو لووتکەکانی جیهان بەرز کەنەوە، توانیان چوارەمین لووتکەی جیهانیش یانی لۆتسە ببەزێنن.

## چەند خالێکی پێویست

هەتا ئەو کاتە شاخەوانانی■ ئێران توانیبوویان ٧لووتکە بە بەرزایی٨٠٠٠ میتر ببەزێنن کە بریتین لە: ماناسولو ١٣٥٤، دوو گاشەربرۆمی ٢/ ١٣٧٦، ئێوێرێست ١٣٧٧، چۆئایۆ ١٣٧٩، شیشاپانگما

■ خوالیخۆشبوو نەوراز یەکەم کەس بوو لە ئێران کە ٥ لووتکەی ٨٠٠٠ میتری بە زاندبوو.

١٣٧٩، ماكالۆ ١٣٨٠، لۆتسە ١٣٨١.
بەڕێز محەممەدی هەورراز پاڵەوان و لێهاتووی کورد توانیبووی لەو بە رنامەیەدا کێوی ٨٥١٦ میتری لۆتسە بێ‌کەلک وەرگرتن لە ئۆکسیژێنی دەستکرد ببەزێنێ، ئەوەش بوو بە لاپەڕەیەکی زێرینی تر لە مێژووی گەلەکەماندا و بەڕێز هەورراز ژمارەی بەزاندنی لووتکە هەشت هەزارییەکانی لە ئێراندا بە دەست هێنا. هەروەها بەڕێز و خۆشەویست و لاوی کەم تەمەن و پاڵەوانی گەلەکەمان موقبیلی هونەرپەژوو، لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بە ناوی کەم‌تەمەنترین شاخەوان ڕیکۆردی شکاند و توانی لە جیهاندا ئەو پلەیە بە دەست بێنێ و لووتکەی بەرزی ٨٥١٦ میتری لۆتسە ببەزێنێ؛ ئەوەش بوو بە لاپەڕیەکی تر و ڕازاوە لە مێژووی گەلی کورد کە هەتا ئێستاش کەس ئەو ڕچەیەی نەشکاندووە.
هەر لەو ساڵەدا شاخەوانێکی تر کە بەتەمەنترین کەس بوو توانی لووتکەی لۆتسە ببەزێنێ. ئەو شاخەوانە خەڵکی ولاتی یاماها بوو کە لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا لە ڕۆژی ٢٧ بانەمەڕ هاوڕێی شێرپاکەی و لەگەڵ شاخەوانانی ئێران خۆی گەیاندە لووتکە. سۆنۆم‌دەندۆ کە سەرۆکی گرووپی شاخەوانانی ئێران بوو هەتا ئەو کاتە توانیبووی پێنج جار لووتکەی گەورەی جیهان ئێوێرێست ببەزێنێ. ئەو هەتا ئەو کاتە لە زۆربەی بەرنامەکانی ئێران لەگەڵ شاخەوانانیدا بۆ بەزاندنی پۆمووری، ئێوێرێست، ماکالۆ و لۆتسە بەشدار ببوو. بەشدارانی بەرنامە بریتی بوون لە: بەڕێزان سادقی ئاقاجانی بەڕێوەبەری بەرنامە و بەرپرسی فیدڕاسیۆنی شاخەوانی ئێران، جێگر ئێقباڵی ئەفلاکی، داودی خادم، جەلالی چەشمە قەسابانی، محەممەدحەسەنی نەجاریان وێنەگر، ڕەزا زارعی، محەممەدی هەورراز ، حەمیدی ناسری و مەحموودی گودەرزی پزشک، ئەکبەری مێهدی‌زادە ڕەزا بەهادورانی کرماشان، ڕەزا سلێمانی، ئەمین عەزیمی و بەڕێز موقبیلی هونەرپەژوو.



**سەرەتا**

**"ئێوە دووهەم نین بەڵکوو باشترینن" رینهۆڵد میسنێر**
**کۆکۆشکا و ١٤ لووتکەی ٨٠٠٠ میتری**

جێرزی کۆکۆشکا پیاوێکی تینووی بیبڕانەوی کێوە هەشت هەزارییەکانی جیهان بوو کە توانی لە ماوەی هەشت ساڵدا هەر چاردە لووتکەی ٨٠٠٠ میتری جیهان ببەزێنێ. هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە باشی بیر لێ بکاتەوە و بە شێوازێکی باش بەرەو پێش بچێ و هەر بەو شێوەیە بەسەر کەندوکۆسپەکانیدا زاڵ بێ و بتوانێ هەموو ئاواتەکانی وەدی بێنێ. هەرکە بۆ یەکەم جار لۆتسەی بەزاند پرینگایەوە و هەموو هەشتهەزارییەکانی بە دوای یەکدا کە زۆربەیان لە زستان و بە ڕێگای تازەدا بوون بەزاندن. ناوبراو توانی لۆتسە بە ڕێگای تازە ودا وە چۆئایۆلە زستاندا ببەزێنێ، ئەوەش بوو بە بەڵگەیەکی باشتر لە بەڵگەکانیدا و بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٧٩ لووتکەی هەشت هەزار میتری لۆتسەی بەزاند و لە ساڵی ١٩٨٩، یانی دە ساڵ دوای ئەو کارە بەرچاوە هەر لە سەر ئەو ڕێگایەی کە بۆخۆی

دەستی پێکردبوو، بە هۆی پسانی تەناف بەربۆوە و گیانی لە دەست دا و بۆ هەمیشە لە نێو سەهۆڵەکانی لۆتسەدا مایەوە و بەو هۆیە هەوڵ و تێکۆشان لە ڕێگای شاخەوانیدا کەم بۆوە.

بەڕێز کۆکوشکا پێش ئەوەی لە سەر لۆتسە بەربێتەوە ئەو کتێبەی تەواو کردبوو کە هەمووی لەسەر ژیان و بەسەرهاتی خۆی لە ڕێی شاخەوانیدا نووسیبوو:

«دنیای دوورودرێژی من بیرەوەری پیاوێکە کە لە بنەماڵەیەکی بێئازار لە سیلزییا بە دنیا هاتووە کە بە نەخشەیەک بەلەمی خۆی لە مەڵبەندەکانی لیهستان و نیپاڵدا وەڕێدەخا و بۆ دەستبەکار کردن و ڕێکخستن، بە ڕەنگ لێدانی دووکەڵکێشی کارخانەیەک، وەڕێ دەکەوێ، بیر لە لۆتسە دەکاتەوە بە داهاتێکی کەم و بە هەر شێوە خواردن و کەلوپەلی پێداویستی کۆ دەکاتەوە و هەر کە هەلێکی بۆ برەخسرابایە بە تەنیاییش بۆ بەزاندنی کەلکی لێ وردەگرت. ئەگەر لە گەورەترین کارەکانی ناو بەرین، دەتوانین ئاماژە بکەین بە بەزاندنی ماکالۆ بەتەنیایی و بە ڕێگایەکی تازەدا و تێپەڕکردنی لابەلای نێوان دوو لووتکەی برۆدپیک بەلای باکووردا و بەزاندنی دوو کێوی بەرز بە بەرزایی هەشتهەزار میتر لە وەرزی زستان و بە ماوەی ٢٥ ڕۆژ وێڕای ئەوەی کە سێ هەزار کیلۆمیتر لێک دوور بوون و کردنەوەی ڕێگایەک لە باشووری K٢ لە گرووپێکی دوو کەسیدا.

بیرەوەرییەکانی بەڕێز کۆکۆشکا، خوێنەر بۆ لایەک ڕادەکێشێ هەتا وێنەی ئینسانێکی بێوێنە و بێهاوتا نیشان دەدا.

لۆتسە، ٨٥١٦ میتر، ٤ ئۆکتبری ١٩٧٩ بە ڕێگایەکی تازەدا لە باکوری ڕۆژئاوا

لەگەڵ هاینریش ژووک.

ئێوێرێست ٨٨٥٠ میتر، ١٩ مەی ١٩٨٠ بە ڕێگای باشووری لەگەڵ ژووک.

ماکالۆ، ٨٤٨١ میتر، ١٥ ئۆکتۆبری ١٩٨١ بە تەنیا و لە ڕێگای باکووری ڕۆژئاوا و بە ڕێگایەکی تازەدا.

برۆدپیک، ٨٠٤٧ میتر، ٣٠ ژووییەی ١٩٧٢ بە لای ڕۆژئاوادا لەگەڵ کورتیکا و بە لابەلای باکوور و بە لووتکەی نێوەڕاستدا.

گاشەربرۆمی٢، ٨٣٥٣ میتر، ١ ژووییەی ١٩٨٣ بە ڕێگایەکی تازە و

بە لای باشووری ڕۆژهەلاتدا لەگەڵ کۆرتیکا.

گاشەربرۆمی ١ /٨٠٦٨ میتر، ٢٣ ژوویيەی ١٩٨٣ بە ڕێگایەکی تازە و بە لای باشووری ڕۆژئاوادا لەگەڵ کۆرتیکا.

دائۆلاگیری ٨١٦٧ میتر، ٢١ ژانوییەی ١٩٨٥ یەکەم بەرنامەی وەرزی زستانبە لای باکووری ڕۆژهەلاتدا لەگەڵ ژووک.

چۆئایۆ ٨١٥٣ میتر، ١٥ی فیورییەی ١٩٨٥ یەکەم بەرنامە لە زستان بە لای باشووری ڕۆژهەلاتدا لەگەڵ هاینێریش، بریکا، پاولیکۆفسکی.

نانگاپاربات، ٨١٢٥ میتر، ١٣ ژوویيەی ١٩٨٥ بە ڕێگای تازەدا وبە لای باشووری ڕۆژهەلات لەگەڵ هاینێریش، بریکا، پاولیکۆفسکی.

کانگچۆن

چۆنگا ٨٥٩٨ میتر، ١١ ژانوییەی ١٩٨٦ یەکەم جار لە زستان بە ڕێگای باشووری ڕۆژئاوادا لەگەڵ ویلیسکی.

K٢، ٨٦١١ میتر، ٨ ژوییەی ١٩٨٦ بە ڕێگای تازە و بە لای باشووری ڕۆژئاوادا لەگەڵ پییۆترفیسکی.

ماناسولۆ، ٨١٥٦میتر، ١٠نۆوامبری ١٩٨٦ بە ڕێگای تازەدا و بە لای باکووری ڕۆژهەلات لەگەڵ هایزێر.

ئاناپۆرنا، ٨٠٩١ میتر، ٣ فورییەی ١٩٨٧ یەکەم جار لە زستان بە لای باکووردا لەگەڵ هایزێر.

شیشاپانگما، ٨٠١٣ میتر، ١٨ سپتامبەری ١٩٨٧ بە ڕێگای ڕەوەزی لای ڕۆژئاوادا لەگەڵ هایزێر.

## نووسراودکانی کوکوشکا

دوانیوەڕۆی ڕۆژی شەممە ٤ سپتامبەری ١٩٦٥، بۆ یەکەم جار دەستم وەبەرد کەوت و لەو کاتەوە هەموو شتێک منی لە بیر چووە، هەتا ئەم سەفەرە کورتانەی کە بۆ کێوەکانی بێسکید کە جاروبارە بۆ لەناوبردنی غەم و پەژارە منیان بۆلای خۆیان ڕادەکێشا. یەکێک لە دۆستەکانم منی لەگەڵ خۆی برد بۆ ناوچەی پۆدیلیسک، ئەوجار هەر دەستم وبەرد نەکەوت، بەڵکوو توانیم لێشی وەسەر کەوم و بەو جۆرە دنیای ڕاستی خۆم دۆزییەوە. دوای تێپەڕبوونی یەک ساڵ و تێپەڕکردنی دە ڕۆژ مەشقی فێرکردن لە ناوچەی تاترا، ڕێگایەکی تازەمان لە سەر ڕەوەزەکانی زامارلاتۆرنییا کردەوە. ساڵی دوایی لەگەڵ پیۆترێسکۆرۆپا، بەڵێنمان دا بە پڕمەترسیترین ڕێگای تاترادا وەسەر

کەوین و بەو جۆرە ڕێگای لای باشووری کارالینکامان هەڵبژارد و بە درێژایی چوار گوریس کارمان لەو ڕێگایەشدا کرد و ناچار دەستمان هەڵگرت، چونکە چەکوچەکەی ماڵی خۆمان کە بۆخۆم دروستم کردبوو شکا· دوای ماوەی ڕۆژێک لە پشووی حەوتوودا دەستبەکار بووینەوە و بە ڕۆژونیونیک کۆتاییمان پێهێنا و پێیدا وەسەر کەوتین و دوای کۆتاییهێنانی کارەکە دووجاریش پێیدا چووینەوە سەرێ· ئەو ڕێگایە تەنیا چەند کەس لە شاخەوانەکانی بە توانای لێهستان توانیبوویان لێی وەسەر کەون و تا ئەو کاتە کەسی تر نەیتوانیبوو·

بۆ ئۆردوویەکی فێرکاری بانگهێشتن کراین کە لەوانە بوو ڕێگامان بۆ ئالپ و دۆلۆمیت بۆ کرابایەوە، بەلام هیچ ئاوا نەبوو· نامەی خزمەتی سەربازیم بۆ هات و منی لە ژیان دوور کردەوە، بەتایبەت ژیانم لە کێوەکاندا· دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ و کۆتایی خزمەتی سەربازیم، دووبارە بەڵێنیمان دا بە زستان بە ڕێگای پۆلپیتدا وەسەر کەوین و تا ئەو جێگایەی کە ئاگادار بووین کارێک بوو بۆ کران نەدەبوو؛ وێڕای ئەوەش کە کاریشی لە سەر کرابوو ناهەموارترین ڕێگا لە تاترا دەهاتە ئەژمار، بەلام بە وەش ڕانەوستاین و هەڵمانبژارد و هاتە نێو بیر و خیاڵمانەوە و دەستبەکار بووین· لە ڕۆژی دووهەمدا کە نیوەی ڕێگاکەمان تێپەڕ کردبوو، هاوڕێکەم یانی پییۆتریسکۆرپا، بە هۆی سەهۆڵبەستنی تەنافەکان خۆی پێ ڕانەگیرا و بەربۆوە و گیانی لە دەست دا· بۆ یەکەم جار بوو کە ڕووداوی ئاوام بە چاو دەدی و مردنی کەسێکم ئاوا دەهاتە بەر چاو، ئەویش دۆستێکی نیزیک·

کاتێک بۆ کاتوویس گەڕامەوە و هەواڵی مردنی دۆستەکەم بۆ بنەماڵەکەی بردەوە، لە کاتی پرسە و سەرەخۆشیدا بەردەوام ئەو پرسیارەم دەهاتەوە بیر کە ئایا مردنی دۆستەکەم بەجێیە درێژە بە شاخەوانی بدەم؟ بەلام پتر دەهاتمە سەر ئەوباوەڕە کە دەست هەڵگرم· بەلام دوای سێ حەوتوو دووبارە بۆ تاترا گەڕامەوە و چەند بەرنامەشم لە زستاندا دارشت و بەجێم هێنان· وا بزانم هەر ئەو هەوڵ و تێکۆشانە بوو بە هۆی ئەوە کە درێژە بەو ڕێگایە بدەمەوە·

لە ساڵی ١٩٧١دا لەگەڵ ژانۆژشۆرک و زبۆژک واخ، ڕێگایەکی تایبەتمان لە توورەتریستە هەڵبژارد و بە دوای ئەودا ڕێگایەکی تازەی تریشمان لە Cimadeibabn تێپەڕ کرد· کاتێک ناوی هیمالییام گوێ

لێبوو، وامزانی کێوێکە بۆ هەموو کەس دەبێ و بۆ منیش هەروەک خەیالاتێک بوو، بەڵام ئەو برووسکەیە بە بیرمدا تێپەڕ بوو و هیچی تر کە لەوانەیە ڕۆژێک بێت و خۆم بگەیەنمە ئەو کێوە بەرزانە. لە بەرنامەیەکدا لەگەڵ گرووپێکی زیلزییان، بۆ لووتکەی مەککینلی لە ئالاسکا لە بەرزایی ٤٥٠٠ میتری تووشی نەخۆشی کەمهەوایی بووم و لە گەڕانەوەدا سەرتاپای لاقەکانم سەهۆڵ بەستبووی و یەکسەر ڕەوانەی نەخۆشخانەیان کردم، ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە هێز و توانای من لە شاخدا بێتە ژێر پرسیار و باوەڕەیان پێم نەما. ئەوجار لە ڕێگای تایبەتی شاخەوانی وەلا نرام و زۆربەی کات و سات لەگەڵ گرووپە خۆماڵیەکان و لەگەڵ گرووپە زانکۆکان دەچوومە کێو. ئەوجار لەگەڵ هاوڕێکەم بۆ جارێکی تر بە ناوی ویتیک کورتیکا، ویستمان بە دوو ڕێگای تازەدا لە لووتکەی درۆ، لە ناوچەی گڕاندژۆراسیس، بە لای باکووری ڕەوەزەکەدا وەسەر کەوین، بەڵام ڕۆیشتنم بۆ کێوە گەورەکان سەخت بوو، هەتا ئەو ڕۆژەی کە لە ساڵی ١٩٧٥دا لەگەڵ کرووپێ شاخەوانی گلیویسی بۆ وڵاتی هیندوکۆش چووین کە لەوێش لە سەرەتای بەرنامەدا نەخۆش کەوتم نەمتوانی لە گرووپی بەزاندنی لووتکەدا بەشدار بم. ناوی لووتکەکەش تیریچ میر بوو. ڕۆژێک دوای بەزاندنی لووتکە لە گەڕانەوەدا سێ کەس بە ناوەکانی مارک لۆکاژفسکی، گریگۆرفلیگل و یانۆژشۆرک، بە هۆی هەڵخلیسکان چەند سەد میترێک هەڵدێررانە خوارێ، ئەگەرچی زۆر شپرزە ببوون بەڵام بەخۆشییەوەهە هەموو زیندوومانەوە و دوای هەوڵ و تێکۆشانی گرووپی چاوەدێری نەجاتیان بوو و کۆتایی پێهات.

لە ئاخرین ڕۆژەکانی بەرنامەکەدا بە تەنیا بۆ لووتکەی ٧٠٠٠ میتری کێوی تیریچمیر وەڕێکەوتم و ڕێگایەکی خۆشم گرت و چوومە سەر و لووتکەم بەزاند. لە ساڵی ١٩٧٧دا گرووپی شاخەوانی ئێمە لە کاتوویسی، لە هەوڵی بەرنامەیەکدا بوو بۆ هیمالییا، ئەوەی ڕاستی بێ بۆ ڕێگای لای ڕۆژهەڵاتی نانگاپاڕبات. هەرکە گەیشتینە ژێر ڕەوەزەکان و چاومان بە دیوارەی ٥ هەزار میتری لە ڕێگا هەڵبژاردراوەکە کەوت کە لە ترسان میزم بە خۆمدا کرد. لە سەر ئەو ڕێگایە بوو کە خێوەتمان هەڵدا و بۆ یەکەمین جار لە بەرزایی هەشتهەزار میتری بوو کە بە هۆی سەختی ڕێگا دەستمان لە کار کێشا و بۆ داوێنی کێوەکە بەرەو خوار بووینەوە. کەشوهەوای وەرزی جوانی پاییزی، دەشتەکانی بە ڕەنگی

زەرد و سوور ڕازاندبۆوە. زۆر جار هەوڵم دەدا چاو لە پشت سەرم نەکەم یانی ئەو شوێنانەی کە هەتاو و تیشکی خۆر لە پشتی ڕەوەزەکانی لووتکەی ئەو کێوانە ئاوا دەبوو کە نەمتوانیبوو بۆ جارێکیش لێیان وەسەر کەوم، غەم و پەژارەیەکی زۆری دەخستە دەروونمەوە. لە کۆتاییدا بەو جۆرە خۆم ڕازی کرد ڕۆژێک دێ و خەڵکی تریش دەتوانن پێ بنێنە هیمالیا و بیرم لەوە کردەوە کە ڕۆژێک دێ و دەگەڕێمەوە و دەبێ بگەڕێمەوە و گەڕاشمەوە و لەو کاتەی کە دەستم بە نووسینی کتێبەکە کرد، بەڵێنیم دا هیچ نووسراوەیەک لە بارەی هیچ گرووپێکدا نەنووسم و نەمنووسی و بە پێویستیشم نەدەزانی کە لە بارەی کرووپی تردا بنووسم. من بۆ کێوەکان چووم و لێیان وەسەر کەوتم.



## بەشی ١

**لۆتسە، ڕێگای لای باکووری ڕۆژئاوا ساڵی ١٩٧٩**

ئێوە دەزانن بۆچی کۆمپانیا گەورە و تایبەتەکان لە نێو شیرکەتەکاندا هەن و کار دەکەن؟ ئایا تا ئێستا لە بارەی ئەوانەدا شتێکتان گوێ لێبووە؟ بەڕێوەبەری کاربەدەست بەڕوونی ویستەکەی ڕێکوپێک کردبوو. بەو شێوەیە کە هیچ لە پلە و پایەی کەم نەبێتەوە. ساڵی ١٩٧٨ بوو کە لە سەر دیواری بەڕێوەبەرایەتی ناونیشانی شیرکەتێک هەڵواسرابوو و لە تەنیشت دووکانی دەفتەری کارگێری بەڕێوەبەرایەتی پەلێک شایەسەندی دڕکاوی و لە نێو ویترینە شوشەییەکەدا هێندێک کتێبی لینین دیار بوو و لە پەنجەرەی دیوکەڕادووکەڵکێشێکی قەدیمی و گەورە دەبیندرا کە هەمووی ئەوانە دەهاتەوە دەسەر دووکەڵکێشەکە.

بۆ هەر شتێک لەو دیوەدا بەتایبەت بیری بۆ کرابۆوە، بەو شێوەیە کە لەسەر هیچ شتێک لەو شتانە بە هەڵە نەچووین. لە دوایی لە سەر ئەو کورسییانەی کە لە سەرەتاوە لە سەریان دانیشتبوون هەستاین، بۆ لای درگا وەڕێکەوتیین، بەڵام وا دیار بوو تازە دەسپێکی قسان بوو و وەک

ئەوە دەچوو کە هێشتا هیچ لە من تێنەگەیشتبوو. گوتی: داوای لێبووردنت لێدەکەم کەمێکم مۆڵەت بدەن کە پتر لەو بوارەدا قسە بکەم. بەڕێوەبەر و کارگێڕ زۆر بە باشی دەیزانی کە ئێمە دەزانین شێرکەتی گەورە لە کاتی پێویستدا دایم لە دوای نوێکردنەوەی ئەو شوێنانەیە کە دەبێ نوێیان کاتەوە و پێیان ڕابگا و بە هەر جۆرێک بێ هەوڵی بۆ دەدا بەتایبەت دروستکردنی دووکەڵکێشی تازە و هەموو هەوڵێکیشی بۆ درابوو و دیار بوو پووڵێکی زۆریشیان بۆ تەرخان کردبوو و کاتێکی زۆریشیان بۆ ڕەنگکردنی دووکەڵکێشەکە نەمابوو. وا وێدەچوو بەڕەێوبەر زانیبووی کە دەبێ زۆر جار دەست لە پۆزی پلەوپایە بکێشێتەوە و کەمێک بیر بکاتەوە و مۆڵەت نەدا ئێمە لای ئەو بەجێ بێڵین. گوتی: بەڕێزان دەمهەوێ بزانم کەی بۆمان تەواو دەکەن؟ لە پەنجەرەکەوە چاوێکمان لە دووکەڵکێشەکان و چاوێکیشمان لە یەکتر کرد، ئەوسا سەرێکیشمان بە شێوەی ڕەزامەندی بۆ یەک لەقاند. گوتم: لەوانەیە بە دوو حەوتوو یان حەوتوویەک تەواوی کەین. بەڕێوەبەر کورسییەکەی سووڕاند و کەمێک بە وتەکەی من پێکەنی و گوتی: بۆخۆت باش دەزانی کە حەوتوویەک بۆ هەڵبەستنی قەرەچێوە ماوەیەکی زۆر کەمە! منیش لە وەڵامدا گوتم: لە تەناف کەلک وەردەگرین. کەمێک بێدەنگ لێمی ڕوانی و وەک ئەوە کە ڕازی بێ وابوو و کۆتایی بە لێکۆڵینەوەش هێنا. دیار بوو بیر و خەیالاتێکی زۆر لە مێشکی بەڕێوەبەردا دەهات و دەچوو، لە لایەک دوو لاوی بەهێزی لە لا ڕاوەستابوو و لە لایەکی تریشەوە دووکەڵکێشێکی سووتاو کە سالانێک بوو ژنگی هێنابوو کە دەبوو ساڵێ یەک یان دوو جار ڕەنگ کرابان، بەلام کێ هەبوو ئەو کارە بکا؟ کەسێک نەبوو. بۆی هەبوو ماوەیەکی تریش خۆی ڕاگرتبا، بەلام لەوانە بوو دوای چەند ساڵ بە هۆی ژەنگهێنان بکەوێتە خوار. بەڕێوەبەر لەو کاتەدا زۆر بەتوندی بیری دەکردەوە و بە شێوەیەکی دۆستانە بەرنامەکەی گۆڕی و گوتی: چای دەخۆن یان قاوە؟ گوتمان حەزناکەین ئازارتان دەین فەرق ناکا. ئەوجار کاتی ئەوە هات کە خۆی نیشان دا کە بزانێ پلەوپایەی هەتا چ ڕادەیەکە؟ ئەگەر قامکی بە دووگمەیەکەوە نابا دیار بوو لە کاربەدەستانی بەرچاوە و ئەگەر دەستی بۆ تەلەفوون بردبا دیار بوو پلەوپایەکی نزمتری هەیە. ئەوجار هەر لە جێی خۆی هەستا و چووە دەم درگاکە و بانگی کرد و گوتی

دوو قاوه بێنن و گوتیشی بمبوورن که من لەگەڵ ئێوه ناخۆمەوه پێشتر سێ دانەم خواردۆتەوه. ئەوجار دەستێکی بە خۆیدا هێنا کە نیشانەی ڕەنجەڕۆیی پێوه دیار بوو، دەمانزانی بارێکی گەوره و گرانی لە سەر شانه کە گیروگرفتیشی بۆ هێناوەتە پێش. وا دیار بوو کە سێ کەسی تر لەو کۆمپانیا گەورەدا بۆ ئەو کاره نەبوو، بەڵام ئێمه بە باشی دەمانزانی کە دەتوانین لەگەڵی بسازێین، چون ئێمه پێویستمان بە یەک میلیۆن هەبوو بۆ بەرنامەی لۆتسه له هیمالییا.
ئەگەرچی دۆخی ئەو کاته نرخی پوڵی دابەزاندبوو، بەڵام لەو کاتەدا حەوت ڕەقەم پارەیەکی زۆر بوو. لە ساڵی ١٩٧٨دا یەک میلیۆن زلۆتی پارەی لێهستان، داهاتی مانگانەی ٢٠٠ کەس بوو.

لوولەی دووکەڵکێشەکە زۆر بڵیند بوو، زۆر جار ئێمه یەک لە چواری ئەو پارەمان بۆ لوولەیەکی ٨٠ میتری وەردەگرت، یانی ئێمه دەبا پووڵی بەرنامەی لۆتسەمان بە چوار یان پێنج دانەی ئاوا دەرهێنابا. هەڵبەت زۆر شتی تریشی هەبوو وەک پارەی ڕەنگ،ماڵیات، شەریکایەتی شیرکەت و بەڕێوەبەرایەتی نێو خۆشی چاوی لێبوو شتێکی بدرێتێ کە وا باشه بڵێم بەدەست هێنانی ئەو پووڵە دەبوو شەش دووکەڵکێشیشی بۆ ڕەنگ کەین، بەڵام بۆ بەڕێوەبردنی کارەکە دەبوو سەرۆکی بەڕێوەبەریش لە شتەکە ئاگادار بێ. پرسی: بە هۆی تەنافەوه ئەو کاره بەڕێوه دەبەن؟ وامان دەزانی ئەوەشی زۆر بۆ سەخته بیسەلمێنێ، زۆر بەخێرایی گوتمان ئێمه شاخەوانین، بە ڕاستی لە دەستمان دێ و لە تواناماندا هەیه، بەڵێ هەموو کەلک لە تەناف وەردەگرین. بەڕێوەبەر و کارگێڕ زۆری بۆ سەخت بوو باوەڕ بکا، بەڵام لەو کاتەشدا وایدەزانی کە ئێمەیان بۆ لە بەهەشتەوه ناردووه تا نەخۆشی ئەو دووکەڵکێشه ژەنگاویەی بۆ چارەسەر بکەین. هەموو هەوڵ و تێکۆشانی بۆ ئەوه بوو کە هیچ لە پلەوپایەی کەم نەبێتەوه گوتی: ئێوه دەزانن ئێمه ڕێکخراوێکی ناوچەی سەر بە ئیتالییاین و ئەوەی ڕاستی بێ ناتوانین ئەو جۆره کارانە بدەین بە هەموو کەس. لە نێو قسەکانیشیدا لێوی خۆی دەکرۆشت، گوتی: مەبەستم ئەوەیه بیدەین بە کەسانێکی تایبەت و لە دوای ئەو قسانە گوایه ئەو پووڵە بۆ سندووقی دابینکراوی تایبەتی لاوان نەهاتبوو. بەو جۆره کوتایی بە قسەکانی خۆی هێنا و گوتی: بە سەر چاو من ڕازیم تەنیا دەبێ مۆڵەتم

بدەن لێکۆڵینەوەی لە سەر بکەم و پێتان ڕابگەیەنمەوە کەی دەستبەکار بن. ئێمە سەرکەوتنمان بە دەست هێنابوو، بەڵام دەبا چاوەڕوانی ئەوە باین کە کۆبوونەوەی تریش لەسەر ئەو یەک میلیۆنە بگرنەوە. لەو ڕۆژانەدا بە دەست هێنانی کارێکی ئاوا ئاسان نەبوو.



## بەشی ٢

**بۆچی لۆتسە؟!**

**کۆکۆشکا و ١٤ لووتکەی ٨٠٠٠ میتری**

ئەوەش وەک بیرەوەرییەکانی ترم لە نێو دەیەی حەفتادا کە ئێمە زۆرتر بۆ بەزاندنی کێوەکانی وەک تاترا دەچووین، لە دواییدا زانیمان کە بەخت ڕووی تێکردووین و دەتوانین بە پارەیەکی کەم بۆ کێوەکانی هیندۆکۆش و ئەفغانستان بچین و هەر بەو پارە کەمە حەوت هەزارییەکانیش ببەزێنین و ئاواتی ئالپینیستەکانی لێهستان وەڕاست گەڕا.

لە کۆتایی ساڵی دەیەی حەفتا یەکەمین بەرنامەی لێهستانییەکان بۆ هیمالییا بوو کە گرووپی کۆرژاب لە لووتکەی $K_2$ و ویندا ڕۆتکیویچ لە مەڵبەندەکانی گاشەربرۆمەکان و کلووپی ویریسلاو بۆ لووتکەی برۆدپیک وەڕێکەوتبوون و تازە ئەوە سەرەتای کار بوو کە فیدراسیۆنی شاخەوانی لێهستان (PZA) ئاخری توانی بەڵگەی پێویستی

بەزاندنی لۆتسە بەدەست بێنی٠ وا باشە ئەوەش بڵێم کە هەر لەو کاتەشدا بەدوای بەڵگەی کێوەکانی تریشەوە بوو کە ئاگادار کراینەوە شاخەوانانی لیهستان دەتوانن بچن بۆ لووتکەکانی نێوەڕاست و باشوور لە مەڵبەندەکانی کانگ‌چین چۆنگا بچن کە لووتکەی زۆر بەهەیبەتی تێدا بوو٠ بەو جۆرە تێکۆشانی ڕاستیمان لەوێوە دەست پێکرد٠ بەڵام بۆچی لۆتسە؟ فیدراسیۆنی شاخەوانی بڕیاری دابوو کە لۆتسە لە بەرنامەکەی دەرباوێ و لەوانە بوو کە کەسانی تریش لە لیهستان توانای ئەوەیان هەبایە کە بەڕێوەبەرایەتی ئەو گرووپەیان وەئەستۆ گرتبا، لەوەدابوو کە گیلیۆویس بەڵێنی دابوو ئەو بەرنامەیە وەئەستۆ بگرێ و ئادام بیلژۆسکیش هەر وای بەڵێن دا٠

بەو جۆرە ئێمە لە دووکەڵکێشەکان وەسەر دەکەوتین و بیرمان لە لۆتسە دەکردەوە و ئاواتی چوونە هیمالیا بەهێزتری دەکردین کە پلەی تواناییەکان هێزی خۆیان لە دەست دابوو٠ هەموو ڕۆژەکانی حەوتوو ناچار بووین کار بکەین و لێکۆڵینەوەمان هەبێ٠ دەتوانم بڵێم کە نەوەد لە سەتی پارەکەمان بەدەست هێنابوو و هێندێکیش لە لایان بەڕێوەبەرایەتی وەرزیشی و شوێنی ترەوە کۆ کرابووە٠ ئەوەش باش بوو کە بەڕێوەبەرایەتی وەرزیش کارێکی تریشی بۆ کردبووین، ئەویش ئەوە بوو کە پارەکانی بۆ کردبووینە دۆلار٠ لەو پەیوەندییەدا ڕابێرت نیکۆلاس کە دۆستی خۆشەویستمان بوو و لە ئاڵمانی ڕۆژئاوا دەژیا و لە بەرنامەکانی تاترا زۆر لەگەڵ ئێمە بەشداری هەبوو زۆری یاریدە داین و لە کۆتاییشدا هاتە نێو گرووپەکەوە و مخاریجی خۆشی بۆخۆی دای٠

وا باشە لێرەدا کۆتایی بەو قسانە لە بارەی ماڵیدا بێنم و لە سەر لۆتسە بنووسین٠

گرووپی ساڵی ١٩٧٩ی لۆتسە بەڵگەیەکی باشی بۆ من هەبوو، چونکە بۆ بەرنامەی دوو گرووپ بانگهێشت کرابووم کە ئەوەش نیشانەی ئەوە بوو کە هاتبوونە سەر ئەو بڕوایە و باوەڕیان پێم بوو کە ئیتر لە بەرزاییدا هیچ گرفتێکم نییە٠ ئادام بیلژۆسکی و یانوژ باراک بەڵگەی باشیان لە بارەی نەخۆشییەکانی من بەدەست هێنابوو٠ لە بەرنامەکانی

ئالاسکادا کە چۆن لە پێنج هەزار میتریدا ئێمە گێژ دەبووین، بەلام بەو جۆرەش ئێمەیان لە بیر خۆ نەبردبۆوە و بانگهێشتیان کردم. پێشتریش لە بەرزاییدا خۆمان بەتاقی نەکردبۆوە، ئەگەرچی جارێک من لە هێندۆکۆش هەتا بەرزایی ٧٠٠٠ میتری چووبووم و جارێکیش لە نانگاپاربات ٨٠٠٠ میتریم چاوپێکەوتبوو. ئەوجار بڕیار وابوو لە گرووپی نۆزدەکەسە، ٦ یان ٨ کەس بو بەزاندنی لووتکە دیاری بکرێن. وام هەست پێدەکرد کە یەکێک لەو کەسانە بووم کە هەڵدەبژێردرێم. لۆتسە بە بەرزایی ٨٥١٦ میتری بە ناوی چوارەمین لووتکەی بەرزی جیهان دەبووە بەڵگەیەکی باش بۆ من، بەتایبەت لە بەرامبەر کەسانێک کە لە بەرنامەی ئالاسکادا لەگەڵم بوون.

بە فرۆکە بۆ بەمبەئی چووین. بۆ ئەو شوێنەی کە بارهەڵگرەکان چاوەڕوانی ئێمە بوون هەموو کەلوپەلەکانی ئێمە لە ڕێگای دەریاوە بۆ ئەوێ هاتبوون. ئەوە یەکەمین جار بوو چاوم بە هیند دەکەوت و لەو کاتەشدا بایەکانی وەرزیش دەستی پێکردبوو. بەو جۆرە فرۆکەخانە کەلاوەکەمان جێ هێشت و سواری تاکسییەک بووین و چووین بۆ نێو شار و بۆ ئەو شوێنەی هۆتێلەکانی لێبوو. بە دانی دوو دۆلار ژوورێکمان بەکرێ گرت کە تەختی خەوێکی تێدابوو و مشکەکانیش لە نێو دالانەکەدا دەهاتن و دەچوون. باران دەباری بەلام هەوا گەرم و هالاوی بوو. لە سەر تەختی خەوەکە ڕاکشام کە لە عەرزەکە خاوێنتر بوو. گرووپیکو لەکەڵ میوانە بەناوبانگەکانی لە کوێ بوون ئەوجار ئێمەیان ئاگادار کردەوە کە لە هەموو شوێنێک ئاو یان چێشت مەخۆن، بەلام ئیزنی خواردنەوەی کۆکاکۆلا و لیمۆناتیان دابووین کە بخۆینەوە چونکە بۆ بەهێزبوونیش باش بوون. بەڕێوەبەری بەشی ماڵی ئێمە خاتوو کیلکۆسکا وەک شێر پارەکانی دەشاردەوە، جارێک نەبێ کە هێندێکی پارە دامێ کە کۆکاکۆلایەکم کڕێ. ئەوانەی کە بۆخۆیان پارەیان پێبوو دەیانشاردەوە. زۆر زوو لە هەموو نێو وڵاتی هیندوستان تێگەیشتم کە لێکۆلینەوەکانی ئەوان شتێک بوو کە لە نێو کتێبەکاندا نووسرابوو یان بەجۆرێک کەسێکی بازرگان لە نێو هاتوچووی بۆ ئەو وڵاتەدا گێڕابوویەوە. زۆری پێنەچوو کە لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتی

خەڵکەکە ئاگادار بوومەوە و بەو جۆرەی کە بۆیان گێڕابوومەوە وا نەبوو. هیندوستان دەبێ لە ڕاستی خۆیدا ببیندرێ و بەدەست بێ. بۆ وێنە بە منیان گوتبوو کە لە کڕینی پێداویستییەکاندا دەبێ وشیار بی و زۆریشیان لەگەڵ بلێی، زۆر زوو تێگەیشتم کە لە نێو خەڵکێکی زۆر جیاواز لەو جۆرە ئاکارانەدام کە زۆریشمان لەگەڵ باش بوون و پێویست بەوە نەبوو کە ئاکارم بگۆڕم و وەک مندالان لەگەڵیان بلێم. بەو جۆرەی کە بە من گوترابوو هەر دەهات و زۆرتر دەچوومە سەر بیروباوەڕی ئەوان و دابونەریتی ئورووپایی و ڕۆژئاواییم لە بیر دەچۆوە و بیر و باوەڕی تازەم بە دەست دێنا.

دوای دوو ڕۆژ بارەکانمان لە گوومرگ وەرگرتەوە و بەرەو باکووری ڕۆژهەلاتی هیند وەڕێکەوتین. هیچ کات ئەو بیرەوەرییە لە بیر ناکەم کە ویزیک لیپنیسکی و ئاندرێ پۆپۆویچ شۆفیری ئێمە بوون و بە بارهەڵگرەکانی خۆیان بە نێو غەڵەبای زۆری تاکسی و دووچەرخە و زۆربەی بارهەڵگرەکانی تردا دەڕۆیشتن کە مێشکی ئینسانی تێک دەدا و تەنیا کەسانی زۆر لەسەرەخۆ دەیانتوانی بەو جۆرە شوێنانەدا تێپەڕ بن. لە هەر چرکەیەکدا چەندین غەڵەبای جەماوەرمان دەهاتە بەرچاو. ئەو ئینسانانەی کە چاوەڕوانمان نەدەکرد و نەماندەویست چاویان لێکەین لە هەر چەند خولەکێکدا جارێک بە پوول چاویان دەبڕییە ئێمە و لێمان ڕادەمان و هەڵیاندەسەنگاندین کە بۆ ئەوان زۆر تازە بووین و شتێکی جیاواز لەگەڵ ئەوەی کە تا ئێستا دیتبوویان. توندڕەو نەبوون بەلام لە بیروباوەڕی خۆیاندا بە دوای کارێکەوە بوون، وەک ئەوەی کە مرۆڤ لە گشت ژیانیدا خووی پێگرتبێ کە دایم دەیانبردە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوە. کاتێک چێشتت دەخوارد لە دەورەت کۆ دەبوونەوە و چاویان تێدەبڕیت، بەو جۆرەی کە زۆر جار دەستیان بۆ چێشتەکەش دێنا. شتێک بوو کە لە کەسایەتی هەر مرۆڤێکدا نەبوو. سواڵیان نەدەکرد و هیچیشیان وەرنەدەگرت، تەنیا چاویان لێدەکردی و تێتڕادەمان، بەلام ئەگەر شتێکت دابانێ زۆر بە ئەسپایی لێیان وەردەگرتی. ئەو ڕووداوانە دوو حەوتوویان خایاند و لەو ماوەیەدا هەموو جلەکانمان چ ئەوانەی چڵکن و چ ئەوانەی خاوێن

بوون هەموویان تەڕ ببوون٠ شەوانە یان لە سەر تەختە دارەکانی نێو هۆتێلە پڕ لە مشکەکە، یان لەدەرەوە و لە نێو خەڵکی ڕەشوڕووتی هیندوستان کە زۆرتر وەک مێشوولە دەورەیان دەدایین تێپەڕ دەبوو٠ باشترین بیر ئەوە بوو کە بۆ خۆت بەخۆت بڵێی کە بەڕێز بیر لە هیچ مەکەوە و وابزانە هیچ کەس لەو شوێنەدا نییە و کاری خۆت بکە، ئەگەریش زۆرت بیر لێ کردباوە مێشکت تێکەڵی دەکرد٠ پرسیار ئەوە بوو کە کێهە لای بۆ خۆت هەڵبژێری، هۆتێلەکە، یان دەرەوە و هەوای ئازاد لە شوێنێکدا کە سەد چاو شەوانە دەتۆ دەبڕا؟

گەیشتینە کاتماندۆ و زۆر بەئیشتیا چووینە نێو شوێنی باڵوێزی لێهستان٠ نوێنەری بالوێزخانەکە بەڕێز واوێڕ ژیناک کە بە ناوی دامەزرێنەری مووزەی ئاشتی ئاسیا ناوبانگی دەرکردبوو، لایەنگری ئێمە بوو٠ پیاوێکی زۆر باش بوو کە لە هەوڵی ئەوە دابوو یاریدەمان بدا٠ وابزانم هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە تا ئەو کاتە هیچ گرووپێک لە لێهستانەوە بۆ ئەو شوێنە نەهاتبوو، بەڵام دوای سالانێک، هەر وەرز سێ یان چوار گرووپ لە لێهستانەوە دەهاتن٠ لە دواییشدا ئەو بەخێرهێنانانە کەم بوونەوە، ئەگەرچی ئەوەش زۆر گرینگ نییە، بەلام بە هەر جۆرێک بێ بەو شێوەیە بەشدار بوو و پێشی خۆش بوو کە بەو جۆرە پێشوازی بکا٠ بارەکانمان جارێک کردەوە و بە پرێسکەی ٣٠ تا ٣٥ کیلۆیی دابەشمان کردن و ئەوانەی پێویستمان نەبوو لە باڵوێزخانەکە جێمان هێشتن٠ هەر لەوێوە دوو شۆفێرەکانی ئێمە لە بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئەوێ بەدوای کارە بەڕێوە نەچووەکانی گرووپەکەوە بوون٠ سەفەرەکە نۆزدە ڕۆژی خایاند کە بەو جۆرە بە نێو برینجی مەزراکانی نیپاڵدا تێپەڕین و وردە وردە بە دوای ئەودا کەوتینە نێو بەرزاییەکان٠ ئێمەش هەروەک گرووپەکانی تر کەلکمان لە ئامرازەکانی مەڵبەندەکە وەرگرت و ئەو بنکەیەی کە کارمان لەگەڵ دەکرد،سەردارێک و چێشتکەرێکیان ڕەگەڵ خستبووین، ئەوەش بەو هۆیە بوو کە هەر گرووپەی لە شوێنی خۆی هەست بە ئاسوودەیی بکا٠ لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەبا بۆ لووتکە بەزاندن لەگەڵ گرووپەکە بان زۆرمان قسە کرد و لە کۆتاییدا بڕیار درا کە پێنج کەس

ڕەگەڵمان کەون و بەو جۆرە ئەو ئاسوودەییەی کە چاوەڕوانمان دەکرد لە نێو دەچوو. چێشتکەرێک و دوو هاوڕێی، سەردارێک و یەکێک لە بەرپرسانی بنکەی بەڕێوەبەرایەتی کە ئەوانە کەسانی هەڵبژێردراوی ئێمە بوون کە لە ڕاستیدا نوێنەری وەزارەتی گەشتوگوزار بوون کە بە بۆنەی پاراستنی یاسای هەموو شتەکان دەبوو لە مەڵبەندەکە دابایەن. بەڵام ئەو خۆشییەی کە لە سەرەتاوە چاوەڕوانمان دەکرد بەو هۆیە لە دەستمان دا. سەرداری گرووپەکە زۆر زوو داوای کرد کە پێویستی بە جێگرێک هەیە.
کە لەگەڵ سەرانی گەورەی بنکەکە ڕووبەڕوو بووینەوە گوتی بەڕێزان بەو جۆرە خەرجەکانی ئێوە هەر دێت و زیاتر دەبێ. بەڵام لە دواییدا لە کاتی ڕێپێوان هیچ گرفتێکتان نابێ و بە ئێمەیان بەڵێن داوە کە زۆر بەخۆشی و ئاسوودەیی، بێ ئەوەی دەست لە شتێک دەن دەیانگەیەننە خێوەتگای تایبەت، بەڵام هەر ڕۆژی یەکەم ناچار بووین دەست بۆ شتێک بەرین، ئەویش ئەوە بوو کە دەستمان بۆ گیرفانمان برد پارەی حەوت ڕۆژی یەکەمی ئەو ئاغایانەمان دا کە داوایان کردبوو چونکە ئێمە دەمانەویست لە سەفەرەکەماندا خۆشی ڕابوێرین، چاوم لە دەوروبەری ڕێگاکە بوو و تەماشای وڵاتم دەکرد و بیرم دەکردەوە و کۆڵکێشەکانیش کاریان دەکرد و شتێکم بۆ ببوو بە پرسیار کە چۆنە هێندێک لەو کۆڵکێشانە دەستیان لە گیرفان خستووە و هێندێکیش هەتا چۆکان لە ژێر باردا دووقەد بوونەوە. ئەوجار بۆمان ڕوون بۆوە کە دیار بوو ئەوانەی دەستیان لە گیرفان نابوو ئەو کەسانە بوون کە ئەوانەی تریان بەکرێ گرتبوو و هەر ئەو ئاغایەی کە دەستی لە کەلەکەی نابوو ڕاوەستابوو، دوای چەند ڕۆژی تر نەیدەویست کار بکا و تا کاتێک پارەی ئەوان دەدرا. بەوجۆرە هیچ لە دەست ئێمە نەدەهات بانگی سەرداری گرووپم کرد گوتم بۆچی پارەی ئەوانەتان نەداوە؟ لە کاتێکدا بە مست لە سینگی دەدا. دەیگوت نیمە هەتا بیاندەمێ، لە سەرەتاوە هەمووم دابەش کردووە. گوتم ئێوە خۆ هەر دوێنێ پارەی حەوتوویەکتان وەرگرتووە! لە کاتێکدا کە بێدەنگ ببوو، سەری بە وێنەی ڕەزامەندی ڕاوەشاند. کاغەز و قەڵەمێکم دەست دایە و دەستم

کرد بە حیسێب و لێکۆڵینەوە٠ بەوجۆرە بۆم ڕوون بۆوە کە هەتا ئێستا دەبێ دەهەزار ڕووپیە پارەیان بۆ مابێتەوە٠ کە لێم پرسی گوتی من هیچ پارەیەکم لە لا نەماوە٠ گوتم مەبەستت چییە کە دەڵێی پارەم نەماوە؟ گوتی نازانم من هەموو پارەکانم داونەتێ٠ گوتم داوتە بەکێ؟ گوتی داومە بە بەردەستەکانم٠ گوتم ئەگەر وابێ ئەوانیش دەبێ دابیانەتە کۆڵکێشەکان٠ بەڵێ داویانە بەلام تەواو نەبوو٠ وادیار بوو بە قسە چمان بۆ نەدەکرا و بێکەلک بوو و پارەکەش خەرج کرابوو٠ دەهەزار ڕوپییە بەرابەر بە هەزار دۆلار بوو، لەوانە بوو بۆ گرووپێکی ئوروپایی زۆر نەبێ بەلام بۆ ئێمە زۆر بوو و لێکدانەوەی ئێمە بۆ خەرجکردن بە مسقاڵ بوو٠ بەو جۆرە ئیتر دەتوانم بڵێم کە هیچ شتێکمان بۆ نەمابۆوە٠ ئێمە وەک گرووپە ڕۆژئاواییەکان نەبووین کە لەو کاتانەدا بە زووترین کات دۆلارەکان لە گیرفانی کۆڵەپشتی دەربێنین٠ ئەو هەمووەی کە لە نێو دووکەڵکێشەکاندا کارمان کردبوو و ئەو پارانەی کە لە لایەن بەشی ماڵیشەوە بۆمان کۆ کرابۆوە تەواو ببوو و دەبوو دووبارە کارمان کردباوە٠ نامەیەکمان بۆ بنکە نووسی و پێیان ڕاگەیاندن کە ئەو کارەی سەردار بە دزی دەزانین٠ بەوجۆرە داوامان لێکردن کە پووڵەکەمان بدەنەوە٠ لەمەوبەدوا کارەکە کەوتە دەست خۆمانەوە بەلام پارەیەکی زۆرمان لە ڕێی نەزانینەوە لە دەست دا٠

چێشتکەرەکان دەبوو بەیانی زوو لە خەو هەستن و نانی بەیانیمان بۆ دروست کەن٠ هەر کەسە کاری خۆی دیار بوو٠ کۆڵکێشێک کە کارەکەی تەواو دەبوو پارەکەیمان دەدایە و کۆڵکێشێکی ترمان بەکرێ دەگرت و دەبوو ئەو کەلوپەلانەی
کە لە شوێنی خۆیاندا بلاو دەبوونەوە دووبارە کۆیان کاتەوە٠ بەو جۆرە دایم دەبوو چاوەدێریان بین و ئەوەش ببوو بە کارێک کە کۆتایی نەدەهات و هەموو ڕۆژێ دووبارە دەبۆوە، بەلام ئەوە باش بوو کە ئەوان بەرەو پێش دەچوون٠ لە نێو ئەو هەموو گێرەوکێشەیە هیچ یاریدەیەکمان لە ئەفسەری بەڕێوەبەر نەدی و بۆمان ڕوون بۆوە کە نەدەبوو بەهێوای ئەوانە بین کە یاریدەی گرووپەکە بدەن٠ وا دیار بوو ئەفسەرەکەش بارێکی زیادی بوو لە سەر کۆڵمان و تەنانەت ڕازی

بەوە نەبوو لەگەڵ کۆڵکێشەکانیش قسە بکا و خۆی لەوان بە زیاتر دەزانی و خۆی لە ڕاست ئەوان چاو لێنەدەکرد· ئەو نۆزدە ڕۆژە دەرسێکی باشمان لە دابونەریتی خەڵکی نیپاڵ وەرگرت کە تا کۆتایی ژیان بەسمان بوو· تێکۆشان بۆ ئەوەی کۆڵکێشەکان گوێگرمان بن و بەقسەمان بکەن، بێکەلک بوو، ئەوان هەر لە سەر شێوازی خۆیان بوون و هەر بەو جۆرەش دەجووڵانەوە· بۆ وێنە ئەوان ڕۆژی دیاریکراویان بۆ حەسانەوە هەبوو و کاریان نەدەکرد، پێم ڕاگەیاندن و گوتم ئێمەبۆ کار پارە دەدەین نەک بۆ حەسانەوە و بۆخۆشمان بارەکان هەڵدەگرین چونکە بەپەلەین و دەبێ بگەینە جێ· بەخۆم گوت چ ڕۆژێکی تایبەتە بۆ حەسانەوە· بەو جۆرە کابرای نیپاڵی ڕاوەستا هەتا قسەکانی من تەواو بوو و گوتی بە هەر حاڵ دەبێ ئێوە کۆڵکێشەکان بگۆڕن دەنا ئێمە ناڕۆین بۆ گوندەکانی تر· گوتم ئەوە لە بیر خۆتان بەرنەوە چونکە ئێمە هیچ کۆڵکێشێک ناگۆڕین· بەڵام بەیانی بۆمان ڕوون بۆوە کە دەبێ ئەو کارە بکەین، چونکە گوند بە گوند کارەکانیان دەگۆڕی و ئەوەش دابونەریتی ئەوێ بوو و هیچ دێیەک کاری دێیەکی تری بەڕێوە نەدەبرد· بەو جۆرە هەر دەهات و کارەکەمان لێ تاڵتر دەبوو و زۆریشی نەمابوو کە تووشی کێشە بین· هەڵبەت پێویست بوو هەزار گرفتی دیکە وەبیر خۆمان بێنینەوە، بەڵام لەو کاتانەدا زۆر هاسان نەبوو کە سەبرت هەبێ کە دەبوو هەتبا· زۆری نەمابوو لە نێوان ویزیک و یەکێک لە کۆڵکێشەکان شەڕی دەستەویەخە ڕوو بدا، ئەگەر ئەو کێشەیەش وەدی هاتبا هەموو دەڕۆیشتن و کەس نەدەما کۆڵمان بۆ هەڵگرێ· بێجگە لەوانەش لە هەموو کاتەکاندا زۆر بەتوندی باران دەباری· خێوەتەکەی من بە ویشکی حەوت کیلۆ بوو، بەڵام ئەو جار کە شەو تا بەیان باران دەباری، دوو بەرابەر قورس ببوو و بەهۆی بارانی زۆریش نەمدەتوانی ویشکی بکەمەوە·

وێنەی دیمەنەکە بە وەدیهاتنی زنیرووەکان مێوانداریی بەرنامەکەی ڕازاوەتر کردین· ئەو دنیا تەڕ و پڕ بارانە بەهەشتی ئەوان بوو و ئەو لقوپۆپانەی کە بە پێلێنان وەجووڵەمان خستبوون، ببووە هۆی بریندار بوونی لاقوولەتەرمان·

بەلام ئەوەشمان نابێ لە بیر بچێتەوە کە دوای هەر هەورازێک هاتنە خوارێکیش هەیە· هەرکە گەیشتینە نامچە بازارِ چۆنیەتی هەوا گۆرِا و بەرزاییشمان بوو بە ٣٤٠٠ میتر· بەو جۆرە گەیشتینە شاری شێرپاکان کە کەسانێکی تایبەت کە ڕواڵەتی ناوچەکەیان پێوە دیار بوو، کە دەبوو بە ناوی پیاوانی سەرزەوی خۆمبۆ ناویان بێنی· تاڵییەکانمان کۆتایی پێهاتبوو و دەتگوت لە داوێنی کێوەکانی تاترادا شاخەوانی دەکەین· لێرەوە کاری یاکەکان بۆ گواستنەوەی بارەکان بە شێوەی کاروان دەستی پێدەکرد و بە شێوەیەکی تایبەت گرفتەکانی ئێمەیان کە گوازتنەوەی کەلوپەلەکان بوو کۆتایی پێهێنا· لە هەر شوێنێک بارەکان دەکەوتن و لێک بلاو دەبوونەوە، زۆر بەئەسپایی دووبارە کۆمان دەکردنەوە و دەمانپێچانەوە و وەرِێ دەکەوتین· بەو جۆرە لێرەدا بۆ یەکەمین جار بوو دەحەساینەوە· لە سەرەتای مانگی سێپتامبەر گەیشتینە خێوەتگای تایبەت کە دروست لە داوێنی ئێوێرست و لۆتسەدا جێگیر ببوو· بەو جۆرە دوای خۆرِاگرییەکی زۆر لە بەرابەر شەرِ و کێشە و پێوەدانی زێروەکان، گەیشتینە شوێنێک کە ماوەیەکی زۆر بوو بەئاوات بووین کە خۆی بگەیەنێنێ· چەند رِۆژێک بەر لە ئێمە گرووپێکی نێونەتەوەیی هاتبوونە ئەوێ و خێوەتەکانیان هەڵدابوو کە لە ئاڵمانەوە سەرچاوەی گرتبوو،بەلام شاخەوانی تریش لە ولاتەکانی وەک سوویس، فەرِەنسە و ئالاسکادا بەشدار بوون· تا ئەو کاتە خۆمان بە کەش‌وهەوای مەڵبەندەکە رِاهێنا کە بەرزایی ٥٤٠٠ میتر بوو، سێ رِۆژی خایاند· چکۆلەترین جوولانەوە لە بەرزاییدا وەک کامووسی شەوانە وابوو، سەرمان قورس دەبوو و حاڵەتێکی رِشانەوەشمان بۆ پێش دەهات· زۆرم پێ خۆش بوو بچمە ژێر بەردێک و برِشێمەوە و لە دەستی رِزگار بم· لێرەدا بوو کە تێگەیشتم باشترین بەرگری لە نەخۆشیی بەرزایی لە کێودا ئەوەیە کە مرۆڤ دایم بجووڵێتەوە و لەشی پەروەردە بکا تا باش رِێی هەناسەی بکرێتەوە و خوێن لە نێو دەمارەکانیدا بەباشی بێت و بچێ و بەو جۆرە لەش بەربەرەکانی لەگەڵ نەخۆشیی بەرزایی دەکا·

بە کۆتایی هاتنی کارەکان و بە دامەزراندنی کەلوپەلەکان

لەو شوێنانەی کە بۆیان دیاری کرابوو، توانیمان بۆ یەکەم جار کات بە دەست بێنین کە لێکۆڵینەوە لە سەر کێوەکانی دەورووبەرمان بکەین. ئێمە دەمانهەویست لووتکەی لۆتسە ببەزێنین، بەلام هەموومان چاومان بڕیبووە هاوسێی باکووری، یانی لووتکەی ئێوێرێست کە بە قەلافەتەوە سێبەری بە سەر ئێمە کێشابوو. لووتکەی زۆر جوان و ڕازاوە لە مەڵبەندەکەدا بوون، بەلام ئێوێرێست چونکە بەرزترینیانە هەر کەسێک بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و هەستی دەبزوێنێ کە هەوڵێکی بۆ بدا، بەلام ئەو هەستە پێویستی بە گرووپێکی ڕێکوپێک و تازە بوو و سەرەڕای ئەوەش ئێمە لە خۆمان ڕادەدی. ئەگەر لە دەستم هاتبا بەڵگەکەم بگۆڕم و داوایەکیشیان لێبکەم وابزانم خراپ نەبوو و قسەیەکیشم لەگەڵ گرووپی نێونەتەوەیی کردبا کە لەوانە بوو کەسێک هەبێ کە بە جێگای ئێوێرێست، لۆتسە ببەزێنێ. بەو جۆرە یەکێک لە ئێمە دەیتوانی خۆی ڕەگەڵ گرووپی نێونەتەوەیی بخا. دیار بوو ئەوان بۆ بەرنامەکەیان پەلەیان نەدەکرد. هەر ئاوا بڕیارمان دا کاتێک بچم کە لووتکەکەی خۆمان بەزاندبایە. ئەگەر بڵێن کێهە لەو دوو کێوانە هاسان یان دژوارترە کارێکی هاسان نییە، لە لایەن تکنیکییەوە دەتوانم بڵێم وەک یەکن، بەلام ئێوێرست ۳۳۷ میتر بەرزترە کە لە باری بەرزاییەوە جیاوازییەک وەبەرچاو دێ کە تا بەرزایی ۷۳۰۰ میتری ڕێگای هەر دووک کێوەکان وەک یەک وایە.

هەر لە ئێستاوە زۆرم بۆ ناخۆش بوو کە هۆی دوو بەڵگەی جیاواز یەک بۆ ڕاست و ئەوەی تر بۆ چەپ ڕێگایان لێک هەڵدەبڕین. ئەوە یەکەمین بەرنامەی گرووپێکی لێهستانی بوو لە سەر چوارەمین لووتکەی بەرزی جیهان و لەو کاتەشدا چوارەمین بەرنامەش بوو کە لە سەر ئەو لووتکەیە بەڕێوە دەچوو. بەو جۆرەش هەر نەمدەتوانی بیری لێنەکەمەوە و خۆم ڕازی کەم، بۆ جارێکیش بە مێشکمدا نەهات کە بزانم من کێم. من کەسێک بووم لە لووتکەی مەککیلی لە ئالاسکا ئاوام بە سەر هاتبوو، لووتکەیەکی ۷۰۰۰ میتریشم لە هیندوکۆش بەزاندبوو، لە نانگاپارباتیش لە بەرزایی ۸۰۰۰ میتری گەڕابوومەوە و ئێستا لە بەرامبەر لۆتسەدا خۆم بە زۆر دەزانی و خۆم هەڵدەکێشا.

زۆریش ڕاسته و زۆریش بەجێیە، بەڵام ڕووداوەکە بەجۆرێک بوو کە لە دەروونی مندا شتێک هەیە کە من وازم لە کاری چکۆلە نەبوو و هەمیشە چاوم بەدوای کاری گەورەوە بوو، یانی هەمیشە لە سەر ئەو بڕوایەم کە یان کاری گەورە یان هیچ. ئەوەش ئەو شتەیە کە دەروونی ئێمە ئاور تێبەردەدا. بەڵام ئەوەی کە لەو کاتەدا ئێمەی ئازار دەدا ئەوە بوو کە بە ڕێگای باکووری ڕۆژئاوادا وەسەر دەکەوتین کە ئەوەی ڕاستی بێ هیچ بەڵگەیەکی تازەمان بەدەست نەهێنابوو. لەگەڵ یانۆژ و ئاندرێ لە بارەی ئەوە کە هێندێک ڕێگاکەمان بۆ لای ڕاست بەرین و خۆمان بگەیەنینە ڕێگای ڕۆژئاوای کێوەکە وتووێژمان کرد. کەمێک نارەزایەتیم لە داواکانمدا دەدی، چاوم لەوە بوو کەڕێگایەکی تازە هەڵبژێرن کە لە بواری تکنیکیش بەرچاو بێ. دالانێکی دووردرێژ لەوێدا دیار بوو کە دەتتوانی وەکوو کارێکی تازە کەلکی لێوەرگری. وا باشە ئەوەش بڵێین کە ئەو جۆرە کارانە لە تاتردا بەرچاو بوون، بەڵام لە هیمالییا زۆر جیاواز بوو. لە داوێنی بەرزترین لووتکەی جیهان دەمانهەویست ڕێگایەک هەڵبژێرین. بەرنامەیەکی تریشمان داڕشت ئەویش بەزاندنی لۆتسە بێکەلک وەرگرتن لە ئۆکسیژێن بوو. چوار کەس لە نێو گرووپەکەدا بەڵێنیان دا ئەو کارە بەڕێوەبەرنکە بریتی بوون لە ئاندرێ ژووک، زۆگا هاینریش، یانۆژ شۆرک و من، بەڵام زۆگا زۆر زوو پەشیمان بۆوە و ئەو کارەی بەهەڵە دەزانی لێرەدا وا باشە ئەوەش وەبیر بێنمەوە کە زۆربەی هاوڕێیان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە وەدیهاتنی نەخۆشی مێشکی لە لایەن کەمی ئۆکسیژێنەوەیە. لە خێوەتگای تایبەتیش بە گاڵتە بە ئێمەیان گوت کە سیللوولەکانیان لە بەین دەچن و وەک کەسێکی گێل و حۆلتان بە سەر دێ، بەڵام پەشیمانی زۆگا هیچ بەهۆی ئەو گاڵتەیە نەبوو.

دوای هەڵدانی خێوەتگای چوار کە مانگێکی خایاند، من و ئەوانی تر بەڵێنمان دا کە بێ کەلکوەرگرتن لە ئۆکسیژێن لووتکەکە ببەزێنین. پێداویستەکانی ئۆکسیژێنمان بۆ خێوەتگای چوار لە بەرزایی ٧٨٠٠ میتری ڕاگوێست و بوو بە کۆتایی هاتنی کارەکە و حەسانەوە و ئینجا گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت. لە خێوەتگای تایبەت بەو جۆرە

بڕیار درا و ئەو چوار کەسەیان لە سەرەتاوە بۆ لووتکە دیاری کرد. ئادام بیژۆسکی بەڕێوەبەری گرووپەکە کە زۆر پیاوێکی خۆشڕاوێژ و دیمۆکرات بوو و لێرەدا دەستی ئێمەشی ئاواڵە کردبۆوە و کاتێک بڕیارمان دا ئەو گەلاڵەیە دارێژین، خێوەتگای تایبەتمان جێهێشت و دووبارە خۆمان گەیاندە خێوەتگای چوار. بەیانی زوو بۆ لای لووتکە وەڕێکەوتین، ئەوجار کاتی بڕیاردان بوو کە دەبوو بیرێک بۆ کەپسوولە ئۆکسیژێنەکان بکەینەوە. ئاندرێ ژووک هەر لە سەرەتاوە داوای خۆی ڕاگەیاند کە زۆریشمان بۆ گرینگ نەبوو و گوتی بێ کەلکوەرگرتن لە ئۆکسیژێن وەسەر دەکەوم. ئەوجار شۆرک دوای ڕاگەیاندنی ئەو مەسەلەیە ویستی خۆی لە کاری ترسناک بپارێزێ و ئەویش کەپسوولی ئۆکسیژێنی دەست دایە. زۆگاش کە زۆر بەترسەوە قسەی دەکرد گوتی منیش دەستی دەدەمێ. بەو جۆرە منیش بەڵێنم بە خۆم دا کە دەستی دەمێ بەلام کەلکی لێ وەرنەگرم کە هەموو دەبۆ ١٠ کیلۆ. لە سەرەتاوە دەمهەویست بزانم جیاوازییەک لە کارەکەمان دا وەدی دێ یان نا؟ بڕیارم دا کاتژمێرێک لەگەڵ ئاندرێ بڕۆم کە بەو جۆرە دەمتوانی ڕوونی کەمەوە کە ئەوانەی لە ئۆکسیژێن کەلک وەردەگرن، لە ڕێگا ڕۆیشتندا چەندە جیاوازیان هەیە. چونکە ئۆکسیژێن یاریدەی توانای ئینسان دەدا. ئەوەی ڕاستی بێ بەباشی لە دەروونی خۆم ئاگادار بووم کە چۆن لە کێودا دڵم لێدەدا، هەر بەو هۆیەش لە خۆم ڕادەدی کە ئەو کارە بکەم. دوای کاتژمێرێک ڕێپێوان سەرنجم دا و دیتم هەر چەند میترێک لە ئاندرێ وەدواکەوتووم، بەو هۆیە هەر لەوێ پێم گوت دەمەوێ کەپسوولەکان هەر ئەلێرە بەجێ بێڵم و لە نێو بەفریان باوێم و هەر واشم کرد. ئەوجار بارم سووکتر بوو و خێراتر بە ڕێگادا دەڕۆیشتم، بەلام دوای سێ کاتژمێر ئەو دوو کەسەی کەلکیان لە ئۆکسیژێن وەردەگرت کاتژمێرێک لە من وەپێش کەوتبوون. لە بەرزایی ٨٠٠٠ میتریدا ئەو نێوانە زۆرتر بوو و من سەبرتر لە وان دەڕۆیشتم. هەموو قورساییم خستبووە سەر کۆڵینگەکەم و کەمێک دەحەسامەوە و دووبارە دە هەنگاوی ترم هەڵدێنا. ویستم بە ئەسپایی درێژە بە ڕێگاکە بدەم، بەلام هەڵەم ئەوە بوو کە دوای هەر ڕاوەستانێک

دادەنیشتم.
هەر بەوجۆرە خۆم گەیاندە بستووی لووتکەکە. لەوێوە بەفرەکە زۆرتر بوو. دیواری لای ڕاست و چەپی ڕێگاکە ببوە هۆی ئەوە کە وەک توونێلێک بای پێدا بێ. بایەکە لە لای ڕۆژئاواوە دەهات و دەبوو بە هۆی پاڵپێوەنانم بۆ لای شوێنی دیاریکراو. کاتێک یانۆژ و زۆگا لە لووتکە دەگەڕانەوە ئێمە هێشتا بڕێکمان ڕێگا مابوو. پێیان گوتم ئافرین سەرکەوتوو بووی. زارم کرابۆوە و گەرووم ویشک ببوو و هانکە هانکیشم وێکەوتبوو. پێیان گوتم زۆرت نەماوە هەر ٢٠ میتر دەبێ، بەڵام ئێمە لە سەر ڕاناوەستین. لەو کاتەی کە شان بە شانی یەکەوە دەڕۆیشتین و پیرۆزباییمان بەیەک دەگوت گەیشتینە سەر لووتکەکە کە وێنەیەکی جوان و ڕازاوەی بەخۆوە گرتبوو. دووربینەکەم دەرهێنا و دەستم کرد بە وێنە هەڵگرتن لە خۆم و لە ئاڵای یەکەمین شوێنی شاخەوانی و ئاڵای کلووپی کاتوویس.

لە دەوروبەری نیوەی ڕۆژدا بووین کە هیچ هەستم بە خۆشحاڵی و ڕازیبوون نەدەکردد و بیرم لە شەش کاتژمێری تەواو کە دەجار دەجار هەنگاوم هەڵێنابووە دەکردەوە و دیاربوو کات زۆر بە سەبری تێپەڕ ببوو. تەنانەت لە بیرم نییە کە لە سەر لووتکە چیم کردووە! وێنەهەڵگرتنم لەبیرە، بەڵام کاتێک لە لووتکە نیزیک دەبوومەوە لەبیرمە گەیشتمە زۆگا و یانۆژ کە دەگەڕانەوە من دەبوو ڕێگایەکی تریشم هەتا لووتکە بڕیبا و لەوە زیاتر هیچی ترم وەبیر نایە. لە سەر لووتکەش بە ماندوویەتییەکی زۆرەوە بیرم لە هەرچی زووتر گەڕانەوە دەکردەوە. ئەوجار دەبوو لەو توونێلە تێپەڕ ببام، کە ئەوجار باش دەی پڕینگاندمەوە. دوای ئەوە خێوەتگای چوار و و پاشانیش خۆم گەیاندە خێوەتگای سێ کە بیلژۆسکی و بارانک لەوێ چاوەڕوانم بوون و ئەوانیش دەیانهەویست بۆ بەیانی بڕونە سەرێ تا بۆ ئەو دوو کەسەی تر ئۆکسیژێن بەرنە سەرێ. بەهۆی سەرکەوتنی من بێ ئۆکسیژێن سەریان سووڕ مابوو و زۆر خۆشحاڵ بوون. چایی و سووپی گەرمیان بۆ دروست کردبووم. کەمێکی پێچوو تا هۆشم باشتر بۆوە. زۆک و شۆرک دەیانهەویست بچنە خێوەتگای دووهەم کە ئەوێ

شتی زۆرتری لێ بوو و بۆ حەسانەوەشیان باشتر بوو، بەڵام من بە وانی ترم گوت دەمەوێ شەوێکی تر لێرە لە لاتان بمێنمەوە. هەستێکی تایبەتم لە خۆمدا بەدی دەکرد بەڵام دەرمنەدەبڕی. کەشوهەوایەکی تایبەتی هەبوو. بە بڕوای خۆم بۆم جێی شەرم بوو کە کێوێک جێ بێڵم کە ئەو هەموو بەدوایەوە بووم و هێز و تواناشم لە ڕێی دانابوو و خەرجێکی زۆریشم بۆ کردبوو. زۆر بەتوانا بووم، چوومە نێو کیسە خەوەکەمەوە لەگەڵ ئەوانیتر دەستم بەگاڵتە کرد. کاتێک کە گەڕامەوە بۆ خێوەتگای تایبەت جەژنییان گرتبوو، بەڵام ئەو خۆشی و شادی و ئازادییە زۆری نەخایاند. لەپڕ هەواڵێکی دڵتەزێنیان پێداین و گوتیان گرووپی نێونەتەوەیی ڕووداوێکی دڵتەزێنیان بۆ هاتۆتە پێش.

ڕۆژێک بەر لەوەی ئێمە بۆ لووتکە وەڕێکەوین، ئەوان لووتکەی ئێویرستیان بەزاندبوو. لە گرووپی دووهەمی بەزاندنی لووتکە، خێزانی بەڕێوەبەری گرووپەکە خاتوو هانۆلۆرە شماتیسیان لەگەڵ بوو کە لەگەڵ هاوڕێی مەڵبەندەکانی ئالاسکای من، ڕای گێنت و دوو شێرپا لە درنگانێکدا دەگەنە لووتکە. ئەو یەکەمین ژنی ئالمانی بوو کە ئەو سەرکەوتنەی بەدەست دێنا، لە گەڕانەوەدا کە شەو لە شوێنێک خۆیان حەشار دابوو، هەر لەو شوێنە لە ماندوێتیان ڕای گێنت دەمرێ. ئێمە هەموو ڕووداوەکەمان لە سەرەتاوە بە چاوی خۆمان دیتبوو. ئەو ڕۆژە کە بۆلای خێوەتگای چوار وەسەر دەکەوتین، چەند کیلۆمیترێک دوورتر چەند خاڵی ڕەشمان لە سەر بەفرەکان چاو پێکەوت کە دەجووڵانەوە و دیتمان کە سێ خاڵی ڕەش بە ئارامی بۆ لای خوارێ دەڕۆیشتن، یەکێک لەوان ڕاوەستاو بەدوای ئەوەشدا ئەوانی تریش ڕاوەستان. من لەو کاتدا وامزانی بۆ حەسانەوە ڕاوەستاون، بەڵام دوای ساتێک دیتم کە هەر دوو دانە لەو خاڵانە دێنە خوارێ و یەکێک لەوان لە شوێنی خۆی ڕاوەستاوە. دوایە دیتمان یەکێک لەو دووانەش دووبارە بەرەو سەر گەڕاوە. گوێم لێبوو کە ڕێزدار میسنێر دێ. گرووپی ڕێزدار میسنێر و دوو شێرپا بە هانکەهانک بەرەو سەر دەهاتن. ئەگەر زمانی لێهستانییان زانیبا بەر لە هەموو شتێک دەیانگوت بڕۆنە ئەو لاوە زبڵدانەکان. لە گەڕانەوە بەرەوخوار لە نامچە بازاڕ

ڕاوەستاین کە بەباشی ڕازابۆوە· کۆڵەکانمان لە سەر زەوی دانا و خێوەتەکانمان هەڵدا· دوو شێرپا هەوالی گەیشتنە جێی گرووپەکەیان هێنا و خێوەتەکەیان بۆ هەڵدان و ماوەیەکی زۆر خەریکی بوون و زۆر بەجوانی ڕازاندیانەوە· چرایەکیان لە نێودا بۆ هەڵکرد و تەختی خەویکیشیان بۆ ڕێکوپێک کرد· ئێمە بەباشی شاهیدی ئەو جورە کارە تایبەتانە بووین و وامان هەست دەردەبڕی کە ئەوە بۆ ئێمە یەکەم جار نییە· دوای چەند خولەک مۆرەی تایبەتی گرووپەکە سەروکەللەی وەدیهات·

بەڵێ ڕینهۆڵد میسنێر کە بۆ یەکەم جار بوو چاوم پێیدەکەوت و وەک کابرایەکی ئاسایی دەجووڵاوە· کاتێک کۆڵەکەی لە سەر زەوی دانا، چێشتی ئێمە لە سەر ئاور دەکوڵی· ئەومان بۆ خواردنی سووپ و چاخواردنەوە بانگهێشت کرد کە هەموو لە قاپێکدا دەمانخوارد· هات بۆ لامان و گوتی لەکوێ بوون؟ بە ئارامی وەلاممان داوە و گوتمان لە لۆتسە دەگەڕێینەوە· بەئەسپایی بزەیەکی هاتێ و ئیتر نە هیچی گوت و نە پیرۆزباییشی پێگوتین· ئەوجار گوتمان بەرنامەی ئێوە چییە؟ گوتی ئادامابلام· هەموو ٦٨٥٦ میتری بەرزایی بوو و زۆر لەسەر زاران بوو، بەلام بە بڕوای من لەو کێوە چکۆلانە بوو کە لێرەدا دەورەی درابوو· ویستم باسەکە بگۆڕم· گوتم دوو ساڵ لەمەوبەر ئێمە بە ڕێگایەکی تازەدا بۆ نانگاپاڕبات چووین و هەتا بەرزای ٨٠٠٠ میتری وەسەر کەوتین و لە لووتکەکەش نیزیک ببووینەوە کە لەو شوێنە چراقەوەیەکم دۆزییەوە· هەرکە ئەوەم گوت ڕینهوڵد کە لەگەڵ هاوڕێیانی کۆنی قسەی دەکرد، لەپڕ بێدەنگ بوو و چاوی لە من بڕی و گوتی چراقەوە؟ چاولێکردنەکەی مانای هەبوو· گوتم بەڵێ چراقەوە، بەلام من نازانم ئەو چراقەوەیە بۆ لەوێ بوو، چونکە ڕێگاکەی ئێمە ڕێگایەکی تازە بوو· گوتی نۆ ساڵ لەمەوبەر من خۆم گەیاندە ئەو بستوویە و دوای ئەوەی کە ڕێگای باشوورمان لەگەڵ براکەم بەزاند، لە ڕێگای گەڕانەوەدا گیانی لەدەست دا، ئەوە دەبێ چراقەوەی گۆنترێر بێ· ئەوە هەمان شوێنە کە لەوێ قەوەکانی گۆڕی و منیش دوای نۆ ساڵ ئەو چراقەوەیە دەبینمەوە· ئەو ڕووداوە بوو بە هۆی پەیوەندییەک لە نێوانماندا، بەلام من نەمدەتوانی

چاو له سەر کەلوپەلەکانی هەڵگرم، چونکە تا ئەو کاتە ئەو جۆرە شتومەکە باش و بەنرخانەم نەدیبوو کە شێرپاکان بۆ شوێنی خێوەتگا ڕایاندەگوازتن. گوتی داوایەکم لێت هەیە، گوتی داوایەکم لێت هەیە، من ئەوە لە بارەی ڕووداوی ئانگاپاربات کتێبێک دەنووسم کە وێڕای ڕێز و حورمەت داوات لێدەکەم ئەو چراقەوەم بۆ بنێرییەوە چونکە بیرەوەرییەک لە براکەمە. هیوادارم لێم تێگەیبی و چەند خەتێکیشمان بۆ بنووسی کە چۆنت دۆزیوەتەوە. گوتم بەسەرچاو، ناونیشانی یەکترمان وەرگرت و دوایەش ویستمان وێنە لەگەڵ یەکدا بگرین بەلام هەوا تاریک ببوو. ئەگەر ئەوڕۆ بمانهەوێ چاو لە وێنەکە بکەین، بە سەختی تێدەگەین کە کێ کێیە. بەیانی ئەوان ڕۆیشتنە سەرێ و ئێمەش بەرەوخوار بووینەوە.

ڕۆژنامەیەکی چاپی وەرشۆ، هەواڵی بەزاندنی گرووپێکی لیهستانی لە لووتکەی لۆتسە ڕاگەیاندبوو بەلام شتێکی کەمی لە بارەی ئەودا نووسیبوو کە لەو ڕۆدا بەزاندنی لووتکەیەکی ئاوا نابێ وەکوو سەرکەوتنێکی گەورە ناوی لێبندرێ تەنانەت ئەگەر ۸۰۰۰ میتریش بێ. ئەو نووسراوەیە منی ڕاتڵەکاند و ماوەیەکی خایاند کە بیسەلمێنم حەق بەوانە، چونکە ماوەیەکی زۆر لە ڕێکەوتی کاری لیهستانییەکان لە هیمالییا تێپەڕ نەببوو.

ڕۆژی چوارەمی دیسامبر بۆ ماڵێ گەڕامەوە. ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئاندرێ زاوادا لە وەرشۆ پەیوەندیم گرت. پیرۆزبایی پێگوتم و گوتی یۆرک بەرنامەیەکی تایبەتم بۆت هەیە. دەتهەوێ لە یەکەمین بەرنامەی زستانیی ئێوێرێستدا لەگەڵ ئێمە بەشدار بی؟ دوو حەوتووی دیکە وەرێدەکەوین. ئەو پەیوەندییە بۆ ئێمە خاڵێکی هەڵسووڕ بوو، دیار بوو ئەوجار زۆرێک ئەوەیان سەلماندبوو کە من دەمهەوێ بۆ لووتکە بەرزەکان بچم. بەلام ماڵەکەمان لێ شێوابوو، سیلینای هاوسەرم منداڵی لە زگیدا بوو و وادیار بوو کە مانگی ژانوییە منداڵەکە دەهاتە دنیا و بەوجۆرە چۆنییەتی دەروونی خێزانم باش نەبوو. گوتی تەلەفوونەکەم ڕاگرتبوو و قسەکانی زاوادام گوێ دەدایە کە مێشکی سەرم هەر کازەی دەهات. بیرم دەکردەوە ئێوێرێست لە زستاندا؟! بەلام

هەرچەند حەوتوو لەمەوبەر لەوێ بووم کە ئیزنی بەزاندنیان پێنەدام، لەوانە بوو تازە بەختێکی ئاوا ڕووم تێنەکاتەوە˙ بەوجۆرە دەست و لاقم دەلەرزی˙ لە نێو قسەکانی ئاندرێدا دیاربوو کە ئەگەر سەرکەوتوو نەبن هەر لەو ساڵەدا هەوڵێکی تری بۆ دەدەن کە دەکەوێتە بەهاری ساڵی دوایی˙ بەوجۆرە ئەگەر لە زستاندا نەیانتوانی کەلوپەلەکانی پێداویستیان بەرنە خێوەتگای تایبەت، لە بەهار دا دەستبەکار بن˙ منیش ئاوا وەلامم دانەوە و گوتم من ناتوانم لە بەرنامەی زستاندا بەشدار بم، بەلام ناوم لە بەرنامەی بەهاردا بنووسە، دەمهەوێ لەگەڵت ڕووڕاست بم˙ گوتی لێم ڕوون نییە بەرنامەی بەهارمان بۆ بەرێوە دەچێ یان نا، من بەو جۆرەم بیر لێکردۆتەوە کە ئەگەر بۆمان بکرێ لە زستاندا بەڕێوەی بەرین و ئەگینا لە بەهاردا ئەو کارە بکەین˙ تێگەیشتم کە ئاندرێ دەیهەوێ ئەگەر لە بەرنامەی زستاندا سەرکەوتوو نەبێ بەرنامەی بەهاری بەڕێوە بەرێ˙ بە هەر شێوەیەک با من نەمدەتوانی ویستی خۆم بگۆڕم و گوتم ئاندرێ ئەوەی پێم گوتی هەر ئەوەیە و ناتوانم لەگەڵتان بێم و تەلەفوونەکەم لە سەر جێی خۆی دانایەوە˙

ڕۆژی پازدەهەمی دیسامبر یەکەمین گرووپ بێ من خۆیان گەیاندە نێپاڵ بەلام زۆر شتی تریش هەبوو کە لە هیمالییا بە کەلکتر بوون بۆم کە بەکەلکترینیشیان ئەوە بوو کە لە ساڵی تازەدا کوڕەکەم دەهاتە دنیا کە ناوی ئەوم نا، ماسیک˙




# بەشی ٣

**ئێوێرست، ڕێگای لیهستانییەکان، ڕێگای باشوور**
**ساڵی ١٩٨٠**

ماوەیەک لە چاوەڕوانیم تێپەڕ بوو تا ئەو کاتەی لە هەواڵنێرەوە لە هەواڵی گرووپی بەڕێکراوی لیهستان بۆ بەزاندنی لووتکەی ئێویرێست ئاگادار کرامەوە. هۆی ئەو وەدواکەوتنەش ئەوە بوو کە لیژیک سیچی و کرۆزیک ویلیسکی دوای ماوەیەک و لە ڕێکەوتی حەڤدەی فێوریەدا توانیان لووتکە ببەزێنن. سەرکەوتنی ئەوان بوو بە هۆی نارەحەتی دەروونی بۆ من و دڵتەنگیی منی دووبەرابەر کرد. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەوجار دەبێ چ بکەم؟
دەمگوت دەبێ گرووپی تر لە بەهاردا بەڕێ بکەن. کاتێک لەو بوارەدا لەگەڵ ئاندریێ زاوادا قسەم کرد لە قسەکانیڕا وا دەردەکەوت کەهیچ هومێدێکی نییە، بەڵام من بڕوایەکی پتەوم بەو هەبوو. چۆنیەتی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی بەرنامەکانی جۆرێک بوو کە هەمیشە بۆ هەر کارێک دەبووە هۆی هاندان و بەرەوپێش بردن تەنانەت ئەگەر

سەختترین کاریش با· دوای بەزاندنی ئێوێرێست لە زستاندا کاتی ئەوە هاتبوو کە جارێکی تریش لە ڕێگای تازەوە ببەزێندرێ·

ئەوە بەڵێنییەک بوو کە لە لایان زاواداوە درابوو کە هەر بەو هۆیەشەوە دوو کەس لە گرووپی زستان بە ناوەکانی زۆگا هاینریش و والدیک ئۆلک لە خێوەتگای تایبەت بۆ ئاگاداری لە بارەکان جێ هێشتبوو و ئەوانی تر لەگەڵ خۆی گەڕابوونەوە بۆ وڵات· گەڕانەوەی ئەو بەهۆی بەشداری لە کۆبوونەوەی ڕازاوەی گرووپەکە بە بۆنەی بەزاندنی لووتکە نەبوو، بەڵکوو بەهۆی کۆکردنەوەی پارەی زیاتر بۆ بەرنامەی دووهەمی ئێوێرێست بوو· سەختی کارەکەمان کاتێک کۆتایی هات کە یۆلیان گۆلۆسکی لە سوویسەوە پشتیوانی ماڵی لێکردین·

لە یەکەمی مانگی مارس لەگەڵ گرووپی یەکەم بە فرۆکە وەڕێ کەوتم· زاوادا بەبۆنەی پارە کۆکردنەوە زۆرتر لە لێهستان مایەوە، ئەو بەباشی ئاگادار بوو کە لە بارەی چۆنیەتی جووڵانەوەی بەڕێوەبەرایەتی لەگەڵ گرفتێکی گەورە ڕووبەڕوو بۆتەوە و ئەویش بەوجۆرە بوو کە گرووپی بەرنامەی زستانیی ئەوان پەیوەندییەکی ڕاشکاوانەی بێیاسایی بۆ لێهستان هەبوو، کە ئەو چالاکییە لە نیپاڵ بە کارێکی بێجێ دەهاتە بەرچاو· دەبێ هەموو شتێک لە کاناڵی بنکەی گەشتوگوزارەوە بۆ دەرەوەی وڵات بەڕێ بکرێ و ڕوون و ئاشکرا بوو کە هێندێک لەو کەسانەی لە خێوەتگای تایبەت بوون لە لایەن کاناڵێکی ڕادوێییەوە توانیبوویان لەگەڵ لێهستان پەیوەندی بگرن و گرینگترین هەواڵەکانیش هەر لەو کاناڵەوە ڕابگەیەنن· یەکەمین جار بوو کە لە زستاندا لووتکەی ئێوێرێست دەبەزێندرا کە لە لایەن ویلیسکی و سیچی بوو· ئاشکرا بوو کە گوترابوو داواتان لێدەکەین ئاگادار ببنەوە کە چۆنیەتی ئەو هەواڵەدا دەبێتە هۆی لە دەستدانی کاتی، ئەویش بەوجۆرە کە ۱۹۰۰ کاتژمێری تەواو، مانای پەیوەندی کاتی دەگەیەنێ لە لایان بەڕێوەبەرایەتیەوە کە لەگەڵ خێوەتگای بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزاری نیپاڵ بە پەیوەندی دەگیرا کە بەداخەوە کۆتایی کاتی دیاریکراو بەرابەر بە ڕۆژی یەکشەممۆ و کاتی پشوودان بوو کە هیچ کەس لەوێ نەبوو· گرووپەکە زۆریان هەوڵ دا پەیوەندی بگرن بەلام نەیانتوانی· لە لێهستان هەموو دڵنیگەران و چاوەڕوان بوون کە لە کاتی دیاریکراوی پەیوەندیاندا بەڕێوە بچێ هەتا هەواڵەکە بە دنیا

ڕابگەیەنن. ڕۆژی دوایی توانیان لە خێوەتگای تایبەتڕا هەواڵەکە بە بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزاری نیپاڵ ڕابگەیەنن، کە بە جێی پیرۆزبایی گوتن داوای وتووێژی هەرچی زووتریان لە بارەی کارە بێ جێکەیان لێ کردن. بەو جۆرە زاوادا لەو بیر و خیالاتەدا بوو و وایدەزانی هەموو شتێک بە خۆشی کۆتایی پێهاتووە. سەرۆکانی نیپاڵ بەدوای ئەوە بوون کە نرخی بەڵگەی پێویستی ماڵیات بەدەست بێنن، ئێمەش بێ بەڵگە و بێ بەڕێوەبەر لە کاتماندۆ بووین و پوڵی تەواویشمان پێنەبوو و ڕووداوێکی زۆر ناخۆش بوو بۆمان. حەوتوویەک هەر بەو جۆرە تێپەڕ بوو. ئێمە واماندەزانی بەهۆی ئەو ڕووداوانەی پێشوو وامان بە سەر دێنن و تۆڵەمان لێدەکەنەوە و ترسمان لەوە بوو کە تا وەرگرتنی بەڵگەی پێویست ڕامانگرن کە زۆر وەدرەنگی دەکەوتین. بەو جۆرە بەڵێنمان دا بە شێوەی لێهستانی بجوولێینەوە و ڕاشکاوانە دەستبەکار بین. بە وێنەی گرووپێکی ناوچەیی گەشتوگوزار بۆ خێوەتگای تایبەت وەڕێ کەوتین کە توانیمان بەڵگەی پێویستی ئەو کارە بە کەمێک دۆلار بەدەست بێنین. کاتێک گەیشتینە خێوەتگای تایبەت هەموو شتێک ڕێکوپێک و دیاری کرابوو و هاینریش و ئۆلیگ بە هێمنی چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد. بە زووترین کات دەستبەکار بووین. دوو گرووپی ئیسپانیاییش لە مەڵبەندەکە بوون و خێوەتەکانی خۆیان لە تەنیشت ئێمە هەڵدابوون. بەلام ئەو دوو گرووپە شتێکیان پێبوو کە ئێمە پێمان نەبوو و ئەویش ئەفسەری هاوڕێمان بوو. بەخۆشییەوە هیچ کەس لە بیری نەبوو کە داوای بەڵگەی پێویست لە ئێمە بکا و بەوجۆرە ئێمە بێ ئەفسەر و بەڵگە لە سەرەتای هەڵدانی خێوەتگای دووهەمدا بووین. تەنافی تەواومان پێبوو و لە ڕێگا سەهۆڵەکانی خۆمبۆ بەرەو خێوەتگای سێ، تەنافمان ڕایەڵ کرد کە سەروکەللەی زاواداش پەیدا بوو، بەڵگە لەگیرفاندا و ئەفسەریش بەدوایەوە. لە نێوەڕاستی مانگی ئاوریلدا بووین. ئەگەر لە سەر ڕێی ئەو ڕاوەستابایین و هەتا ئەو کات هیچ کارێکمان نەکردبا، لێمان ڕوون بوو کە بۆ بەزاندنی لووتکەکە زۆر وەدوا دەکەوتین. دوای پازدەی مانگی مەی بایەکانی وەرزی دەست پێدەکەن کە باشتر لە هەموو ئەو یاسایانەی کە لە نیپاڵدان پارێزگاری لە لووتکەکە دەکەن.

لەو بەرنامەدا بۆ بەزاندنی لووتکە دە کەس بووین بە ناوەکانی

گینگ چرۆباک، کریستۆف سیلیسکی، ئاندریێ ژۆک، ڕوزیک کاجۆسکی، زۆگا هاینریش، یانۆژ کۆلیس، والدیک ئۆلگ، کاژیک ڕوزیسکی، ویتیک ویرۆژ و من. هەروەها کرینیژۆسکی و یان سرافین بە ناوی پزشکی گرووپەکە هاوڕێمان بوون. تەنافەکانمان بە شێوەیەکی خۆماڵی ڕایەڵ کرد. خێوەتگای سێهەم لە سەر ڕێگای تازە هەڵکەوتبوو کە لە هەوڵی ئەوەدا بووین ١٧٠٠ میتر لە نێوان ڕێگای ڕۆژئاوا و ڕەوەزەکانی باشووری ڕۆژهەلات وەسەر کەوین. هەموو شتێک بەباشی بەڕێوە دەچوو کە با دەستی پێکرد و گاڵتەی پێدەکردین. ئەوە کەمێک لە چاوەڕوانی ئێمە زیاتر بوو کەبیرمان لێدەکردەوە و کاتی تێپەڕ دەکرد. هەموو ڕۆژێ بەفر دەباری و لەوانەبوو لە هەموو لایەکەوە ڕنوو بێ. هەڵدانی خێوەتگای چوار هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆری پێویست بوو. دوو کەسمان لە هەوەڵەوە سەد میتر تەنافیان ڕایەڵ کرد و بەرەو خوار بوونەوە. ڕۆژی دوایی دوو کەسی تر هەر بەو ڕێگایەدا وەسەر کەوتن تا بەفرە تازەکان لە سەر تەنافەکان لابەرن تا کەلکیان لێ وەرگرین و بەوجۆرە سەد میتری تر تەناف ڕایەڵ کرا. ویتیک ویرۆژ و من یەکەمین کەسانێک بووین کە گەیشتینە شوێنی خێوەتگای چوار و جێگای خێوەتەکەمان بە لاق شێلا پاڵ یەکەوە و هەڵماندا و تێگەیشتین کە ناخۆشترین بەشی بەرنامەکەمان تێپەڕ کردووە. هەمیشە لە هەر گرووپێکدا کاتهایەک وەدی دێ کە هەموو بەسەختی کاردەکەن بەلام پێشکەوتنێک وەبەرچاو نایا، بەلام لێرە هەر ئەو سەدمیتر سەدمیترە تەنافانە لەپڕێک پێشکەوتنی ئێمەی وەبەرچاو هێنا و ئەوەمان بە باشی دەدی.

شوێنی خێوەتەکەمان لە پێش ڕەوەزە بەردێک دیاری کرد کە ببێتە نیشانەیەک بۆ ڕێگای لیهستانییەکان. ئەو ڕەوەزە بەردە کە دەبوو بەوێدا وەسەر کەوین بڵیند و دوورودرێژ بوو و گرینگتر لەوە بەرزاییەکە لە سەرەوەی ٨٠٠٠ میتر بوو. ژۆک و هاینریش و ئۆلگ یەکەمین کەسانێک بوون کە لە سەر ئەو ڕەوەزە دەستبەکار بوون و دوای ڕایەڵ کردنی چل میتر تەناف، زۆر بەسەختی گەڕانەوە خوارێ. بەدوای ئەواندا گاجۆسکی و من ڕێگاکەمان درێژە پێدا. شوێنێک کە تا سالانێکی زۆر بە سەخترین ڕێگای خۆم دەزانی کە پلەی سەختی ئەو شوێنە پێنج V بوو. کار لەو ڕێگایەدا هێز و توانایەکی زۆری

له من وەرگرتبوو بەو جۆرەی که له زۆر شوێندا وام هەست دەکرد که پاتۆڵەکەم تەڕ کردووە. به ڕێگایەکی لێژی بەفراویدا چل میتری دیکه وەسەر کەوتین که ده میتری زۆر سەخت و ئەستەم بوو. دوای ڕایەڵکردنی تەناف که هاتینه خوارێ، دوو کەسی تر له شوێنی کارەکەی ئێمەڕا ڕێگاکەیان تا شوێنی خێوەتگای ئاخر که له بەرزایی ۸۳۰۰ میتریدا بوو وەسەر کەوتن. له نێوەڕاستی مانگی مەیدا بووین و خۆمان بۆ بەزاندنی لووتکه ساز کرد و کات زۆر به ئەسپایی تێپەر دەبوو. بۆ ئەوەی بتوانین بکەوینه سەر بستووی باشووری لووتکەکە، پێویست بوو تا بەرزایی ۸٦۰۰ میتری تەناف ڕایەڵکردنەکەمان درێژه پێبدەین. خێوەتەکەمان زۆر غەڵەبا بوو و هەر کەسه لەبەر خۆیەوە شتێکی دەگوت. منیش داوای خۆم ڕاگەیاند و گوتم وابزانم هەڵگرتنی ئەو هەموو تەنافه تا ئەو بەرزاییه ئیتر تەواوە. ڕایەڵکردنی تەنافی زۆر لەو بەرزاییه که دەبێ هەر بچییه سەرێ و بێیەوە خوارێ توانامان لێدەستێنێ و ماوەشمان زۆر نەماوە. به بڕوای من باشتر ئەوەیه که بەوێنەی گرووپێکی گەورە له خێوەتگای پێنجەمڕا دەستبەکار بین و هێرش بەرینه لووتکه. دیار بوو زۆربەیان له سەر بڕوای من بوون. ژۆکیش هەر وەک من قسەی کرد و گوتی وا بزانم بێ کەلک وەرگرتن له ئۆکسیژێن لووتکه ببەزێنین. بەڵام وابزانم کاتی ئەو داوایه نەبوو، هەر بۆیەش بوو به هۆی ناڕازی بوونی زۆربەی بەڕێزان. نازانم دەنگی کێ بوو کۆتایی بەو گێرەوکێشەیه هێنا و گوتی وەسەر کەوتن بێ ئۆکسیژێن دەبێته هۆی ئەوە که نەتوانین لووتکه ببەزێنین و ئێمه لێرە له هەوڵی ئەوەداین که هەموو گرووپەکه سەرکەوێن. ئاندرێ بێدەنگ بوو و منیش هیچم نەگوت، هەرچەند دەمهەویست ئەو خاڵه ڕابگەیەنم و بڵێم له کارێکی ئاوادا بیرکردنەوە له بەزاندنی بێ ئۆکسیژێن بیرێکی زۆر کورت و بێوەختە. ئەوجار دەبوو چ کەسێک له هەوەڵەوە وەڕێ کەوێ؟ وادیار بوو هەر هەشت کەسمان بۆ بەزاندنی لووتکه دیاری کرابین که له نێو ئەواندا دەتوانم بڵێم ئەستێرەکانی هیمالییای لێهستان وەبەر چاو دەهاتن که بریتی بوون له ویتیک ویرۆژ و گینک چرۆباک که بێجگه له کاره گەورەکانیان له هیمالییا، یەکەمین وەسەرکەوتنیان به ڕێگای باشووری کانگچین چۆنگادا سەرکەوتنێکی گەورە بوو و توانمەندی ئەوان بۆ هەموومان ڕوون و ئاشکرا بوو. ژۆگا هاینریش

کەمێک لەوان لە خوارتر بوو بەڵام وەک گایەکی بەهێز لە نێو ئەواندا دیار بوو، لە هەر گرووپێکدا کارەکانی وەبەر چاو دەهات کە بەو زووانە بە ڕێگای نێوەڕاستی کانگ‌چین چۆنگادا وەسەر کەوتبوو. ئاندرێ ژۆک و من کەمتەمەنترین کەسانی گرووپەکە بووین و تەنانەت لۆتسەمان بەزاندبوو کە ئەویش لە بەر چاوی ئەو گەورەپیاوانە زۆر بەکەم دەهاتە ژمار و زۆریان لە سەر ئێمە حیساب نەدەکرد. بەو جۆرە دەبوو کێهە لەو کەسانە بە ناوی گرووپی یەکەم وەسەر کەون؟ هەموو بێدەنگ بوون. لەو نێوەدا یەکێک بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی من وام پێ باشە کە ویرۆژ و چرۆباک و هاینریش و ئۆلگ، ئەو چوار کەسە وەسەر کەون. منیش خۆم دەنێو هاویشت و گوتم بەتەواوی ڕازیم کە لەگەڵ ئاندرێ ژۆک وەسەر کەوم. گوتیان پێویستمان بە گرووپێکی پشتیوان هەیە. دیار بوو داواکەی من کێشەی بۆ ساز کردین. کەسیش بیری لەو ڕەوەزەی سەر سەرمان نەدەکردەوە کە سەخت و ئەستەم لە ڕێگاکەماندایە. کە زمانمان بەو ڕادەیە درێژ بوو، من ئەو مافەم بە تازە لاوەکان دەدا و کارەکەشم بەهی ئەوان دەزانی. لە نێوان ڕاستییەکاندا یەک چاو حوکمی بەدەست گرت کە لە لایەن ژۆگا هاینریش ڕاگەیەندرا کە هیچ وێنەیەکی درۆی پێوە دیار نەبوو و پتر دەیهەویست ڕاستی دەربڕێ کە من و ئاندرێ ژۆک بە هۆی چالاکی و کاری زۆرتر لەو گرووپەدا هەموو کات هەڵبژێردراین. ئاندرێ زاوادا بەڕێوەبەری گرووپەکە تا ئەو کاتە هەر گوێگر بوو، ، بە دەست پێکردنی قسەکانی بێدەنگییەکی قورسی لە خێوەتەکەدا وەدیهێنا و گوتی من ئاوام پێ باشە کە کۆکۆشکا و ژۆک بۆ وەسەرکەوتن یەکەم کەس بن چون زۆر بە هێز و توانا دێنە بەر چاو، بەدوای ئەواندا ژۆگا هاینریش و ئۆلگ گرووپی چوار کەسەی ئەوان بە خۆیانەوە دەگرن. زۆر جار دەربڕینی هەستێکی وەها بۆ کەسێک زۆر ئەستەم و سەختە چونکە لەو کاتەدا دەبێ بە دەربڕینی هەستەکە ڕێز لە هەموویان بگری و حورمەتی گشتیان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. من ئەوە بەو هۆیەوە ناڵێم کە هەڵبژێردراوم، بەڵکوو لێکۆڵینەوەکە هێشتا کۆتایی پێنەهاتبوو. ژۆگا هاینریش لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە پێش وەرێکەوتنمان بۆ لووتکە، هێندێک لە شوێنەکانی نێو ڕەوەزەکە تەناف ڕایەڵ کەین هەتا گرفتێکمان بۆ نەیەتە پێش. لە بەرابەر قسەکەیدا ڕاوەستام و گوتم ماوەمان بۆ ئەو کارە زۆر نییە،

یان هەر ئێستا دەبێ بۆ لووتکە وەرێکەوین یان بەدەستی بەتاڵەوە بگەڕێینەوە. من و ئاندرێ بەباشی لێمان ڕوون بوو کە کاتمان کەمە و دەبێ پەلە بکەین. ژۆگا ناڕازی نەبوو و بەوجۆرە ڕازی بوو کە بە گرووپێکی چوار کەسەوە وەرێکەوین. زاوادا، کوولیس و ڕۆزیسکی تا خێوەتگای دووهەم لەگەڵمان هاتن. لەو ماوەیە لە لای لۆتسەوە ڕنوویەک هاتبوو و خێوەتەکانی گرووپی ئیسپانیاییەکانی لەگەڵ خۆی ڕەپێچەک دابوو و یەکێک لە شێرپاکانی لەگەڵ خۆی بردبوو، ئەگەرچی دۆزیبیانەوە بەلام دوای سێ ڕۆژ گیانی لە دەست دا. ئەو ڕووداوە ڕاستەوخۆ کاری دە ژۆگا کردبوو، گوتی زۆر بێبەختین و لەگەڵ ئەو خەتەرە چیمان لە دەست نایە. هیچ کەس لە قسەکانی ئەو نارەحەت نەبوو و من لەگەڵ ژۆک درێژەم بە ڕێگاکە دا. ژۆگا و ئۆلگ ڕۆژێک لە ئێمە وەدوا کەوتن کە بە ناوی گرووپی پشتیوانی خۆیان دەنواند. کاتێک گەیشتینە خێوەتگای سێهەم حاڵم زۆر خۆش بوو و دڵم بەباشی لێیدەدا و تێگەیشتم کە چۆن ماوەیەکی زۆر کارکردن لە بەرزاییدا ئێمەی وەگەڕ خستووە کە ڕێگایەک کە جاران بە هەشت کاتژمێر تێپەڕمان دەکرد، ئێستا بە دوو کاتژمێر و نیودا تێپەڕمان کردووە. بەو جۆرە بێ هیچ ڕوداوێک، دوای تەنافە ڕایەڵکراوەکان خۆمان گەیاندە خێوەتگای پێنجەم و لە نێو خێوەتکە دەستمان بە لێکۆڵینەوە کرد. لە سەرەتای کارەکە بیرێک ئێمەی ئازار دەدا و ئەویش بەزاندنی لووتکە بێ ئۆکسیژێن بوو. لە خێوەتگای تایبەتیش هەموو ئێمەیان بەوە تاوانبار دەکرد کە نابێ بێ ئۆکسیژێن کار بکەن، چون لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوە کە نەتوانین لووتکە ببەزێنن و ئەوکات هەموومان دەچووینە ژێر پرسیار. بەزاندنی لۆتسە بێ ئۆکسیژێن بە ڕێگای باشووری ڕۆژئاوادا وا بزانم بەهۆی ئەوە بوو کە زۆر سەخت و تکنیکی نەبوو. بەلام ئێوێرێست بەرزتر و ئێمەش لێمان ڕوون نەبوو کە لێی وەسەر دەکەوین یان نا؟ لە نێو کیسەخەوەکەمدا هەر بیرم دەکردەوە و نارەحەت بووم. لەپڕ گوتم وەرە با بێ ئۆکسیژێن وەسەر کەوین. ئاندرێ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەگەر نەمانتوانی لووتکە ببەزێنین، بەوە تاوانبارمان دەکەن کە بۆ کەلکتان لە ئۆکسیژێن وەرنەگرتووە. هەر بۆیەش دەمامکی ئۆکسیژێنی خۆمان لە دەم کرد و بێ ئەوەی کە گرفتی بێخەوی لە بەرزاییمان بۆ پێش بێ، ئەو شەوەمان بەباشی تێپەڕ

کرد. بەر لەوەی کە بخەوین بە درێژایی دوو گوریس کە دەبووە ٨٠ میتر ڕایەڵمان کرد. کاتژمێر ٥ی بەیانی وەڕێکەوتین. بەهۆی بارینی بەفری تازە نەماندەتوانی بەخێرایی بەڕێگادا بڕۆین و بەفرەکەش زۆر شل بوو و تێیدەکەوتین و بڕستی لێ بڕیبووین. بە تیرەگی خێوەت ئۆکسیژێنەکەم لە سەر یەک هەتا دوو لیتر لە خولەکدا میزان کرد کە ئەو ڕادەیە زۆر کەم بوو، بەڵام ئەو ڕادەیە لە کاتی خەودا بۆ لەش زۆر باش بوو کە شوێنی سەخت و فەننیدا لە سەر هەشت لیتر لە خولەکدا میزانم دەکرد. بەو جۆرەش ڕێگاڕۆیشتمان زۆر بەسەبری بوو.

کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆ بوو کە گەیشتینە لووتکەی باشووری کێوەکە. لە پێش خۆمانەوە ڕەوەزەکی دووردرێژی لێبوو. هەناسەم لەگەڵ هەنگاوەکانم ڕێک نەبوو. هەر لەو کاتەدا بوو کە هاواری ئاندرێم گوێ لێبوو کە گوتی کەپسوولی ئۆکسیژێنەکەم بەتاڵ بووە. قسەی دەپەڕاندن، شێرەی کەپسوولی خۆم هەموو کردەوە بەڵام هیچ حاڵم باش نەبوو و خۆم لەو باشتر نەدەهاتە بەر چاو.

گوتم وا بزانم هی منیش تەواو بووە. دوای تێکۆشانێکی زۆر خۆمان گەیاندە لووتکەی باشوور و بۆ ساتێک چاومان بڕییە یەکتر و لە هەستی یەک تێگەیشتین و بەڵێنمان دا وەڕێکەوین و زۆریشمان نەمابوو بۆ لووتکە و بۆ ئەوە نەدەبوو کە بگەڕێینەوە. زۆر بەکورتی لە یەک وتەدا خێوەتگای تایبەتمان ئاگادار کردەوە و گوتمان کەپسوولی ئۆکسیژێنمان بەتاڵ بووە و ئێمە دەمانهەوێ بێ ئۆکسیژێن لووتکە ببەزێنین و ئەوانمان لە نیگەرانی ڕزگار کرد. بە هەناسەی خۆمان و بە هێز و توانامانەوە دەبوو وەسەر کەوین و نەدەبوو هیچیش بخەنە ئەستۆی ئێمە. ئەو کەسانەی لە خێوەتگای تایبەت بوون داوای ئێمەیان ڕەت نەکردەوە چونکە ویستی خۆمان بوو. بەو جۆرە کەپسوولەکانمان دانا و بەرەو لووتکە وەڕێ کەوتین. سەد میتری دیکە دەبوو وەسەر کەوین کە لە کاتی خۆشیدا چل و پێنج خولەک و لە سەختیدا کاتژمێرێکی دەخایاند. شوێنی هەنگاوەکانی هیلاریمان تێپەڕ کرد و نیزیک بە کاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ یانی دوای لووتکەی باشوور گەیشتینە سەر لووتکەی ئیوێرێست. پەیوەندیمان لەگەڵ خێوەتگای تایبەت گرت کە چاوەڕوانی ئێمە بوون کە بۆ ئاخر جار ئێمەیان لەسەر لووتکەی باشوور دیبوو و بەر لە وەڕێکەوتنمان نەیاندەزانی وەڕێکەوتووین

یان نا. کاتێک پەیوەندیم لەگەڵ گرتن و بەزاندنی لووتکەم ڕاگەیاند لە پشت بێسیمەکەوە گوێم بە شادی و خۆشی ئەوان کەوت، بەلام هەر تەنیا خۆشی و شادی ئەوان نەبوو، ئێمەش خەیاڵمان ئاسوودە بوو و تێگەیشتم کە پێم ناوەتە سەر بەرزترین لووتکەی جیهان. بیرم کردەوە و بە خۆم گوت وا باشە لە سەر بەرزترین لووتکەی دنیا بۆ چەند ساتێک بمێنمەوە. خۆم هاویشتە سەر کوڵێنگەکەم و بەباشی هەناسەم دەکێشا کە ئەو شێوەیە باشترین کارە بۆ هەناسە. کاری دووهەم دەرهێنانی دووربینی قورسی پراکتیکا بوو کە لە کۆڵەکەمدا بوو، دەرمهێنا و چەند وێنەم هەڵگرتەوە. ئالای گرووپی باسکی ئیسپانیا لە سەر لووتکە بوو کە سێ ڕۆژ پێش ئێمە بە ڕێگای تایبەتدا لووتکەیان بەزاندبوو. نیشانەی گرووپی بەرنامەی زستانی لیهستان کە لە لایان سیچی و ویلیسکی لەوێ داندرابوو، ئالای لیهستانیشم لە پشتی ئەو دانا و چەند بەردیشم لە دەوری چنی و بەو شێوەیە کارەکانمان بەڕێوە برد. ڕاستی ئەوەیە کە ئەگەر تێکۆشانی زۆر بۆ بەزاندنی ئەو لووتکەیە بەڕێوە چووبا، دەستبەرداری دەبووین. لووتکەکە بۆخۆی شتێکی ئەوتۆی نەبوو هەر و دەهات و وەڕەزی دەکردین و بەفر و پزووی لووتکەکان هەموو وەک یەک وابوون.

کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆ بەرەو خوار بووینەوە و زۆر ماندوو و شپرزە ببووین. بۆ هەر هەنگاو ٧ تا ٨ جار هەناسەمان دەکێشا. لە نێو مژدا بووم و هەمیشەش لە کۆتایی کارەکەمدا گرفت هەیە. سالانێک لەمەوبەریش لە کێبەرکێی ئەسبسواریدا بەشدار بووم کە بەر لەوەی بگەمە خاڵی دیاریکراو سەرم لەگێژەوە هات و لە سەر ئەسپەکە کەوتمە خوارێ. هەڵبەت لێرەدا کەمبوونی ئۆکسیژێن هۆکارەکەی بە جۆرێکی تر گۆڕیبوو. هەوا بەرەو تاریکبوون دەچوو گەیشتینە سەر لووتکەی باشوور بە جێپێکاندا دەهاتینە خوارێ تا خۆمان بگەیەنینەوە خێوەتەکەمان، بەلام لەو شوێنە بەفری تازە باریبوو و جێپێکانی پڕ کردبۆوە. بەو جۆرە دەبوو لە هۆش و توانای خۆمان کەلک وەرگرین. وامان بەباش زانی هێندێک ڕاوەستین تا مانگ هەڵێ چون بەو جۆرە نەبایە سەری تەنافە ڕایەڵکراوەکانمان بۆ نەدەدۆزراوە و لەو نێوانەشدا کەمێک دەحەساینەوە. لە شوێنێک ل ەسەر سەهۆڵ لاقم هەڵخلیسکا و کەوتمە نێو دالانێکەوە کە دوای چەند

میترێک توانیم خۆم بگرمەوە. هەر لەو شوێنە کە دەمهەویست بێمەوە سەرێ دەستم وەشتێک کەوت کە ئەوە بەختەوەرییەکی تایبەت بوو بۆم. تەنافەکە ڕاست لەو شوێنە بوو کە من دەمهەویست هەستمەوە سەرپێ و بەخۆشییەوە ڕێگای تەنافە ڕایەڵکراوەکانمان درێژە پێدا و کاتژمێر ٩ی شەو گەیشتینە خێوەتەکەمان. زۆرمان تینوو بوو بەڵام هەر لەو کاتەی کە دەمانهەویست بەفر بتوێنینەوە و کەمێک ئاو سازکەین، بەهۆی ماندوویەتی زۆر خەو هێرشی بۆ هێناین و خەومان لێکەوت. دوای تاوێک کە خەومان لێکەوتبوو لەپڕ لە خەو ڕاپەڕیم و هەستم بەوە کرد کە شتێک پاڵم پێوە دەنێ و قورسە لە سەرم. چاوەکانم هەڵێنا و تێگەیشتم کە دەگیر بایەکی توند کەوتووین.
هەناسەم بۆ نەدەکێشرا و زۆر ترسابووم. تێگەیشتم کە ئەوە هەر با نییە کە ئاوا پاڵمان پێوە دەنێ و دیارە ڕنوویە. ئاندرێش لە خەو هەستا و بەیەکەوە دەستمان کرد بە لێکۆڵینەوە لە سەر ڕووداوەکە. زۆر بەتوندی ترسابووم و دەبوو بەجۆرێک خۆمان لە نێو خێوەتەکە ڕزگار کەین و لە سەر بەفرەکان ڕادەوەستاین ئەگەرچی پێڵاوەکانمان لە بەردا نەبوو. لە دەروەی خێوەتەکە تێگەیشتین کە ئەو بەفرە زۆرەی کە لە سەرەوەی ئێمە کۆ ببۆوە خزابووە خوارێ و ڕنوویەک لە گۆڕێدا نەبوو، بەڵام هەرچی لە سەر ڕێگای بوو وەبن خۆی دابوو. شتێکم بەباشی لەبیرە کە ئەویش ئەوەیە کە ئەو شەوە ئیتر خەومان لێنەکەوتەوە و هیچ ماندوایەتیشمان نەحەساوە. لە هەموو کاتەکاندا ئەگەرچی شوێنیشمان دەگۆڕی و یەکمان لە نێو خێوەتدا بووین و یەکیشمان لە دەرەوە خێوەتەکەمان دەماڵی هەر دوایی نەدەهات. ئاخری ڕووناکی داهات بەڵام زۆر ماندوو بووین و چووینە نێو کیسەخەوەکانمانەوە. بەزاندنی لووتکە هێز و توانای لێبڕیبووین بەڵام زۆریشم بۆ گرینگ نەبوو پێڵاوەکانم دەبەر کرد ئەگەرچی لاقەکانم توانای ڕێگاڕۆیشتنیان نەبوو. لە خێوەتگای چوار ژۆگا و واڵک چاوەڕوانمان بوون و چای گەرمیان بۆ ساز کردبووین، زۆر بەئیشتیا خواردمانەوە، ٣٦ کاتژمێر بوو کە هیچ ئاوێکمان نەخواردبۆوە و وەک هیچنەدیوان دەمانخواردەوە و وردە وردە لە بێهێزی و سەرەگێژە ڕزگاریمان دەبوو. دوای تاوێک هێزمان هاتەوە بەر و بەرەو خێوەتگای تایبەت ڕێگامان درێژە پێدا. لەو شوێنە هەموو برایانی شاخەوان لە

باوەشیان گرتین و چاوەڕوانمان بوون کە هەستێکی تایبەتی هەبوو و دیار بوو ئێمە سەرکەوتوو بووین. خۆم وەک کەسێک هەست پێدەکرد کە دوای پازدە ڕاند لە نێو ڕینگدا دەیەوێ خۆڕاگرانە خۆی نیشان دا و ماندوویەتی وەبەر چاو نەیا. ئاندرێش هەر بەو جۆرە بوو و لە نێو ئەو هەموو پیرۆزبایی گوتن و هەستە تایبەتانەدا جۆرێک بوو کە ئێمە هێشتا هەستمان بە شتێکی ئەوتۆ نەدەکرد. شتێک کە لەپڕ هەموو ئەو خۆشییانەی لێ وەرگرتینەوە و دوای پازدە خولەک هەموو شتێکمان لێ ڕوون بۆوە. کاتێک ئاندرێ زاوادا تێگەیشت کە ئێمە کاتژمێر ١٠ی شەو گەیشتووینەتەوە خێوەتەکەمان، بەو جۆرە هەڵدەسەنگێنێ و دەڵێ کاتێک کە باشترین و بەهێزترین کەسانی گرووپەکە توانیویانە لە ماوەیەکی زۆردا لووتکە ببەزێنن، دیارە بۆ ئەوانی تر ماوەی زۆرتر لەوەمان پێویستە، بەو جۆرە کۆتایی بە بەرنامەکە هێنا و گوتی چالاکییەکانی دووهەم و سێهەم بۆ بەزاندنی لووتکە بەڕێوە ناچێ و کۆتایی بەرنامەکەشی ڕاگەیاند و ڕێگای گەڕانەوەی نیشان دا. ئەگەرچی لە تێکۆشانی بەزاندنی لووتکە زۆر ماندوو دەبی، بەلام هەرکەس بەجۆرێک بەئاواتی ئەوەیە بگەڕێتەوە ماڵێ، بەلام ئەوجار جیاواز بوو، زۆرێک لە باشترین ئاڵپینیستەکانی بەهێز لە مەڵبەندەکەدا بووین کە هەموومان دەمانهەویست بۆ لووتکەبەزاندن وەسەر کەوین کە گەڕاندنەوەی ئەوانە کارێکی زۆر هاسان نەبوو. وا دیار بوو کە من خۆم لە گێلی دابوو، بەلام ئەوان لەو بارەدا ئێمەیان بێتاوان نەدەزانی چونکە ئێمە کارەکەمان بەڕێوە بردبوو. دوای چەند ڕۆژی تر وەرزی با دەستی پێکرد و بەو جۆرە بۆ هیچ هەوڵدانێک نەدەبوو. بارینی بەفریش دەستی پێکردبوو کە ئەوەش ببوو بە هۆی ئەوە کە ئەوانیش ڕازی بن و لەوانەیە لە کۆتاییشدا ئەو جۆرەی هەڵسەنگێنن کە دەستووری ئاندرێ زاواداش دروست بووە.

لە فڕۆکەخانە هەواڵنێرەکان و میداڵە ئاڵتونەکان بۆ سەرکەوتنێکی گەورەی کە لە بارەی وەرزیشییەوە بە دەستمان هێنابوو چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد. بۆ یەکەمین جار لە ژیاندا تامی نێوبەدەرەییم دەچێشت کە وێنەی ئەو پاڵەوانەتییەشم لە یەکەمین ڕۆژی گەڕانەوەم بۆ شوێنی کارکردنمدا چاو پێکەوت. لە دەرەوە و لە بەر دەرگای هاتنە ژوور وەکوو قارەمانێک پێشوازییان لە من کرد.

بەڕێوەبەر و کارگێڕان هەموو لەوێ بوون و پارچەیەکی نووسراویشیان بە دەستەوە بوو کە نووسرابوو: «هاتنەوەی بەزێنەری لووتکەی ئێوێرێست بەخێر دێنینەوە». بەڵام هەر لەو بەڕێوەبەرایەتییەدا هەتا چەند مانگیش لەمەوبەر شوێنێکی تایبەتم نەبوو و هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە دڵی کەسم لێ نەڕەنجێ و کارەکەم لە دەست نەدەم. لەو دیو بۆ ئەو دیو بە دوای ئیمزاوە بووم تا بتوانم خەرجە نەدراوەکانم وەرگرمەوە. لە بەر دەرگای هاتنە ژوور هێندێک کەس ڕاوەستابوون کە چەند حەوتوو لەمەوبەر دەیانگوت ئیزندانی من دوو حەوتوو بووە، چۆن بە یەکێک مۆڵەت دەدەن کە دوو هەتا سێ مانگ ئیزن وەرگرێ، وا دیار بوو گۆڕابوون.

نابێ لە بیر بچێتەوە کە چەند مانگ دوای دووهەمین سەرکەوتنی گەورە لە هیمالییا یانی بەزاندنی ئێوێرێست لە زستاندا کە لە لایان سیچی و ویلیسکی بەڕێوە چووبوو، بەقەست پێشوازییان لێنەکرابوو، بەکورتی دوای ماوەیەک پێشوازییان لە کارەکەی ئێمە کرد. لە لایان هێندێک بە ناوی برایەتی کە لەوێدا گوترابوو ئەوجار گوێ ڕاگرە و شاخەوانی بەسە و دەست هەڵگرە، بەزاندنی ئێوێرێست لە زستاندا چکارت بەو کارانە داوە، هەموویان لە بیر خۆت بەرەوە، یانی شتێکی تر نییە کە لە بارەیدا قسە بکەی؟ هەر ئاواش بوو، ژوئییەی ١٩٨٠ بوو و زۆری بۆ مانگی ئووت نەمابوو کە لیخ والیسا بەڕێوەبەری دەستهەڵگرتوو، کارخانەی کەشتی سازی گرانیسکی بە ناوی بەدنیاهاتنێکی تر لە نێو کۆمەڵەی یەکێتی لێهستان وەئەستۆ گرت.



## بەشی ۴

**بووکەچینییە پنووکراوەکە**

**ماکالو سەرکەوتنی بەتەنیا. ڕدوەزەکانی باشووری ڕۆژئاوا سالی ۱۹۸۱**

کاتێک خەریکی برنامەی ئێونێریست بووم، بنکەی شاخەوانی من لە شاری کاتوویس سەرقالی ڕێکوپێک کردنی بەرنامەی زنجیرە کێوەکانی ئوسترالیا و نیووزیلەند بوون و بەلام لە سەرەتاوە بەڕێوەبردنی ئەو سەفەرە بەجێ نەهات٠ چونکە ئەو کەسانەی لە گرووپەکەدا بەشدار بوون توانای تکنیکی ئەوتۆیان نەبوو کە بتوانن لەو کێوە تکنیکییەدا بەباشی سەرکەوتووبن، بەڕێوەبەری گرووپەکە داوای لە من و ویلیسکی کرد بەشدارییان بکەین تا بتوانین ببینە یاریدەرێکی باش بۆ گرووپەکە٠ لە لای خۆم وام بیر کردەوە کە ئەگەر بۆ حەسانەوەش بێ، دوای بەرنامەکانی هیمالییا باشە بچم بۆ ئەو کێوە چکۆلە و تکنیکییانە کە زۆرم بۆ باش دەبێ٠ ویلیسکیش لەگەلم ڕێک کەوت و بەیەکەوە لەو سەفەرەدا بووین٠ دەبوو مانگی دیسامبری سالی ۱۹۸۰ وەڕێ کەوین، بەلام لە مانگی نۆوامبر و کاتێک کارەکان هەموو بەڕێوە چوون،

لەگەڵ گرفتێکی تازە ڕووبەڕوو بووینەوە و ئەویش ئەوە بوو کە ئاگادار کراینەوە کە هێندێک هاوڕێی نیوەڕێ لە نێو بەڕێوەبەرایەتیی فەرهەنگی وەرزیشی کە بەشی ماڵیی ئەو جۆرە بەرنامەیان ڕێک دەخست بۆ ئێمە ئاژاوەیەکیان نابۆوە و گوتبوویان ئەوانە پووڵەکان بێ هیچ کارێک بەفیڕۆ دەدەن و هەروەها گوتبوویان تا ئەو جێگایەی دەزانین نییوزیلەند لەوسەری دنیایە و هیچ کێوێکیشی لێ نییە· ئەو پارانەی کە بە کوێرەوەری و ئارەقڕشتن کە زۆرتریش بە هۆی خاوێنکردنەوەی دووکەڵکێشەکان بە دەست هاتبوون· بەو جۆرە ناچار بووین زۆرێک لە وێنەی کێو و ڕەوەزە ٣٠٠٠ مێترییەکانی نییوزیلەند بە دەست بێنین تا ئەوان ڕازی کەین· بەو جۆرە لە سەیرانگای نەتەوەیی خەڵکی نییوزیلند، لە چەند ڕێگای جۆراوجۆر لەسەر لووتکەکانی هۆنکۆک و مۆن دیکسۆن وەسەر کەوتین و لە دواییدا ڕەوەزێک کە دەکەوتە سەر بستووی ڕۆژئاوای «مۆنهیکس» بە لابەلاکەیدا تێپەڕ بووین و ڕێگایەکیشمان کە بە سەر ڕەوەزەکانی ڕۆژئاوای ماڵت بروون کردەوە· دوای بەڕێوەبردنی بەرنامەکانی مەڵبەندی کێوە شینەکانی ئوستڕالیا، لە ساڵی ١٩٨١، گەڕاینەوە لێهستان· وەرزی بەهار بوو کە ئاگادار بوومەوە ویتیک کورتیکا بەدوای یەکێکدا دەگەڕێ کە لەگەڵ ئەو لە گرووپی بەهاردا بۆ ماکالو وەڕێ کەون· ویتیک کێ بوو؟ زۆر باش، یەکێک لە شاخەوانانی بەناوبانگی مەڵبەندەکانی تاترا بوو کە بەرنامەی زۆر تایبەتی لە نۆرویژ بەڕێوە بردبوو و لە هیمالیاشدا تێکۆشابوو و ساڵی ١٩٨٠ لەگەڵ ویلژینیسکی، ئەلێکسیمەک، ئییەن تایەر و ڕەنێ گیلینی، لووتکەی دائۆلاگیریان بەزاندبوو· پێش ئەوەش ئێمە ڕێگای باکوری درووو و ڕێگای هێلێن لە گران‌جوورا‌سمان بەزاندبوو· بەر لەوەی بڕۆم بۆ نییوزیلەند، داوای لە من کردبوو بۆ ماکالۆ، بەڵام بەهۆی ئەوە کە باشیان بۆ ڕوون نەکردبوومەوە و بەرنامەکەیان بەتەواوی دەرنەخستبوو بۆ نیوزیلەند چووم· ئەوەی ڕاستی بێ ویتیک لەو شاخەوانانەیە کە زۆرتر دەیهەوێ لە بەرنامەی کورتدا بەشدار بێ و لە بەڕێوەبردنی بەرنامە کۆنەکانی گرووپی زۆر، ماندوو ببوو و کاری نێو گرووپە چکۆڵەکانی پێخۆشە· لە ڕاستیدا منیش هەر بەو جۆرە ڕازی بووم و پێم خۆش بوو· کاتێک لە نییوزیلەند گەڕامەوە لە ڕۆژنامەیەکی نیپاڵی کە لە لایان ویتیکەوە بە دەستم گەیی نوسرابوو

لەگەڵ ئەلێکس مک ئینتایەر و ڕینی و لۆدۆویک ویلژینیسکی تا بەرزایی ٦٧٠٠ میتری، بە ڕێگای ڕۆژئاوای ماکالۆدا وەسەر کەوتین، بەڵام پتر لەوە ڕێگامان نەبوو، بەڵام دەزانم کە دەتوانین بۆ ڕێگای باشووری لۆتسە بچین و هەروەها گوتبووی ئەمن هێندێکم پووڵ هەیە کە لە لای بنکەی کراکۆیە و هێندێکیش تۆ پێیەوە زیاد کە و وەرە بۆ کاتماندۆ. تێتڕادەبینم. «ویتیک».

مانگی مەی بوو و ناچار بووم گرووپەکە بەتەنیا وەڕێ بخەم. زۆر بەپەلە لە سەرەتاوە دەبوو لە بیری کۆکردنەوەی پارەدا بم. بۆ ئەوەی کە بمهەوێ دووکەلکێشێک خاوێن کەمەوە زۆر درەنگ بوو و مانگێکی دەخایاند کە بتوانم کارێکی ئاوا بدۆزمەوە و زۆرتر لەویشی پێویست بوو کە تەواوی کەم. دەبوو بەدوای کەسێکدا گەڕابام کە توانیبای یاریدەمان بدا.

لەوانەش بوو توانیبام پارەکە لە بنکەی شاخەوانی یان بنکەی مەڵبەندی کاکاتوویس قەرز کردبا کە بۆ لای دووهەمییەکە چووم. هەرکە لە دەرگای تایبەتم دا و چوومە ژوورێ، دوای وتوویژێک لەگەڵ بەڕێوەبەری تایبەت، توانیم بەڵێنییەکی لێوەرگرم. بێجگە لەوەش دوو سەد هەزار ئۆسلۆتی کە هی ویتیک بوو بەوەوە زیاد دەبوو کە دیار بوو پوولەکەی بۆ تەواو دەکردین. ڕۆژێک واریسکی لە کۆکردنەوەی کەلوپەلەکاندا یاریدەی دام و ئەوەی ڕاستی بێ بەتەواوی ئاگاداری کارەکان نەبووین کە چەندە پێشکەوتبوون، بێجگە لەوەش لە ساڵی ١٩٨١دا دووکانەکان هەموو بەتاڵ بوون و شتێکی ئەوتۆمان وەدەست نەدەکەوت بەجۆرێک کە مرۆڤ ناهومێد دەبوو.

دوو ساڵ لەمەوبەر لە بەڕێوەبردنی بەرنامەی لۆتسەدا لە هەموو شتێک باشترینەکانمان هەبوو، قوتووی گۆشت لە هەموو جۆرێک، بەڵام ئێستا شووشە مرەبایەکمان وەدەست نەدەکەوت. ئەوجار لەگەڵ هێندێک لە بنکە تایبەتەکان پەیوەندیمان گرت و لە کۆتاییدا ڕوون بۆوە کە ئەگەرچی دووکانەکان بەتاڵن، بەڵام ئەو جۆرەی کە بیرمان دەکردەوە، وەزعەکەش هێندە خراپ نەبوو. عەمبارەکانی گوومرگ لە زەوییەوە تا بەری میچی پڕ بوو لە خواردنی جۆراوجۆر. پرسیارم کرد و گوتم ئێرە بۆ ئاوایە؟ یەکێک لەوانە ناتوانی لە نێو دووکانەکاندا بەدەست بێنی؟ بەڕێوەبەری عەمبارەکە لە وڵامدا گوتی کە ئەوانە

دەوڵەت ڕایگرتوون تا بۆ ڕۆژی پێویست کەلکیان لێ وەرگرێ٠ لە هەموو شتێک سەیرتر ساردخانەکانی ڕاگرتنی خواردن بوو کە لە کاتوویس گۆشتە قوتووەکانی ڕادەگرت٠ هەرکە هاتمە دەر لە شوێنێک ئەوانەی لە دەرەوە چاویان بە شتەکان کەوتبوو، زۆر خێرا و تووڕە بۆ لای من دەهاتن و پرسیاریان دەکرد و دەیانگوت دەتەوێ ئەوانە بفرۆشی؟ ڕاستی ئەوانەت لەکوێ هێناوە؟ بیاندە بە ئێمە پارەی چاکت دەدەینێ٠ سەرەتا بیرم کردەوە کە بڕۆم بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە و شتەکان لەوێ بهاوێم و پێی پێوەنێم و بە تووندی بڕۆم٠ هەر ئەو کاتەی کە لە بیرکردنەوەدا بووم، خەڵکەکە هەر دەهات و زۆرتر دەهاتنە پێش، تا ئەوەی کە خۆم گەیاندە ئۆتۆمبیلەکە، دەتگوت لە کێو لە دەست ڕنوو ڕزگارم بوە، بەڵام ئەو تازە کۆتایی ڕووداوەکە نەبوو،دوایە کە ویستم کە ئەو شتانەی نێو ئۆتۆمبیلەکە بۆ عەمباری گرووپەکە بەرم، دووبارە ترسم لە خەڵکەکەی دەورووبەر هەبوو، کە وابوو ئەو شتانەی کە کڕیبوومن خستمنە نێو کۆڵەکە و ویستم هێندێک لە بەر چاوی ئەوان بیانشارمەوە٠ بەڵام لە نیوەشەودا یەکێک دەرگای عەمبار دەشکێنێ و دەچێتە ژوور و هەموو خواردنەکان لەگەڵ خۆی دەبا٠ تازە لە نێو خەڵکەکەدا ئاوا بڵاو ببۆوە کە کۆکۆشکا بازاری کەلوپەلی خواردنی کردووەتەوە٠ ئەوەی زۆر بۆ من سەیر بوو ئەوە بوو کە پۆلیسیان ئاگادار کردبۆوە بەڵام هیچ هەوڵێکیان بۆگرتنی من نەدا٠ ئەوجار بڕیارمان دا کە ئەو شتانەی کەدەیانکڕین لەوێ دایاننەخەین و یەکسەر بۆ کاتماندۆ بەڕێیان کەین٠

من و ڕۆزیک واریسکی بە فرۆکە بۆ بەمبەئی وەڕێ کەوتین و پێداویستییەکانیش بە قەتار بۆ هیند چوون و لەوێوەش بە بەلەمێکی چکۆڵە لە چۆمی گینگ پەڕاینەوە و لە کۆتاییدا بە بارهەڵگرێک خۆمان گەیاندە سنووری نیپاڵ کە ویتیک بەڵگەی پێویستی بۆ کەلوپەلەکان وەرگرتبوو و لەوێ چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد٠

لە کاتماندۆ چۆنیەتی گرووپەکە کەمێک گۆڕا و هۆکارەکەی ئەوە بوو کە ڕێنی گیلینی لە بەشداری لەگەڵ ئێمە پەشیمان بۆوە و تێلگڕافی ئەلێکسیش لە ئینگلیزەوە بوو بە هۆی ئەوە کە ئەویش لەبەر چۆنیەتی دۆخی ماڵی بپرینگێتەوە بەجێمان بێڵێ٠ بەو جۆرە چۆنیەتی گرووپی تێکەڵاوی وڵاتانی فەڕەنسە و ئینگلیز و لێهستان بوو

بە گرووپی کراکۆی کاتوویس٠ بەلام بۆ وەڕێ کەوتنمان بۆ کێوەکە پێویستمان بە پووڵ هەبوو کە بڕیار وابوو دوو کەسی تر دابینی کەن٠ چوار ڕۆژ تێپەڕ بوو کە تلگرافێکی تێری ئەلێکس لە ئینگلیزەوە هەواڵی کۆ کردنەوەی پووڵ و بەشداری لە گرووپەکەی پێڕاگەیاندین کە بوو بە هۆی ئەوە کە ئێمە پشوویەکی ترمان بێتەوە بەر و بەڵێن وابوو دوو هەزار دۆلار بێنێ٠ ویتیکیش لە گرووپی بەرنامەی بەهاری دووسەت دۆلاری بۆ مابۆوە٠ ئەوجار بڕیارمان دا بارەکان هەر هەتا خێوەتگای تایبەت بەرین بۆ ئەوەی کە لە ٢٥ کۆڵکێش زیاتر بەکرێ نەگرین٠ ڕێپێوانی ڕێگای لووتکەی ماکالۆ پڕ مەوداترین ڕێگایە کە بە نێو زنجیرە کێوەکاندا تێپەڕ دەبێ کە دوازدە ڕۆژ دەخایەنێ و ئێمە بە دە ڕۆژ تێپەڕمان کرد٠ ئەوەی لە ڕێگاکەدا پتر لە هەموو شتێک ئێمەی ماندوو کردبوو چۆنیەتی رووحی و دەروونی بوو کە ئازاری دەداین و ئەویش بە هۆی ئەفسەری هاوڕێمان بوو کە ڕەگەڵیان خستبووین٠ ئەو تازەلاوەی کە بە ناوی ئەفسەر ڕەگەڵ ئێمەیان خستبوو، نە لە کێودا هیچی دەزانی و نە لە بارەی چۆنیەتی جووڵانەوەی ئەفسەریدا هیچ فێر ببوو و بەو هۆیە کە داهاتی مانگانەی ئەفسەرێکی هاوڕێی گرووپەکان پێنج بەرابەری بەڕێوەبەرێکی نێو بەڕێوەبەرایەتییە کە قەڵەمی بە دەستەوەیە، دیار بوو پشتی گەرم بوو و ئەو پوستەیان دابوویە کە دەرامەدێکی باشی وەدەست کەوێ کە لە دوایەشدا بۆمان ڕوون بۆوە کەسێکی لە پشتە٠ هەر لەو نێوانەدا بەوە گەیشتین کە بەوجۆرە ناتوانین لەگەڵ ئەفسەری هاوڕێمان کە ناوی خاتکا بوو ڕێک کەوین٠ جارێک لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێکانی بۆ لای ئێمە هات کە ئەوی بە ناوی دۆستی نیزیکی خۆی بەمە ناساند کە وا دیار بوو ئەفسەری هاوڕێی گرووپی ئەمریکاییەکان بووە کە داوای لە ئێمە کرد لێی بپرسین ئەمریکاییەکان چەندەیان شت داوەتێ٠ ئێمە هەر چاویشمان لێنەکرد و گوێشمان نەدایە و تێشمان گەیاند کە کارمان بەو جۆرە کارانە نییە و خۆشمان وەک ئەمریکاییەکان چاو لێ نەدەکرد و گوتیشمان ئێمە سادە و فەقیرین، بەلام خاتکا نەیدەویست بیروڕای خۆی بگۆڕێ و دەستبەرداریشمان نەبوو٠ ئەوجار گوتی ئەگەر ئێوە ناتانهەوێ پرسیارم لێ بکەن بۆخۆم پێتان دەڵێم کە ئەوان بێجگە لە جلوبەرگی تایبەت و باش یەک ڕادیوی و نەواریان داومەتێ، ئەوانە بۆیە دەڵێم

بزانن کە بۆ باشتر کار بەڕێوە چوون دەستتان ئاواڵەتر دەبێتەوە. لە کاتێکدا کە ددانمان لەچیڕەوە بردبوو، وەلامی خۆمان داوە و گوتمان ئەگەر کارەکان بەباشی بەڕێوە چوون ئێمەش بیرێک دەکەینەوە و وەک دۆست خۆمان دەنوێنین. هەرکە زۆرتر دەڕۆیشتین، ناهەمواری و قسە ناخۆشەکانی خاتکا زۆرتر دەبوو. کاتێک ویستمان کەلوپەل و جلوبەرگەکانی کە لە سەر شانمان بوو بیدەینێ زۆر بە توندی خۆی نیشان‌دا و کێشەی ساز کرد کە ئەوە چ باڵتۆیەکە هیچ شتێکی پێوە دیار نییە. ئەو شتانەی کە دامانێ وەک گۆرەوی و باڵتۆ و شەڵواری گەرم، دەستی دانێ و چوو بۆ لای بنکەی بەڕێوەبەرایەتی تا شکایەتمان لێ بکا، بەلام هیچی بۆ نەکرا و ناچار بوو دەست هەڵگرێ و ڕازی بێ و بەڵگەی وەرگرتنی کەلوپەلەکان مۆر کا، ئێمەش ئاسوودە بووین و پشوویەکمان هاتەوە بەر. ئاخرین بەهانەیەکی کە پێی‌گرتین ئەوە بوو کە گوتی تا کاتێک لە کاتماندۆ بین دەبێ ڕۆژانە بە وتەی دوکتور بە هۆی چۆنیەتی لەشم بیرەیەک بخۆمەوە کە دەبێ لە لایەن گرووپەوە بۆم بکڕدرێ. بە بڕوای ئێمە ئەو داوایە کاری پیاوێکی زۆر تەواو نەبوو، هەر بۆیەش زۆر بە ئەسپایی بێ‌دەنگیمان لێکرد.

دەبوو بەجۆرێک مخاریجی خۆمان دەست پێوە گرتبا، کە لە ٢٢٠٠ دۆلار تێنەپەڕیبا هەر بۆیەش بیرەی ئەفسەری هاوڕێمان بۆ گرینگ نەبوو. هەر لەو کاتەدا ڕۆژنامەیەکی بولغاری چۆنیەتی گرووپی ئێمەی بە ناوی گرووپی کۆکەرەوەی ٢٢٠٠ دۆلاری هێنابوو و ویستبوویان سووکایەتی بە کاری ئێمە بکەن، چونکە بۆ ئەوان جێی باوەڕ نەبوو کە گرووپێک بەو پارە کەمە و بێ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ کەس بگرێ، بۆ هیمالییا بچێ. لە نیزیک کێوەکەش خەرجێکی ئەوتۆمان نەبوو، بەلام یەک دوو جار بەهۆی ئەوە کە کەمێک خواردنەکانمان باشتر بکەین هێندێکمان سەوزی و تەرە گڕی بۆ ئەوەی کە نیازەکانی لەشیمان دابین بکەین و بەو جۆرە خواردنی تەواو بۆ هەر کەسێکمان بە پێنج ڕووپییە کڕی و ئەگەرچی خاتکا داوای بیرەی ٣٠ ڕووپییەیی دەکرد زۆر بەتووندی ڕەتمان کردەوە. وا دیار بوو کە هێدی ببۆوە و هەر دەهات و دەستبەردارتر دەبوو، بەلام لە دواییدا گرفتی بۆ زیاتر کردین و لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە لە نێو کۆڵکێشەکاندا ئاژاوە بنێتەوە و ئێمە لەگەڵ ئەوان ڕووبەڕوو بکا، بەلام نەیدەزانی کە ئەوە ئەو بوو کە بۆ یەکەم

جار ڕێی دەکەوتە بەرزاییەکان و ئێمە لە سەر چۆنیەتی کۆڵکێشەکان و یاسای نێوخۆیان ئاگاداری تەواومان هەیە. کاتێک بۆ یەکەم جار چاوی بە لووتکە کەوت، چاوەکانی زەق بوو و تێیڕاما و هەموو شتێکی لە بیر چۆوە و بە زووترین کات داوای جلوبەرگی گەرمی بەرزاییەکان و پارەی زیادی بۆ کۆڵکێشەکان کرد، بەڵام هێشتا ئێمە لە داوێنی کێوەکە و لە سەرەتای کارەکەدا بووین و داوەکەیمان نەسەلماند.

لە کۆتاییدا گەیشتینە خێوەتگای تایبەت و لە بەرزایی ٥٤٠٠ میتری خاتکا وەها حاڵی تێک چووبوو کە بە تەواوی ڕۆژی سێهەم بۆ خواردنی نانی بەیانی لە خێوەتەکەی نەهاتە دەر.

کاتێک بانگمان هێشت، لە خێوەتەکەی هاتە دەر و لەو کاتەدا چاوی تاریک بوون و سەری دەگێژەوە دەچوو. لێم پرسی ئەوە چی بووە؟ گوتی دوێشەو زۆر سارد بوو ڕشامەوە. هەناسەی دەکێشا و هەوای تازەی هەڵدەمژی، دیاربوو هەموو کون و کەلێنەکانی خێوەتەکەی گرتبوو و دووکەڵی شەمیش بە تەواوی نێو خێوەتەکە دووکەڵاوی کردبوو. ئەگەرچی کوڵوکۆی هەستابوو دەیگوت نەخۆشم و ئێرە بۆ ژیان کردن نابێ و خێوەتگای تایبەت دەبێ بەرینە خوارتر. بەو جۆرە وەڵامم داوە و گوتم ئەگەر دەتهەوێ بڕۆی بڕۆ کە ئەگەر بڕۆی کارێکی باش دەکەی و ئێمەش ڕاحەت دەبین. خێوەتێک و هێندێک خواردنمان بۆ گەڕانەوە بۆ دانا. زۆرم پێخۆش بوو شەپێکی تێهەڵدەم و بەڕێی کەمە خوارێ، بەڵام تووڕەیی خۆم ڕاگرت و هیچم نەگوت.

بە بەزاندنی لووتکەیەکی ٦٠٠٠ میتری لە لای ڕاستی خێوەتگای تایبەت، ویستمان خۆمان بە کەشوهەوای مەڵبەندەکە ڕابێنین. لە گەڕانەوەدا تێگەیشتین کە ئیتر بە تەنیا نین و گرووپێکی ئۆتریشی خێوەتەکانیان لە تەنیشت خێوەتەکانی ئێمە هەڵداوە. ئێمە بۆ دەستپێکی کارمان هیچ پەلەمان نەبوو و دەمانهەویست هەر لە نێو مەڵبەندەکەدا خۆمان ڕابێنین و کارەکەمان لە بەرزاییەکاندا هاسانتر کەینەوە. دوای چەند ڕۆژ هەوڵمان دا و ڕێگای تایبەتی لووتکەی ماکالومان بۆ باشتر خووگرتن بە کەشوهەوای کێوەکە هەڵبژارد کە هەتا چۆکان دەکەوتینە نێو بەفرەکەوە و ترسیشمان لە ڕنوو زۆر بوو. لە کۆتاییدا دوای چەند ڕۆژ تێکۆشان خۆمان گەیاندە بەرزایی ٧٨٠٠ میتری و لە کاتێکی زۆر ئەستەمدا گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت.

ئەوجار تێگەیشتم کە میوانمان بۆهاتووە، ڕینهۆڵد میسنێر و داگ ئیسکات بۆ چاوپێکەوتن هاتبوونە خێوەتەکەمان. ئەوانیش لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە خۆیان لەگەڵ کەشوهەواکە ڕابێنن و لە هەوڵی کارێکی گەورەشدا بوون و دەیانهەویست بە لای باشووری ڕۆژهەڵاتدا وەسەر کەون و بە لای باکووردا بێنەوە خوارێ. بە شێوەی شاخەوانی بە چایی کۆرەکەمان بۆ ڕازاندنەوە. لە کەنارێک دانیشتبووم و گوێم دابووە ئەفسانەی شاخەوانییەکانی ئەوان. ویتیک بەباشی ناسرابوو و ڕێزێکی تایبەتی لە هیمالییادا هەبوو و زۆر جار لەو بەرزاییانە لەگەڵ میسنێر ڕووبەڕوو ببۆوە. داگ ئیسکاتیش دەیناسی و جارێک لەگەڵ گرووپێکی ئینگلیزی لە هیندۆکۆش بەرنامەیەکیان بەڕێوە بردبوو. کاتێک ویتیک و ئەلیکس لەگەڵ میوانەکان خەریک بوون، من خۆم بە چێشتلێنانەوە خەریک کردبوو و زۆرتر هەوڵم دەدا کە کۆرەکە بپارێزم و بەتایبەت کە لە عەنباری کلووپەکەمان زۆر بەدوای چراقەوەکەی برای میسنێردا گەڕابووم و نەمدیتبۆوە کە لە ژێر لووتکەی نانگاپاربات دۆزیبوومەوە و ئەگەر زانیبام ئەو چراقەوەیە ئەوەندە تایبەتە و دنیایەک بیرەوەری بنەماڵەی میسنێری پێوەیە، زۆر بەتایبەت لە ماڵی خۆمدا دەمپاراست و ڕامدەگرت، بەلام ئیتر زۆر درەنگ بوو. دوای چاخواردنەوە ماڵئاواییان لە ئێمە کرد و ڕۆیشتن.

دوای حەسانەوەیەک خۆمان سازدا بۆ وەسەرکەوتن بە ڕێگای ڕۆژئاوادا. کەلوپەلە پێداویستیەکانمان بۆ ئەو ڕێگایە لێک جیا کردەوە بەو ڕادەیەی کە تەناف و بزمارمان نیاز بوو کە ویتیک و ئەلیکس لە بەرنامەی پێشوویاندا لەو ڕێگایە ڕوونیان کردبۆوە کە چەندەمان پێویستە و بەو جۆرە چۆنیەتی دابەشکردنی بارەکانیان وەئەستۆ گرت و کۆڵەکانیان بە پرێسکەی ٢٠ هەتا ٢٥ کیلۆیی جێبەجێ کرد. خۆاردنیشمان بۆ شەش ڕۆژ پێچایەوە و واشمان دەزانی کە بەرنامەکەمان لە

شەش ڕۆژ پتری پێناچێ و وەڕێ کەوتین. خێوەتگای یەکەممان ڕاست لە ژێر ڕەوەزەکانی ڕێگای ڕۆژئاوا هەڵدا. ئیستا دەمانتوانی بەباشی لەو بەرزاییەدا خواردن بخۆین، بەتایبەت بە گوشتی زۆرەوە. ئەوەم بە پێکەنینەوە نووسی چونکە لەو دواییانەدا ویتیک چووبووە نێو ڕیزی گیاخۆرەکان، بەلام لە دواییدا تێگەیشتبوو کە لە بەرزاییەکانی

هیمالیادا بێ گۆشت ژیان نابێ و لە نامەکەیدا بۆی نووسیبووم کە لە لێهستانڕا گۆشتی ڕان و سۆسیسی زۆر لەگەڵ خۆم بێنم. لەوە بەدوا ئیتر خێوەتمان پێنەبوو، بەڵکوو هەر ڕووپۆشێکی سێکەسەمان دەست دابوویە. هەر لە سەرەتای کارەکەوە لەگەڵ سەختی ڕووبەڕوو بووینەوە و هەمووی ڕۆژەکە لە ژێر سێبەردا کارمان دەکرد، تەنیا لە ئێواریدا بۆ جارێک تاو لێیدابن و بەو جۆرە ڕۆژێکی ساردمان تێپەڕ کرد.

بەیانی ڕۆژی دوایی لە خەو هەستاین. لەو ڕۆژە ساردەدا کە لە ئەشکەنجە خراپتر بوو، بە پێویستمان زانی کە لە بەر تاوی گەرمدا کەلوپەلەکان کۆکەینەوە باشە. بەو شێوەیە دیار بوو کە ڕێگای ڕۆژئاوای ماکالۆ بۆ گاڵتە نابێ و دەبێ وشیار بین. خۆحەشاردانی یەکەممان لە نێو دالانێک و لە ژێر ڕەوەزە بەردێکدا بوو. هێشتا هەر لە سێبەرەکەدا بووین و سەرماش برستی لێبڕیبووین، بەلام زۆر شتی تر تێیدا دەبیندرا، وەک بارینی بەفر و گرینگتریش لەو، بای توندی ڕێگای باشووری ڕۆژهەلات بوو. ئۆتریشییەکان بە ڕێگای تایبەتدا وەسەر دەکەوتن و لە دەست بای توند ئازاریان دەدی و ناڕازی بوون کە ئێمە ئەو بایەمان هەر بە لاشدا نەهاتبوو و کەشوهەواش زۆر تایبەت بوو. هێندێک لە ڕێگاکە کە ڕژدێکی سەهۆلاوی بوو کۆتایی هات و گەیشتە بەردەلانێکی سەخت. زۆر جاریش دەبوو زۆر شوێنی سەهۆڵەکە بێ کەرەسەی خۆڕاگرتن تێپەڕ کەین. بەهۆی توند ڕۆیشتنمان مۆهڵەتی ئەوەمان نەبوو کە تەنافەکان لە کۆڵەکە دەربێنین و تەنیا کەلکمان لە کرانپۆن و کوڵێنگ وەردەگرت لە ڕێگا ڕۆیشتندا. ویتیک هێندێک لە ڕێگاکە کە زۆر ئەستەم بوو تێپەڕی کرد و ئێمەش بەدوای ئەودا وەسەر کەوتین. کۆتایی ئەو ڕێگایە هەمووی هەر سەهۆڵ بوو کە بەفری تازەشی بە سەردا باریبوو، هەر بەو هۆیەش لە بەهاردا گرووپەکە لەو شوێنە نەیانتوانیبوو دەرچن و برستیان لێبڕابوو، بەلام بە خۆشییەوە ئەوجار نەمانهێشت زۆر وەدرەنگی کەوێ و زۆر زوو بە نووکی کرانپۆنەکان پێیدا تێپەڕ بووین و خۆمان گەیاندە بەرزایی ٧٦٠٠ میتری و دوای ئەویش گەیشتینە ٧٨٠٠ میتری. سەختیی ڕێگاکە لێرەوە دەستی پێدەکرد، ٥٠٠ میتر ڕەوەزە بەرد لە سەر سەرمان بوو کە ٣٠٠ میتری ئەو ڕەوەزە زۆر سەخت و ڕاست ببۆوە. ویتیک زۆری

لێ ڕوون بوو کە دەتوانین بە دالانەکانی لای ڕاستدا کە دەبیندران وەسەر کەوین، بەلام گەرچی پێم باش نەبوو بەلام لێم سەلماند. بەیانی ڕۆژی دوایی ئەلیکس دەستبەکار بوو و هەر لە سەرەتای کار ڕێگاکە بە سەختی دەهاتە بەر چاو و لەو بزمار بۆ ئەو بزمار هەلداوەسرا و ڕێگای تریشمان پێ شک نەدەهات. تا کۆتایی ڕۆژەکە هەر ٣٠ میتر وەسەر کەوتین و وامان بە سەر هاتبوو کە نەماندەتوانی بلێین ورە بەرنادەین. بەو جۆرە ئەگەر ئێمە ڕۆژی دواییش هەر ٢٠ میتر وەسەر کەوتباین هیچ نەدەگۆڕا دوو ڕۆژ لە کاتی دیاریکراومان دەما و خواردنیشمان بۆ درێژەدان بە ڕێگا تەواو دەبوو. لەو کاتەدا هەمیشە وێنەیەک بەرچاوە کە دەنگی هیچ کەس نایە، بەلام ئێمە هەر چاومان لە یەک دەکرد و چاوەڕوانی ئەوە بووین یەکێک بلێ بەسە و دەست هەلگرن و بڕۆنە خوارێ. ئەو ڕووداوەش ڕووی دا و کاتێک ئەلیکس لە سەر ڕەوەزەکە کاری دەکرد، ویتیک بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی من سەرکەوتنێک نابینم، ئێمە ناتوانین بەو ڕێگایەدا وەسەر کەوین، تەنانەت ئەگەر سەد میتری دیش وەسەر کەوین هێشتا زۆرمان دەمێنێ بۆ لووتکە. کەمێکمان لە بارەی ڕێگاکەدا قسە کرد و گوتمان لەوانەیە لە پێشتر ڕێگاکە هاسان بێتەوە، بەلام کێ دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە ئەوێ کە ئاسانترە، نەماندەزانی! منیش هەولم دا کە شتێک بلێم، هەر شتێک بێ گوتم ئێمە هێشتا بەشی ڕۆژێکی ترمان خواردن پێماوە و واباشە ڕێگاکە بگۆڕین و بە ڕێگایەکی تردا وەسەر کەوین، مۆلەتمان بدەن ١٥ میتری تر وەسەر کەوین لەوانەیە بگەینە شوێنێکی هاسان. دەمتوانی لە ڕوخساری ویتیکڕا تێبگەم کە ڕازی نەبوو. بۆ من هەمیشە لە سەرکەوتندا گەڕانەوە بە هۆی تێکشکان زۆر سەخت بوو، بەلام هەر کاتێک کارەکان بە ئارامی بەرەو پێش بچن ویتیک دەلێ بەسە دەست هەلگرن بابگەڕێینەوە. بەو جۆرە هیچی تری وەدوا نەکەوتین. کەمێک لە خۆم تووڕە بووم و دەمهەویست ئەوە بە خۆم بسەلمێنم و خۆم بەوە قانع کەم کە ئەوە من نەبووم کە دەستم لە کارەکە کێشاوە، بەلکوو هاوتەنافەکانم بوون کە ڕێگایەکیان بۆ من نەهێشتەوە. بەلام ئەو جۆرە ئاکارانە لە زۆر شوێندا دەبێ بە هۆی وەدیهاتنی پەرێشانی بیر و خەیالان و ئازاردانی بەدواوەیە، ناچار تەسلیم بووم. هەرکە ئەلیکس بەرەوخوار بۆوە، من و ویتکیش کەلوپەلەکانمان کۆ دەکردەوە، پێم

گوتن گوێتان لێبێ ئێمە لە نێو کاری ڕەوەزەکەدا دۆڕاندمان بەڵام نابێ لە بەرامبەر ئەو کێوەدا بدۆڕێنین و ئێمە هێشتا بەختەوەرین کە لووتکە ببەزێنین. قسەکەی من بە بێدەنگییەکی سارد پێشوازی لێ کرا. هەر سێکمان گەیشتینە شوێنی مانەوەی شەوی پێشوومان. هەنگاو هەڵێنانەوەم بە ڕێگای گەڕانەوەدا زۆر پێ سەخت بوو و هاتنە خواری وەک وەسەرکەوتن بۆ سەخت کردبووم. بەو جۆرە بە تێپەڕکردنی شوێنە سەختەکان توانیمان ڕۆژی دوایی خۆمان بگەیەنینە خێوەتگای تایبەت. حاڵمان باش نەبوو. ئۆتریشییەکانیش بەهۆی بای سارد و سەخڵەتی گەڕابوونەوە و تێکەلاوی ئێمە ببوون. ئەلیکس ڕۆژێکی تەواو خەریک بوو کەلوپەلەکانی کۆدەکردەوە، گوتی ئەوەی ڕاستی بێ زۆرم کات لێرە لە دەست داوە، کاتێک بگەڕێمەوە ئینگلیز کارم زۆرە کە دەبێ بەڕێوەیان بەرم، بەوجۆرە ئەگەر ڕاستیتان بوێ بەختێک بۆ لووتکە بەزاندن نابینم. ئۆتریشییەکانیش بڕیاریان دا کە ڕێگای ماڵ بگرنە بەر و کۆیان کردەوە و چاوەڕوانی کۆڵکێشەکان مانەوە. هەواڵمان پێگەیشت کە ڕینهۆڵد و داگیش لە ڕێگای گەڕانەوەی کاتماندۆدان. بڕیار وابوو کۆڵکێشەکانی ئێمە حەوتوویەک دواتر بێن. غەم و پەژارە ئێمەی ئازار دەدا. حەوت ڕۆژ چاوەڕوان بووین کۆڵکێشەکان بێن. چاوێکم لە سەرەوە کرد، ئەو شوێنەی کە هاشەی با گوێی کەڕ دەکردی، نەمدەویست ئەوە بسەلمێنم کە بێ دەسکەوت و بێ بەزاندنی لووتکە دەگەڕێمەوە. هێندێک بە دەوری خۆمدا هاتم و چووم و داوام لە ویتێک کرد کە دووبارە با هەوڵێک بدەین و ئەوجار بە ڕێگایەکی خۆشتردا بەرەو لووتکە وەسەر کەوین. ویتێک هەر لە سەر بڕوای خۆی بوو، ئەو لەو دەستە شاخەوانانەیە کە زۆرتر لە سەر شتی تایبەت دەکۆڵێتەوە و وازی لەسەر ڕێگای باگر نییە و گۆڕانی بیر و بڕواش زۆر کارێکی هاسان نییە، بەڵام من دەستبەرداری نەبووم و گوتم هەر جارێکی تر هەوڵ دەدەین و لەوانەیە سێ یان چوار ڕۆژمان پێبچێ و هەواش مۆڵەتمان بدا، بەڵام ویتێک هەر لە سەر قسەی خۆی بوو و گوتی نابینی هەموو لە دەست با دەگەڕێنەوە؟ بێجگە لەوەش لاقەکانی من کەمێک سەرما بردوویەتی و ئەوەی ڕاستی بێ بەختێک نابینم کە لووتکە ببەزێنین. لە دوایی‌دا لەپڕ شتێکم گوت کە لە ڕاستیدا بێ هیچ بیرلێ کردنەوەیەک بوو و گوتم دەبێ هێندێک بۆخۆم هەوڵ

بدەم. بە سەرسوورمانەوە کەمێک چوو دەفکرەوە و وەڵامی داوە، گوتی ئەگەر دەزانی و لە خۆت ڕادەبینی هەوڵی خۆت بدە، ئەوە ئێوەن هەوڵ دەدەن بەڵام ئەمن بەختێک بۆ بەزاندن نابینم، برۆ بەڵام لە کێودا یاسا و داواکارییەک نییە کە دەست و لاقمان ببەستن، ئەگەر دەتهەوێ برۆ و هەر شتێکیش کە پێویستە لە کەلوپەلەکانی من دەست دەیە. گوتم زۆر سپاس دەبێ لێکۆڵینەوەیەک لە سەر هەموو شتێک بکەم، بڕیارێکی کەم نەبوو. سەرەتاکەی بە ترسێکەوە دەست پێدەکرا، ترسێکی نامۆ. ترس لەوە کە بۆ شتێک دەچووم کە بەتەواوی دەبوو لە سەر خۆم حیساب کردبا، ئەوەشم دەزانی کە سەرکەوتن کاتێک بە دەست دێ کە لە هەموو بوارێکەوە بەباشی بیرم لێکردبێتەوە، من لە سەرەتاوە کۆڵەکەی خۆم پێچابۆوە. چاوێکم لە عاسمان کرد و گۆڕانێکم لە کەشوهەواکەدا بەدینەکرد و بەڵێنم دا ورە بەرنەدەم و دەستبەردار نەبم. گوتم بەیانی وەڕێ دەکەوم ڕاشکاوانە ڕامگەیاند، بەڵام کاتێک بەیانی ڕۆژی دوایی چاوم هەڵێنا حاڵم زۆر باش نەبوو. دوای خواردنی نانی بەیانی نیزیک کاتژمێر ١٠ برێک باشتر بووم. بەو جۆرە لە کاتێکی دیاری نەکراو لە دەوروبەری نیوەڕۆدا وەڕێ کەوتم. لە لای خۆم وام بیر کردەوە گوتم کە دەچمە ژێر ڕەوەزەکە و لەوێ خۆم حەشار دەدەم تا بزانم ڕۆژی دوایی هەوا چۆن دەبێ، ئەگەر هەوا باش نەبوو دەگەڕێمەوە و ئەگەریش باش بوو درێژە بە ڕێگا دەدەم. کاتێک گەیشتمە ژێر ڕەوەزەکە کاتژمێر ٣ی دوای نیوەڕۆ بوو و زۆرم مۆڵەت هەبوو. وام پێ باش بوو هێندێک لە سەرتر شەو تێپەڕ کەم. ئەوجار لە لای خۆم بیرم کردەوە کە دەبێ لە لای ڕاستی ڕێگای تایبەت شوێنێکی بۆ خۆحەشاردان لێبێ.

لە ڕێگایەکی دووروودرێژ و هەڵدێری پڕ لە بەفر هەتا تاریکانی ئێوارە وەسەر کەوتم. بەفرەکە بەستەڵەک بوو بەڕاحەتی بە سەریدا تێپەڕ بووم. بەو شێوەیە زۆر وەپێش کەوتبووم، بەڵام بەداخەوە شوێنێکم بۆ مانەوە نەدۆزییەوە. مانگ بە جوانی دەدرەوشاوە و منیش هەتا یازدەی شەو و گەیشتن بە شوێنێکی پڕ بەفر و پان و بەرین ڕێگای خۆم درێژە پێدا. کەمێک ئەولاتری ئەو شوێنەی کە من لێی بووم، دیاربوو ڕێگای تایبەتی بەزاندنی لووتکە بوو کە بۆ شوێنی خێوەتگا کەلکی لێ وەردەگیرا. بایەکی زۆر توندی دەهات کە نەمدەتوانی کیسەی

خۆحەشاردانم لێک بڵاو کەمەوە و دوو کاتژمێر لەگەڵی بەربەرەکانێم کرد و ئاخری دەستبەرداری بووم· لە نیوەشەودا بوو کە لە بەر ڕووناکی مانگدا چاوم بە شتێک کەوت کە لە ژێر بەفر هاتبووە دەرێ و تێگەیشتم کە ئەوە خێوەتێکە کە لە ژێر بەفردا ماوەتەوە· بەفرەکانم لە سەر لابرد و لای دەرگا دڕاوەکەیم کردەوە· بۆ من بەس بوو کە تا بەیانی خۆم حەشار دەم· هەرچۆنێک بێ لە دەست با و سەرما ڕزگارم بوو· کاتێک هەوا ڕووناک بوو، چاوم بە خێوەتەکە کەوت و بۆم ڕوون نەبوو کە چ ماوەیەکە ئەو خێوەتە لێرەیە· کەشوهەوا بە جۆرێک بوو کە نەمدەتوانی وەڕێ کەوم و بەو جۆرە کەمێکی تر خەوتم· کاتێک لە خەو هەستام کاتژمێر یازدەی بەیانی بوو· لە لای خۆم بیرم کردەوە کە هێشتا بۆ چوونە خوار کاتم هەیە، کەوابوو چاییم وەسەر نا· کاتی نیوەڕۆ بوو کە لە خێوەتە چکۆلەکەم هاتمە دەرێ چاوم لێکرد و دیتم دوای خواردنەوەی چای گەرم دنیا زۆر جوانتر خۆی دەنوێنێ،

ئاسمان شین بوو بەڵام هێشتا بای دەهات· لە نیزیک لووتکە پەڵەهەورێکی چکۆڵەم دەدی کە نازانم نیشانەی خۆشبوونی هەوا بوو یان خراپبوونی و هێشتا هەستم بە بەختەوەری دەکرد· وا بزانم زۆرم بیر لێ دەکردەوە، بەڵام هەستم ئەوەی بە من دەگوت کە بای توند کۆتایی پێدێ· ئەو جار کۆڵەم هاویشتە سەر پشت و کرانپۆنەکانم لەبەر کرد و کوڵینگم دەست دایە و هەر دەهاتم و دەچووم و بیرم دەکردەوە کە بڕۆمە خوارێ یا بچمە سەرێ؟ لەپڕ بە مێشکمدا هات کە بڕۆمە سەرێ و ڕووم لە ڕێگای بستووی ماکالۆلا کرد لە بەرزایی ٧٤١٠ میتری کە لە کاتی خۆڕاهێنان بە کەشوهەوا خێوەتێکمان لەوێ بە جێ هێشتبوو· خێوەتێکی ڕێکوپێک دوێنێ شەو پێی سەڵماندم کە کیسەی خۆحەشاردان بۆ ئەو شوێنە نابێ·

هەرکە گەیشتمە ماکالۆلا، بێ ئەوەی کە کات لە دەست بدەم چوومە نێو خێوەتەکەمەوە و هەوڵم دا بە تەواوی بحەسێمەوە و هەورەکانیشم بۆ گرینگ نەبوو· بەیانی کە لە خەو هەستام دیتم هەورەکان هەموو لە خوارێ بوون و باشی نەدەهات· خێوەتەکەم بە ڕێکوپێکی کۆکردەوە و کیسەکەی کە خۆم تێدا حەشار دەدا لە کەنارێک دانا و پێم نا سەر ڕێگای ڕەوەزەکانی باکوری ڕۆژئاوا· لە پێش خۆمەوە چ شتێک چاوەڕوانی دەکردم؟ نازانم، بەڵام هەر دەزانم هەستم بەوە دەکرد کە لە بەرزایی

هەشت هەزار میتریدا بەفری دەشتێکم شێلاوە· خێوەتەکەم تێدا هەڵدا و ئەوجار هەموو شتێک دەگەڕاوە سەر چۆنیەتی کەشوهەوای بەیانی· بای دەهات هەرچەند وەک ڕۆژانی پێشوو نەبوو بەلام هێشتا بەرگری لە هەڵدانی خێوەتەکەی من دەکرد· هەر کاری چکۆڵەم بەڕێوە دەبرد، ئەو کارانەی کە بە چاو دەبیندران و کەسیش نەبوو یاریدەم بدا· بەو جۆرە لە دەست ئەو تاڵییەش رزگارم بوو و چوومە نێو خێوەتەکەوە و چایەکم وەسەرنا بەلام زۆریشم بەدڵ نەبوو و تازە لە دواییدا تێگەیشتم کە چاییم بۆ دوو کەس ساز کردووە نەک یەک کەس· زۆر بەتایبەت هەستم بەوە دەکرد کە کەسێکی تریشم لەگەڵە کە حەزدەکەم لەگەڵی قسە بکەم· ئەوەندە ماندوو بووم کە پێش ئەوەی بزانم چایەکە بۆ دوو کەسە یان کەسێک، خەوم لێ کەوت·

ڕۆژی دوایی کاتژمێر هەشتی بەیانی بە تەنافێکی دە میتر و دووربینێکی وێنەگر وەڕێکەوتم و سێ بزمار و دوو پێچی سەهۆڵیشم دەگەڵ خۆم برد· ئەورۆ یان دەبا لووتکەم بەزاندبا یان گەڕابامەوە و لەوە بەختەوەرتر نەبووم· بەداخەوە هەرکە گەیشتمە بەرزایی بەفرەکە زۆرتر بوو و لەوانەش بوو ڕنوو بێ کە بەو جۆرە لێی تێکدام· ئاخری گەیشتمە سەر بستووەکە و تووشی ڕەوەزە بەردێک بووم· بیرم دەکردەوە بەلای ڕاست یان چەپدا وەسەر کەوم· وام لێ ڕوون بۆوە کە لای چەپ زۆر ڕاست بوو و وەسەر کەوتنی زۆر سەخت بوو و نەدەکرا و ئەستەمیی ڕەوەزەکە نیشانەی ٤ تا ٥ی هەبوو و بێ تەناف دەترسام· ئەوجار هەوڵم دا لە شێوەی خۆڕاگرتن کەلک وەرگرم· بزمارێکم لە بەردەکە داکوتا و سەری تەنافەکەم لێ گرێ دا و سەرەکەی تریشم لەخۆم بەست· هەرکە گەیشتمە کۆتایی تەنافەکە بزمارێکی ترم داکوتا و سەری تەنافەکەم لێ گرێ دا و بە ڕێگاکەدا گەڕامەوە و سەری تەنافەکەم کردەوە و دووبارە وەسەر کەوتمەوە و بەو شێوەیە ڕەوەزەکەم تێپەڕ کرد· وا باشە ئەوەش بڵێم کە ئەگەر تەنافەکە بڕێک قوڵەتر با نەمدەتوانی وەسەر کەوم· لەسەر ڕەوەزەکە ئەوەندە بە ڕێگادا ڕۆیشتبووم کە هەر دەهات و هاسانتر دەبۆوە· قەڵشەسەهۆڵی چکۆڵە لە ڕێگادا دەبیندران بەلام هەر دەهات و لە لووتکە نیزیکتر دەبوومەوە· لێرەدا شتێکە کە دەبێ بیڵێم، لە دەوروبەری کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ لە ئاسمان ئەستێرەی زۆرم

لەسەر خۆم دەدی کە دەدرەوشانەوە، باوەڕم نەدەکرد، چاوم لێک نا و دووبارە کردمەوە، ڕوانیم کە هێشتا هەر لە جێگای خۆیانن، دووبارە چاوم قووچاند و گوتم لەوانەیە بەفر یان شتێک لە سەر چاوم بێ، کە چاوم لێککردەوە هەر لەوێ بوون، سەریشم وە هیچ نەکەوتبوو و بەرزاییش هۆشی لێ نەبڕیبووم، ئەدی دەبێ چ بێ؟ دوایە وەبیرم هاتەوە کە شاخەوانێکی فەڕەنسی بە ناوی لانیاترای، لە فیلمێکی کە بە ناوی ئەستێرەکان لە نیوەڕۆدا هەڵیگرتبۆوە ئاماژەی بەو وێنەیە کردبوو و ئەوانی دیبوو. دەهات و درەنگ دەبوو و لێکۆڵینەوە لە سەر ئەو خاڵە دەبووە هۆی ئەوە کە لە لووتکە بەزاندن وەدوا کەوم. بەڵام هەبوونی خێوەتەکەی خوارێ ترسەکەی لێستاندم و درێژەم بە ڕێگا دا و دەوروبەری چوارونیوی دوای نیوەڕۆ شتێکی ترم لە سەر ڕێگا لێ سەوز بوو کە زۆر سەخت نەبوو و دیار بوو کە ئاخرێکەی بوو. دانیشم و هێندێک حەسامەوە و دیسان وەرێ کەوتم. دوای چەند هەنگاوی تر دەگەیشتمە لووتکە و کاتێک گەیشتمێ خۆشترین و پڕماناترین بەڵگە بوو کە لە ژیاندا بە دەستم دێنا. لە سەر لووتکە دوو بزمارم دۆزییەوە کە هیممەتی گرووپەکانی پێشتر بوو کە یەکێک لە بزمارەکانی خۆشم پێوە زیاد کرد. لە نێو کۆڵەکەمدا بووکەچینییەکی نایلۆنیم دەرهێنا بە ناوی بەختەوەری لە نێو کەلوپەلەکانی کوڕە چکۆلە یەک ساڵەکەم ماسیک، دەست دابۆیە، ئەویشم بەوانەوە زیادر کرد. وێنەیەکم لە ئاڵای شاخەوانیەکەمان کە بە سەر کۆڵینگەکەوە بوو هەڵگرت و بەرەو خوار بوومەوە. بای توند لە سەر ڕەوەزەکە دەستی پێکردبوو و منیش لەو نێوانەدا درێژەم بە ڕێگای خۆم دەدا. کاتێک گەیشتمە نێو ئەو ڕەوەزە بەردە کە پێیدا وەسەر کەوتبووم، وەبەر شەوێ کەوتم. مانگەشەو بوو بەلام مانگ بەتەواوی نەهاتبووە دەر. بۆ منیش زۆر گرینگ نەبوو کە بەو شوێنەی کە پێیدا هاتبوومە سەرێ بڕۆمەوە خوار. بەو جۆرە لە نێوەڕاست بەردەکەدا قەڵشتێکم دۆزییەوە و ئاخرین بزماریشم لەوێ داکوتا و تەنافەکەم لێ گرێدا و پێیدا هاتمە خوارێ. تەنافەکە نەگەیشتە سەر زەوی و بە هۆی تاریکی نەمدەتوانی کۆتایی تەنافەکە ببینم.

دوای چەند خولەک مانگ لە نێو هەورەکان هاتە دەرێ و ڕێگاکەی بۆ دیاری کردم و لە کۆتاییدا دوای تێپەڕ کردنی سەختییەکانی ڕێگاکە خۆم گەیاندە شوێنی خێوەتەکە. ڕۆژی دوایەش ئەگەرچی زۆر ماندوو

بووم، بەهۆی خۆشحاڵی زۆر بە زووترین کات بەرەو خوار بوومەوە و ڕێگاکەم درێژە پێدا. دەوروبەری کاتژمێر ٥ی دوای نیوەڕۆ ویتیکم چاو پێکەوت کە بە دوای مندا دەگەڕا. لێی پرسیم باشە چۆن بوو؟ گوتم من لووتکەم بەزاند. کەمێک سەری سووڕ مابوو و دوای تاوێک پیرۆزبایی پێ گوتم و گوتی ئەوەی ڕاستی بێ بڕوام نەدەکرد بتوانی لووتکە ببەزێنی. خێوەتگای تایبەت بەتەواوی چۆڵ ببوو، ئەلیکس ڕۆیشتبوو، ڕینهۆڵد و داگیش زۆر لەمێژ بوو ئەوێیان بەجێ هێشتبوو و هەر ئۆتریشییەکان لەوێ مابوونەوە کە چاوەڕوانی کۆڵکێشەکانیان بوون. ئەوانیش سەریان لەو کارەی من سووڕ مابوو. دوکتۆرەکەی گرووپیان خوێنی لەمن گرت و دوای خوێن گرتن و لێکۆڵینەوەکە سەری ڕاوەشاند و گوتی خوێنت زۆر خەستە و وەک هەڵووچەی ویشک ئاوی لەشت تەواو بووە. ئەوجار وێنەشیان لە من هەڵگرتبۆوە کە هەر وای نیشان دەدا. ڕەنگم زەرد و چرچ ببوو. بەو جۆرە ماکاڵۆ نرخی خۆی وەرگرتبوو کە ئێمەی بەو وێنەیە نیشان دەدا. بەڵام ئەو شێوەیەکە لە کێوەکاندا دەبێ چاوەروان بکرێ. ئۆتریشییەکان بۆ خواردنی چێشت بانگهێشتیان کردم بەڵام من هەر لە هەوڵی خواردنەوەی ئاوەکی وەک سووپ ،چا، ئاو تەڕە و شتی ئاوادا بووم. لە نێو غەڵەبای خێوەتەکەمان بیرێک ئازاری دەدام و ئەویش ئەوە بوو کە کێوێکی گەورەم بەزاندبوو و ژمارەی هەشت هەزارییەکانیشم دەبووە سێ دانە و من تەنیا لیهستانییەک بووم کە ئەو کارەم بەڕێوە بردبوو. هەستێکی تایبەتم هەبوو و گەرمای ئەو هەستە سەرتاپای لەشمی داگرتبوو. لە کاتماندۆ خاتکا چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد کە بگەڕێینەوە و حەقی خۆی لە ئێمە وەرگرێ کە ئێمە نەماندابوویە. لەپڕ وەک ئەوەی بۆ منداڵێک قسە بکەی پێمان دەگوت بایی پێنج ڕۆژ پوڵ و خواردنت بۆ گەڕانەوە هەتا نیزیکترین گوند لێ وەرگرتین و دوایەش حەوت ڕۆژ بۆ گەڕانەوەت بۆ کاتماندۆمان پێدای، بەڵام گوێی نەدەداینێ و نەیدەویست بەڵگەکەمان بۆ مۆر کا و زۆرتر چاوی لەوە بوو شتێکی بدەینێ. هیچ ڕێی نەمابوو و چووین بۆ شوێنی گەشتوگوزار و شێوەی جوولانەوەی خاتکامان بەوان ڕاگەیاند. بەڕێوەبەرانی بنکەکە زۆر بە هێمنی گوێیان بۆ قسەکانی ئێمە ڕاگرت و حەقیان بە ئێمە دا و لە کۆتاییدا پێمانیان ڕاگەیاند کە فلووسێکیشی نەدەینێ. ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە پووڵمان هەبوو بیدەینێ، بەڵام کاتێک

بنکەی بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزار ئاوای بە ئێمە گوت و بۆ ئێمە تەواو جێگای سەرسووڕمان بوو. ڕۆژی دوایی هەر ئەو کابرایە زۆر بە سەیری بە دوای ئێمەوە بوو و دەیهەویست شتێکی گرینگ بە ئێمە بڵێ، گوتی بەڕێزان من وام پێباشە کە ئەو پوولەی بدەنێ، ئەو لە بنەماڵەیەکی ساماندار و بەهێزە و لەوانەیە بۆ ئێمە ببێتە هۆی دەردەسەر. بەو جۆرە ئێمە هەموو پوولەکەمان دا بە خاتکا.

دوای چەند ڕۆژ هەواڵنێرێکی نیپالی هات بۆ لای ئێمە و بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ بانگێشتی کردین و زۆری پێخۆش بوو کە بیر و بڕوای ئێمە لە سەفەرەکەدا هەڵسەنگێنێ. بەو جۆرە پرسیاری لێکردم و گوتی ئایا کەسێک بە ناوی خاتکا دەناسی؟ گوتم بەداخەوە ئەفسەری هاوڕێی ئێمە بوو. پرسیم بۆچی؟

گوتی ئەو هاتە بەڕێوەبەرایەتی ئێمە و داوای لێکردین کە نووسراوەیەکی زۆر بەهێزی بۆ بە چاپ بگەیەنین و لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە بەزاندنی لووتکەکە ڕاست نییە و ئێوە نەگەیشتوونە لووتکەکە. کابرای ڕووبەڕووم وای نیشان دەدا کە قسەکانی خاتکا گاڵتە بووە، بەلام زۆر وشیارانە سەرنجی دەخستە بەرهەڵەستەکانی ئێمە و گوتیشی نووسراوەیەکیشی داوە بە بنکەی بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزار، بەلام نووسراوەکانی توند و ناحەز وا باشە لە نێو ڕۆژنامەکاندا نەنووسرێ چونکە هەواڵنێرەکان زۆر لەوە باشتر دەڕواننە هیمالییا تا کەسێکی وەک خاتکا هەرچی پێی خۆش بێ بینووسێ بەلام هەر ئەو نووسراوەیەی کە کەوتووەتە دەست بنکەی گەشتوگوزار باش نییە. فەرموون بەڕێز چۆن بوو؟ ئایە ئێوە لووتکەتان بەزاند یان نا؟ بەو جۆرە هەموو شتێک ڕاگیرابوو و وا دیاربوو بەزاندنی لووتکە لە لایەن منەوە هات بۆ ژێر پرسیار و نەیاندەویست بیسەلمێنن. زۆر گرینگ نییە بۆ بیرکردنەوە نابێ و زۆر بە ئەسپایی ڕامگەیاند. گوتی لەوەی کە لە سەر لووتکە بووی یان نەبووی زۆر گرینگ نییە، بەلام باشتر ئەوەیە کە بۆخۆتان بیسەلمێنن کە لەوێ نەبوون. لێرە ئیتر بەتەواوی تێکچووم و گوتم ئەمن لووتکەم بۆ ئەوە نەبەزاندووە کە بۆ ئێوە یان کەسێکی تری ڕوون کەمەوە و زۆریش بۆ من گرینگ نییە کە ئێوە چۆن بیر دەکەنەوە، من پێشتر هەموو شتێکم ڕاگەیاندووە و شتێکی زیادیم نەهێشتۆتەوە تەنانەت وشەیەکش و هەمووم گوتوە و لەوەی

که ئێوه باوه‌ڕ ده‌که‌ن یان نا خۆتان ده‌زانن و به‌وه کۆتاییم پێهێنا. به‌وجۆره به‌ڵگه ته‌واو بوو و ئه‌و جار ئێمه ده‌مانتوانی بگه‌ڕێینه‌وه بۆ ماڵێ. به‌ڵام به‌زاندنی لووتکه بۆ من به هۆی قسه‌کانی خاتکا چووه ژێر هه‌وره‌کانه‌وه.

ساڵێک دوای ئه‌و ڕووداوه ڕۆژێک که له سه‌ر کار ده‌گه‌ڕامه‌وه چوومه زگ سندووقی نامه و له‌وێدا نامه‌یه‌کم چاو پێکه‌وت که بۆم ئاشنا نه‌بوو. کردمه‌وه و دیتم چه‌ند خه‌تێکی به زمانی ئینگلیزی نه زۆر باش له سه‌ر نووسرابوو و گوتبووی کۆکۆشکای به‌ڕێز:

به‌زاندنی لووتکه‌ی ماکالۆی ساڵی ڕابردووت پیرۆزبایی پێده‌ڵێین. من زۆر به‌ئیشتیاوه نووسراوه‌ی تۆم دووپاته کردووه. من یه‌کێک له به‌شداربوانی گرووپی ساڵی ١٩٨٢م. ئێمه له سه‌ر لووتکه‌یه‌ک له‌تکه بووکه چینییه‌کی چکۆڵه‌مان دۆزییه‌وه که وێنه‌ی کیسه‌ڵێکی به خۆوه گرتبوو به ڕه‌نگی ڕه‌ش که خاڵی سووری له سه‌ر پشتی ده‌بیندرا.

هه‌ر له‌وێش ئێمه کارابینێکمان به‌جێ هێشت. ـ کارابین که‌ره‌سه‌یه‌کی شاخه‌وانییه بۆ خۆڕاگرتن که‌لکی لێ وه‌رده‌گیرێ. خاتوو هاولی به منی ڕاگه‌یاند که ئه‌وه هی گرووپی ئێوه‌یه و به‌و هۆیه‌وه من ئه‌و نامه‌یه‌م بۆ نووسیوی و داواتان لێده‌که‌م به نیشانه‌ی بنکه‌ی ئێمه وه‌ڵامی نامه‌که‌ت بنێره‌وه. برای خۆت و چکۆڵه‌ت ، هۆیۆنگ هۆ.

به هۆی ئه‌وه که دۆستی کۆریایی ئێمه، بووکه‌چینییه‌که‌ی به ناوی کیسه‌ڵ ناو هێنابوو زۆرم بیر لێ نه‌کرده‌وه و جارێکی تر نامه‌که‌م خوێنده‌وه و چوومه نێو دیوی کوڕه چکۆڵه‌که‌م ماسیک. من ساڵێک له‌مه‌وبه‌ر پینه‌دۆزی ئه‌وم ده‌ست دابوویه بێ ئه‌وه‌ی که ئیزنیشی لێ بخوازم.



## بەشی ٥

**کۆکۆشکا و ١٤ لووتکەی ٨٠٠٠ میتری**
**ئەو کێوەی بە دزی بەزێندرا**
**برۆدپیک لای رۆژئاوا ١٩٨٢**

بە پێکهێنانی یاساکانی شەڕ لە دیسامبری ساڵی ١٩٨١. ئێمە لێهستانییەکان بەتەواوی وردمان بەردابوو و هەموو شتێک تێکچووبوو؛ هیچ کەس نەیدەزانی چی ڕوودەدا؛ هەموو شوێنێک داخرابوو و لە کاریش هیچ هەواڵێک نەبوو؛ وا دیار بوو دەبوو لە سەرەتاوە دەست پێبکەین و دەست لە سەر دەست دانان کەلکێکی نەبوو و مان وەک بەندکراوێک دەهاتە بەر چاو؛ دەرگای بنکەی شاخەوانیش داخرابوو و لە هیچ لایەک هەوڵی بۆ نەدەدرا؛ دەتگوت لە قەفەز کراوین و لە هەوڵی ئەوەدا بووین چی بکەین؛ ئەوەش هەر من نەبووم کە ئاوا بیرم دەکردەوە، بەڵکوو لێکرا ئەو پرسیاردیان لە خۆیان دەکرد؛ ئاخری دەرگای ئەو بەندیخانەش کرایەوە و وردە وردە تێکۆشان بۆ دەرەوەی وڵات دەستی پێکردەوە و ئێمەش بە هەر جۆرێک بێ لەو کاتەدا

بەشداری بەڕێوەبەرایەتی شاخەوانیی لێهستان بووین. بەو شێوەیە من و ویتیک بەڵێنمان دا بە هەر شێوەیەک بێ لە چۆنییەتی گێرەوکێشەی نێوخۆی ولات چاوپۆشی بکەین و لە هەوڵی گرووپێکدا بین کە ڕێگای لووتکەبەزاندنی خۆمان درێژە پێبدەین. لەو کاتەدا، ویندا ڕۆتکیویچ، بەڕێوەبەرایەتی گرووپێک لە ژنانی ولاتی بۆ لووتکەی $K_2$ وەئەستۆ گرتبوو. لەوانە بوو بتوانین خۆمان ڕەگەڵ گرووپی ئەوان خەین بێ ئەوەی لە بواری مالی یان بەڕێوەبەرایەتی لەگەڵیان بەشدار بین. ئاواتی ئێمە بەزاندنی دووکەسی بوو هەروەک ئەو کارەی لە لووتکەی ماکالو بەڕێوەمان بردبوو. هەوڵ و تێکۆشانی ژنان مێژوویەکی زۆر و پێشینەیەکی ئەوتۆی کۆن و دوورودرێژی نەبوو، بەڵکوو هەر ویندا بوو کە هەنگاوی بۆ ئەو کارە هەڵێنابۆوە و بیروباوەڕی وا بوو کە ژنان بۆخۆیان کار بکەن و هەمیشە لەگەڵ پیاوان نەبن، بەو شێوەیەی کە ئەوان نەیاندەویست توانای خۆیان لەگەڵ پیاوان بەرابەر بکەن. لەوانەش بوو بیروباوەڕی ویندا بیروباوەڕێکی تایبەت بە تێکۆشانی وەرزیشی بێ، چونکە هەتا ئەو جێگایەی ئاگادار بووم لەمێژ بوو لە نێو یاریی تۆپیدەستیدا تێدەکۆشا و بەو جۆرە منیش چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە ئەویش ژن و پیاو لە بواری تواناییەوە لێک جیا کاتەوە.

لە ساڵی ١٩٧٥دا بەڕێوەبەرایەتی گرووپێکی بۆ لووتکەی گاشەربرۆمی ٣ لە پاکستان وەئەستۆ گرتبوو کە ئەگەرچی هەمووی گرووپەکە ژن بوون زۆریان لێ ڕازی نەبوون. چون گرووپێکی پیاوانی لێهستانیش لە نیزیک ئەوانەوە کاریان دەکرد، وا بزانم پتر بەو هۆیەوە بوو کە دەیهەویست گرووپێکی ژنان لە ولاتدا بەهێز بکا، بەلام کاری گرووپی یەکەم هەر ژنان بۆخۆیان ڕێکیان دەخست. ژنەکان لە بەرنامەی لووتکەی گاشەربرۆمی ٣ بە بەرزایی ٧٩٥٢ میتر و ڕێگایەکی تازە لەسەر گاشەربرۆمی ٢، لە کارە تایبەتییەکانی ئەوان بوون. ڕۆتکیویچ، ئالیسۆن چادویک و ئەنۆچکیویچ کەسانێک بوون کە گرووپی گاشەربرۆمی ٣یان ڕێکخستبوو و لە لووتکەی گاشەربرۆمی ٢ ، بە سێ گرووپی دووکەسە دابەش و بەشدار بوون کە هالینا کرۆگێر و سیرۆکۆمسکا و ئانا ئەکۆپینکا بەزینەرانی لووتکە بوون. لە دواییدا خاتوو بۆتۆ هاوسەری سەرۆکوەزیری پاکستان، وەکوو ڕێزلێنان ڕێورەسمێکی لەگەڵ ویندا بۆ گرووپەکە سازدا تا ورەی ژنان لە بەرابەر

پیاواندا ڕابگرێ. بێجگە لە گرووپی ژنان و هەمووجۆرە مەسەلەیەک، یانۆژ کۆژراب بوو کە بەنیاز بووین هەوڵ بدەین لەگەڵی بڕۆین بۆ K۲، بەڵام ئەو لە سەرەتاوە گرووپی خۆی کۆ کردبۆوە و ڕێکی خستبوو و داوای من و ویتیکیشی بە شێوەی ئالپی لێنەدەسەلماندین و هیچ کات حەزی نەدەکرد کە ئێمە لە گرووپی ئەودا بەشدار بین و کاری خۆمان بەڕێوە بەرین و کاری تەنیا و دیاریکراوی خۆمان هەبێ. ئەوجار ویستمان لەگەڵ ویندا قسە بکەین. من هیچ ناسیاوییەکم لەگەڵ ویندا نەبوو، بەڵام ویتیک لەو بنکەیە کاری دەکرد کە ویندا لەوێ بوو و نێوانێکی باشیشیان بەیەکەوە هەبوو. ویندا داوای ویتیکی سەلماند کە ئێمە لە پەنا گرووپی ئەوانەوە کارەکانی خۆمان دەست پێبکەین و ئەوەش نیشانەی بیروباوەڕی ئاواڵەی ئەو ژنە بوو. بەڵام بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی کاروباری سەفەرەکە بەئەستۆی خۆمانەوە بوو کە لە هەموو بوارێک پێداویستیەکانمان دابین بکەین.

بەڵام تەنیا شتێک لە لایەن ئێمەوە نەدرا و بەڕێوە نەچوو و بەشدار نەبووین، وەرگرتنی بەڵگەی پێویستی K۲ بوو کە لە لایەن بەرپرسانی پاکستان ئێمە وەکوو هەواڵنێر و وێنەهەڵگر بەشدار بووین.

هالینا کرۆگێر کە لە هەوڵی سەفەری دووروودرێژی ڕێگای قەرەقرووممدا بوو کە ڕێگایەکی خاکی و لە زۆر جێگاش توشی ڕژد و هەڵەمووتی زۆر سەخت لە جادەکەدا دەبوو، ئێمەی هاوڕێیی دەکرد. بارەکانمان ڕێکوپێک و هەمووومان لە نێو ئۆتۆمبیلێکی بارهەڵگردا تاقەت کردبوو. لەو قسانەی کە لە ڕێگا لە نێوانماندا کرا، تێگەیشتم کە ویندا ساڵی پێشوو لە ڕەوەزەکانی کێوی ئەلبرووسی سەد میتر هەڵدێردراوە و لاقی شکاوە و لەوێ بۆ نەخۆشخانەیەکیان بردووە و لەو نەخۆشخانەیە تێدەگا کە ئەو دەیانەوێ لاقی بێ هێچ هەوڵدانێک بۆ تیمار کەن، بەڵام ویندا لەوێ ڕادەکا و دەگەڕێتەوە بۆ لیهستان تا زۆر بە باشی تیمار کرێ و چارەسەری بکا کە لە کۆتاییدا بۆ چابوونەوەی دەچێ بۆ وڵاتی ئۆتریش. ڕۆژانێکی زۆر بە هۆی ئەو ڕووداوە لە سەر جێ دەکەوێ، بەڵام ئێستا بە لاقی ساغەوە لەگەڵ گرووپەکە تێدەکۆشێ لە خێوەتگای تایبەتی K۲ سێ گرووپی لێبوو کە لە لیهستانەوە هاتبوون. گرووپی ژنان کە دەیانهەویست بە ڕێگای تایبەتی باشووری ڕۆژهەڵاتدا و بە سەر لاشانی ئەبروزیدا وەسەر کەون کە ئەگەر سەرکەوتوو بان،

بۆ ژنان دەبوو بە دووهەمین لووتکەی بەرزی جیهان کە لێی وەسەر دەکەوتن. یانۆژ کۆرژاب کە چەند کەسی لە وڵاتی میکزیکیش لەگەڵ بوون، خێوەتگای تایبەتی خۆیان ڕێگای ڕۆژئێک لە ئێمە دوورتر هەڵدابوو. ئەوان دەیانهەویست بە ڕێیەکی تازە و بە لای ڕەوەزەکانی باشووری ڕۆژئاوادا وەسەر کەون. لێژیک سیچی و کرۆژیک ویلیسکی و ویتیک وێرژ و ئالیک لوو بەشداربووانی گرووپەکە بوون و من و ویتیکیش گرووپی ئاخر بووین. لەوەی کە ویتیک چەند ساڵ لەمەوبەر بۆ K٢ هاتبوو و شارەزایی لە مەڵبەندەکە هەبوو، گوتی وا باشە ئێمە بە ڕێگای ڕۆژهەلاتدا بچینە سەر کە وەسەرکەوتن بەو ڕژد و هەڵەمووتانەی زۆر بەباشی دەزانی و ویستی منیش ڕێگای تازە لە سەر لای باشوور بوو. دیتنی لووتکە بۆ یەکەم جار خۆشیەکی تایبەتی بۆ شاخەوان هەیە، بەتایبەت لەو شوێنەی کە دوو سەهۆڵی گەورە تێکەلاو دەبنەوە و یەکتر لەت دەکەن. لەو شوێنەڕا دەتوانی بەباشی ڕێگای باشووری کێوەکە ببینی کە سەرتاپای مەڵبەندەکە وەبەر چاو دەخا. من بۆ یەکەم جار بوو دەهاتمە K٢ و سێبەری کێوەکە ترسێکی سامناکی خستبووە دەروونمەوە کە تا درەنگانێک لە دەستی ڕزگاریم نەدەهات. ئەوجار لەو بیرەدا بووین کە چ ڕووداوێک دێتە پێش و سەرکەوتوو دەبن یان نا؟ لە بارەی K٢ ناتوانی بە جۆرێک بیر بکەیەوە بەڵکوو دەبێ لە هەموو جۆرە ڕووداوێک کە لەو کێوە سامناکەدا وەدی هاتووە بیر بکەیەوە و هەڵیسەنگێنی. لەو کێوە سەرسوڕهێن و سامناکە هەر گۆڕانی چۆنییەتی کەشوهەوا نییە کە تێیدا وەدی دێ، بەڵکوو لە ڕێگادا تووشی ڕژد و هەڵەمووتی وەها دەبێ کە سەرت سووڕ دەمێنێ و ڕووداوی دڵتەزێن لەو کێوەدا پتر لە هەموو کێوەکانە. لەوە پێش سەدان جار وێنەی کێوەکەم چاو پێکەوتبوو، بەلام ئەو جار بەڕاستی ڕووبەڕووی ڕاوەستابووم. بۆ ڕێگای باشوور کە ویتیک لە هەوڵێدا بوو، ئەگەر ویستبامان لە سەر ئەو ڕێگایە تێبکۆشین دەبوو لووتکەکە دەور لێدەینەوە، بەلام من ئەوەی ڕاستی بێ، دایم چاوم لە ڕێگای لای باشووری لووتکەکە بوو کە زۆر جوان و بەقەلافەت خۆی دەنواند و ئەو خاڵەم زۆر بۆ گرینگ بوو کە وەک ژنێک لە سەرەتای جوانیدا سەرنجی پیاوێک بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و لە دواییدا زۆربەی شتەکانی تر وەدی دێن. بەلام ئەوە هەر ڕێگای ڕۆژهەلات بوو کە بۆ ویتیک زۆر

گرینگ بوو و سالانێک بوو بیری لێدەکردەوە. خێوەتەکانی ئێمە و گرووپی ژنان لێک جیا بوو بەڵام چێشتخانەیەکی تێکەڵاومان هەبوو. لە ڕاستیدا بیرکردنەوە لە چێشتخانەی جیا، بیرێکی باش نەبوو، هەڵبەت چێشتکەریی ژنەکان خەراب نەبوو و دەیانزانی قاب و کەچکان بشۆن و برینج لێنێن.

لە سەر ئەو بڕوایە بووین کە بۆ خۆسازگارکردن لەگەڵ کەش‌وهەوای مەڵبەندەکە هێندێک لە ڕێگای تایبەت بڕۆینە سەرێ کە ئەو شێوەیە بە دڵی ژنەکان نەبوو، چونکە ئەوان دەیانهەویست لەو ڕێگایە وەسەر کەون و ئەو هەوڵەی ئێمە لەوانە بوو کارەکەی ئەوان کەمێک چکۆڵە بێنێتە بەر چاو. لەو نێوەدا ئەکۆ پینیسکا بە قسەکانی زۆر بەباشی ئێمەی تێگەیاند و گوتی لە سەر ڕێگای ئەبرووزی بۆ ئێوە جێگا نییە و دەبێ ئەوەشتان لەبیر بێ کە ئەو گرووپە گرووپی ژنانە. ئەوجار ئێمە ناچار بووین ڕێگای تایبەتی لووتکەی بڕۆدپیک بۆ خۆ سازگارکردن لەگەڵ کەش‌وهەوا هەڵبژێرین و بەڵگەی پێویستی کێوەکەشمان ئاوا بوو کە دەمانتوانی، چونکە دەبوو لە دەوروبەری کێوی $K_2$ وێنە هەڵگرینەوە. دوای چوار ڕۆژ مانەوە لە خێوەتگای تایبەت تا بەرزایی ٦٤٠٠ میتری بڕۆدپیک وەسەر کەوتین و لەوێ شوێنێکمان دیاری کرد و زۆربەی کەل‌وپەلی پێداویستمان لەوێ دانا و دووبارە گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت. بڕیارمان دا ڕۆژانی دوایی تا ئەو جێگایەی بتوانین بچینە سەرێ تا باشتر لەگەڵ کەش‌وهەوا خۆمان سازگار کەین و بتوانین خاڵی دیاریکراومان یانی لووتکەی $K_2$ ببەزێنین. دووبارە هەتا شوێنی دیاری کراو وەسەر کەوتینەوە یانی بەرزایی میتر ٦٤٠٠ و شەو لەوێ ماینەوە و ڕۆژی دوایی تا بەرزایی ٧٣٠٠ میتری چووینە سەرێ و خێوەتێکی ترمان لەوێ هەڵدا. ڕۆژی دوایی بێ ئەوەی بیر لە بەزاندنی لووتکە بکەینەوە، ڕێگای سەرێمان گرت و وەڕێ کەوتین کە ڕاست لە ژێر بستووەکە و لە بەرزایی ٧٨٠٠ میتریدا هەستم بە خنکان دەکرد و برستم لێبڕابوو و لەوێ تێگەیشتم کە بە باشی لەگەڵ کەش‌وهەوای مەڵبەندەکە ڕانەهاتووم. ویتیک بە هێزی دەروونی بەباشی کاری دەکرد و بە توندی دەڕۆیشت و دیتی کە من چلۆن وەزعێکم هەیە. هەرکە گەیشتە سەر بستووەکە لێی پرسیم دەی حاڵ و ئەحواڵت چۆنە؟ گوتم زۆر باش نیم و وام پێ باشە

بگەڕێمەوە. گوتی خەجاڵەتی بکێشە زۆرمان نەماوە بۆ لووتکە، ئەمن ئەوە دەڕۆمە سەرێ. گوتم زۆر باشە برۆ. دانیشتبووم و ویتیکم دەدی کە هەر دەهات و لە من دوور دەکەوتەوە تا ئەوەی کە خۆی گەیاندە سەر ڕەوەزەکە. دڵم بەخۆم دەسووتا، وابزانم باشترین کار ئەوە بوو کە لەگەڵ ئەو بێهێزیەم بەربەرەکانی بکەم و تا ئەو جێگایەی بتوانم وەسەر کەوم. هەرکە وەڕێکەوتم ئەو هەستەم لە خۆمدا بەدی کرد، ئیتر ڕاوەستانم تا لووتکەیەکی ٨٠٤٧ میتری کارێکی هاسان نەبوو و لێرەوە ڕێگاکە زۆر هاسان ببۆوە و لووتکە وەک مقناتیس ئێمەی بەخۆیەوە گرتبوو و ئیتر بەربەرەکانییەکی ئەوتۆی نەدەویست. هەر دەڕۆیشتمە پێشێ لەپڕ تێگەیشتم کە هێزێکی زۆری لێوەرگرتووم، دە میتر دەڕۆیشتم دووبارە بۆ حەسانەوە ڕادەوەستام، بەلام لەسەر بەفر دانەدەنیشتم و پتر خۆم داویشتە سەر کۆڵینگەکەم. زۆر جار وامدەزانی لووتکە ٩٠٠٠ میتر بەرزایی هەیە. نیو کاتژمێری مابوو بۆ لووتکە گەیشتمە ویتیک کە لە گەڕانەوەدا بوو و زۆر درەنگ بوو، زۆر بەئەسپایی گوتی وا باشە بگەڕێیەوە. گوتم نا زۆرم نەماوە زۆر نیزیک بوومەتەوە، بە هەر شێوەیەک بێ خۆم دەگەیەنمەوە، تۆ برۆ خوارێ و کەترییەکە وەسەرنێ. ئەوە هەر بیروباوەری قایمم بوو کە لە لووتکەی نیزیک دەکردمەوە و هیچی تر. بەباشی تێگەیشتبووم کە دوازدە ڕۆژ بۆ خۆسازدان لەگەڵ کەشوهەوای ئەوێ زۆرکەم بوو بۆم. لە سەر لووتکە تەنیا وێنەیەکم لە کۆڵینگەکەم و مانگ گرت و بە هەڵگرتنەوەی وێنەیەکی تر لە تەواوی مەڵبەندەکە کۆتاییم بە وێنەهەلگرتن هێنا، بەردێکم نیشانە کرد و بەرەو خوار بوومەوە چون مانەوەی من لە سەر لووتکە نایاسایی بوو.

هەموو کاتێک لەگەڵ بەڵگەی پێویستی بەزاندنی کێوەکان گرفتم هەبوو. بە شتێکی ناسروشتیم دەزانی و وەک ماف و داوایەکی زاتیم دەهاتە بەر چاو. کاتێک بۆ ئەو کێوانە دەچووم چ لە پاکستان یان نێپاڵ بۆم، جیاواز نەبوو و هەمیشە وامدەزانی لە ماڵی خۆمانم، ماڵێک کە هەمیشە لەگەڵمدایە و کاتێک دەچم بۆ کێو چونکە ئەوێ بە هی خۆم دەزانم پێم خۆشە و کاتێک لە کێوم وا دەزانم هی منە و نە هی هیچ کەسیتر و هیچ یاسایەک ناتوانێ بۆم دیاری بکا بەو ڕێگایەدا برۆم یا نەڕۆم، هەڵبەت یاسایەکی ئەوتۆ و وا بزانم خەیاڵپڵاوی حکمی زاتییە

و بۆ پێکەنین دەبێ، ڕاست وەک ئەو دەچێ کە بڵێن ئەو ئاسمانە باغی ئێمەیە و ئیزنتان نادەین هەناسەی تێدا بکێشن. بە بڕوای من تەنیا شتێک دەبێ دیاری بکرێ کە کاتێک دە یان پازدە گرووپ دێنە ناوچەکە، چونکە بۆ خۆشم پێم خۆشە لە کێو بە تەنیا بمەوە لەگەڵیان بدوێم. کێوەکان دایم لەگەڵ من وتووێژ دەکەن و بۆ هەمیشە ئەو هەستە لە دەروونی مندا هەیە و دەمێنێ، هەستێک کە هانمان دەدا و بەرەو پێشمان دەبا

یان دەمانگەڕێنێتەوە. کەسانێک لە هەمووی ئەوانە تێدەگەن کە بۆ کێو دەچن. دەی ئێستا چۆن دەتوانین بۆ کێوەکان یاسا دیاری بکەین؟ بەداخەوە دەبێ بڵێم هیچ کات لە نێو کێوەکانی پاکستان و نیپاڵ هەستم بە ئازادییەکی ڕاستەوخۆ نەکردووە. لێرەدا هەست بەوە دەکەم کە کەسانێک ئەو یاسایانەیان بۆ کێو دیاری کردووە کە بۆخۆیان هیچ کات پێیان نەناوەتە کێو و هیچیش لە کێو تێناگەن. هەموو ئەو قسانەی کردمن بە هۆی ئەوە بوو کە لێم تێبگەن کە کاتێک لە لووتکەکە دەگەڕامەوە، لە بارەی ئەو کێوەی بەدزی لێی وەسەر کەوتبووم، هەستم بە هیچ تاوانێک بەرامبەر بەخۆم نەدەکرد. ئەوەی ڕاستی بێ ئەو کێوە بوو کە هەستم پێدەکرد و بەڕاستی بەزاندبووم و بۆ من هەمیشە وەک بەڵگەیەکی تایبەت لە لای من مابووە و لە لای کەس نەمدەدرکاند و بەزاندنەکەشیم بە کەس نەدەگوت. بڕواتان هەبێ بەزاندنی ئەو کێوە باشتر لە هەموو کێوەکان منی ڕازی کردبوو و ئەو هەستە لە هیمالییادا بۆ من وەدی نەهاتبوو. من لە ژیانی تاکیی خۆمدا بە هەموو جۆرێک تاقی کردنەوەم لەسەر خۆم هەبووە. بۆ وێنە لە هەڵاتنی سەد میتریشدا هەمیشە هەوڵم دەدا سەرکەوتوو بم و باشتر خۆم بناسم و توانایییەکانم هەڵسەنگێنم. نموونەیەکی تریش باسی باسی بکەم لەوانەیە کەسیش لەوە ئاگادار نەبێ، کە لە سەر خۆم بە تاقی کردەوە، شەش ڕۆژ بەڕۆژوو بووم نە شتێکم خوارد و نە خواردمەوە، سەرکەوتووش بووم و بە پێویستم نەدەزانی بە کەسیشی بڵێم، وەک زۆر شتی تری وەک خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو و ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە نێوانیاندایە کە هی ئێوەیە نە هی کەسێکی تر پێویستیش نییە ئەو ڕەزامەندییە بە کەس بگوترێ و ئەوە تەنیا تایبەت بە تۆیە.

زۆر جار دیومە زۆر کەس لە بەزاندنی کێوێکدا جۆرێک باسی دەکا

که مرۆڤ سەری سوورِ دەمێنێ، ئەوەم ئاوا بەزاند و ئەوی تریشم جۆرێکی تر بەزاند، و من خۆم بە خۆم دەگوت خۆ من زۆتریشم ئەو کێوانە بەزاندووە و باشتریش وەسەر کەوتووم بەڵام بۆ بەو جۆرە بەخۆمدا هەڵنەگوتووە؟ لێرەدا بەوە دەگەیشتم کە ئەو یاسایە سروشتییە و دەبێ هەر کەس بە جۆرێک خۆی بنوێنێ و خۆی بە کۆمەڵ بناسێنێ و هەروەها تێدەگەیشتم کە ناسینی دەروونی باشترین بەڵگەیە و من بەڵێنم بەخۆم دابوو کە لەو بوارەدا لەگەڵ کەس نەدوێم· من خۆم بەباشی دەناسی و دەمزانی هێز و توانام تا چ رادەیەکە، ئەوە بۆ من بەس بوو و هەر چەند جارێک ماندوو و شەکەت لە لووتکە دەگەڕامەوە لە قووڵایی دڵمەوە هەستم بە خۆشییەکی زۆر دەکرد·

لە تاریکی شەودا گەیشتمەوە خێوەتەکەمان و گەلێک ماندوو بووم و ویتیک هیچ هەوڵێکی بۆ سازکردنی ئاو یان چێشت نەدابوو و ئاشکرایە کە بە بێ خواردن لەو بەرزاییە زۆرەدا لەشی ئینسان وەک هەڵووچەی ویشک وێک دێ· بەیانی رۆژی دوایی بەرەو خوار بووینەوە بۆ خێوەتگای تایبەت· لە بەرزایی ٦٤٠٠ میتری سێ شاخەوانمان چاو پێکەوت کە بۆ لای سەرێ دەهاتن· هەرکە گەیشتنە لامان، دیتمان رینهۆڵد میسنێر لەگەڵ دوو شاخەوانی تری پاکستانین بە ناوەکانی سابیر و شێرخان کە دەیانهەویست لە رێگای تایبەتەوە لووتکە ببەزێنن، میسنێر ویتیکی بەباشی دەناسی بەڵام منی نەدەناسی و بە ویتیکی گوت هەواڵێکی ناخۆشم بۆتان هەیە· یەکێک لە ژنەکانی گرووپی K٢ گیانی لە دەست داوە· ویستمان تێبگەین بزانین کێیە و چۆن مردووە بەڵام میسنێر وەک ئەوەی لە مردنەکەی هیچ نەزانێ شانی بۆ هەڵتەکاندین و وەڵامێکی نەداینەوە· ئێمە پەیوەندی رادوییشمان نەبوو و دەبوایە بگەڕێینەوە خێوەتگای تایبەت تا هەواڵێکی راست بەدەست بێنین· بەو هەواڵە کەمێک پەشۆکاین و هێندێک ورەمان لە دەست دابوو· میسنێر لە لای ئێمە هەڵتروشکا و بەو جۆرە پرسیارانەی کە هەمیشە لە نێوان شاخەوانان دەکرێ دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە بارەی بەرنامەکەمان· پرسی لە کوێوە دێن؟ گوتمان بۆ خۆسازگارکردن لەگەڵ کەشوهەوا رۆیشتبووینە سەرێ و زۆرمان نەمابوو بگەینە لووتکە· ویتیک بە جۆرێک وەڵامی داوە کە ئیتر پرسیار نەکا، بەڵام میسنێر رازی نەبوو و بە بێدەنگی کەمێکی لێمان روانی و ئەو جار راشکاوانە

پرسی بڵێین بزانم چوون بۆ لووتکە یان نا؟ دووبارە ویتیک بەو جۆرە وەڵامی داوە و گوتی تا نیزیک لووتکە چووین. میسنێر پێکەنی و گوتی بەڵێ بەڵێ تێگەیشتم. ئەوجار ویتیک گوتی دەتوانم داوات لێبکەم کە لە بارەی ئەو چاوپێکەوتنەمان بە کەس هیچ نەڵێی و باسی نەکەی؟ گوتی بەڵێ حەتمەن. دوای کاتژمێرێک حەسانەوە یەکترمان بەجێ هێشت، ئەوان چوونە سەرێ و ئێمە بەرەو خوار بووینەوە. دروست وەک کاتێک لە لۆتسە دەگەڕاینەوە لەو بیرەدا بووین کە ئایا بڵێی کاتێک بێ کە گرووپەکان لە گەڕانەوەدا بەیەکەوە بن؟

لە خێوەتگای تایبەت تێگەیشتین کە هالینا کرۆگێر لە خێوەتگای دووهەم بەهۆی نەخۆشی دەروونی گیانی لە دەست داوە و هاوڕێکانی و گرووپی یانۆژ کۆرژاب لە هەوڵی هێنانە خواری مەیتەکەیدان. ئێمەش خۆمان گەیاندە رووداوەکە و لە غەمیاندا بەشدار بووین و بۆ خێوەتگای تایبەت یاریدەمان دان و تا ئەوەندەی توانیمان قەبرێکمان بۆ هەڵقەند،چونکە هەموو دەوروبەرمان سەهۆڵ و بەرد بوو و گیلکی ئامریکاییش لە ساڵی ١٩٥٣ هەر لەو شوێنە نێژرابوو. ڕۆژی یەکەمی ئاگۆست هالینامان بە کۆڵێنگەکەیەوە لەوێ ناشت. دامانپۆشی و خاچێکمان لە سەر چەقاند و لەسەر لەتکە کانزایەک وەک یادکردنەوە چەند وشەیەکمان نووسی و لە شوێنی یادکردنەوەکاندا دامانناْ. ئەگەرچی ئیمکاناتێکی ئەوتۆمان نەبوو، بەڵام هەوڵمان دا باشترین ڕێوڕەسمی پرسە و سەرەخۆشی بۆ بگرین، بۆ هاوڕێیەک کە لێهستانی بوو و کاتولیک. ویندا شتێکی بە ناوی ماڵئاوایی کردن لە هالینا نووسی و خوێندییەوە و زۆر کەسی تریش قسەیان کرد. ئەوە یەکەم جار بوو لە ڕێوڕەسمێکی ئاوادا لە کێو بەشداریم دەکرد. مردنی هالینا بوو بە هۆی بارێکی گران لە سەر شانی هەموو گرووپەکە و لە کۆتاییدا کاتی پرسیارە سەختەکەش هات و گوترا کە دەبێ چی بکەین. گرووپی ژنان مابوونەوە کە چی بکەن؟ ئایا بارەکانیان کۆکەنەوە و بەرەو ماڵ بڕۆنەوە یان نا؟ ویندا بەڵێنی دا بە هەر کەس ئیزن بدا کە داوای خۆی ڕابگەیەنێ کە زۆربەیان بۆ چوونە سەر ڕایان دەربڕی و تەنیا کەسێک کە نەیتوانی درێژە بە بەرنامە بدا ئۆکۆپینیسکا هاوڕێ و دۆستی هالینا بوو. ئەو ویستی بگەڕێتەوە لێهستان و ئیتر نەیدەویست بێ هالینا درێژە بە شاخەوانی بدا. شتێک کە هەمیشە لە بەر چاومە

وەک بیرەوەرییەکی تاڵی ئەو ڕۆژە لە بیرم ناچێتەوە، ڕوخساری ئۆکۆپینیسکا بوو لە بەرەبەیانیدا. ڕۆژی دوایە ئەوم دیت کە لە دەرەوەی خێوەتەکان دانیشتبوو و هەوڵی دەدا دڵخۆشی خۆی بداتەوە و درێژە بە کارەکەی بدا و وەسەر کەوێ، بەڵێ بەو جۆرە ئەویش بۆ ماڵێ نەگەڕاوە. ئەوەی دەنووسم بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز بزانین کە ژنانیش لە کاتی غەم و پەژارە و گرفتدا دەیانهەوێ وەک پیاوان و پێ بە پێی ئەوان لەگەڵ گرفتەکان بەربەرەکانی بکەن.

ئێمە بەڕێگای ڕۆژهەلاتی K٢ دا دەستمان بە تێکۆشان کرد و لە سەر داوای ویتیک وەڕێ کەوتین، بەلام هەرکە چاومان بە ڕێگاکە کەوت شتێکمان بۆ ڕوون بۆوە کە وەسەرکەوتن بەو ڕێگایەدا، ترسناک و خۆ گرفتار کردنە. هەموو ڕێگاکە پڕ بوو لە سەهۆڵی زۆر ئەستەم و بەردی سامناک و هەڵدێری زۆر پڕترس و شوێنی ڕنوو ها بێت و ها نەیەت. ئەگەر کەشوهەواش مۆڵەتی دابایە و ڕنووش نەهاتبا، بەرد و سەهۆڵەکان زۆریان پێدەویست لێیان وەسەر کەوین. لەو ڕێگایە پرینگاینەوە و بۆ لای ڕێگای باشووری کێوەکە وەڕێ کەوتین و لە نێو دڵمدا زۆر خۆشحاڵ بووم، بەلام بەر لەوەی بڵێم ئەو ڕێگایەم پێخۆش نییە، لە کاتی دەستبەکار بووندا تووشی گرفت هاتین. سەهۆڵێکی زۆرمان هاتە بەر چاو کە لە دوورەوە دوو ڕێگا زیاترمان نەبوو کە پێیدا تێپەڕین، لای چەپ کە دیوارەکەی دووردرێژ بوو و لای ڕاستیش دیوارەکەی کەمتر. هەموو لە سەر ئەو پێشنیارە بووین کەدەبێ بۆ ئەوەی لە دەست ڕنوو ڕزگار بین، بەیانی زوو ئەو شوێنە تێپەڕ کەین کە هەر بیست خولەک لەگەڵ سەختی ڕووبەڕوو بین بەلام بە هۆی تاریکی بەباشی شوێنەکەمان بۆ ڕوون نەدەبۆوە. لای چەپیش بە هۆی بەردێکی گەورە لە کەنار سەهۆڵەکە، پشتەوەی بەتەواوی لە بەر چاو ون کردبووین تا گەیشتین بۆ شوێنێکی باش بۆ خێوەتهەڵدان کە لە بەرزایی ٦٢٠٠ یا ٦٤٠٠ میتری دوو ڕۆژی دەخایاند. ڕێگاکە بە سەختی تێپەڕ دەبوو و پڕ بوو لە ڕژد و هەڵەموت. لەو شوێنە تەنافی کۆن زۆر دەهاتە بەر چاو کە دیاربوو پێشتر لەو ڕێگایەوە هەوڵیان دابوو لووتکە ببەزێنن. وابزانم تەنافەکان هی گرووپی ئۆتریشییەکان بوون بەلام بەباشیش لێم ڕوون نەبووە. بەو جۆرە زۆر گرینگ نەبوو ئەگەر کەسانی تریش لەو ڕێگایەدا کاریان کردبێ، چون هەرکەس لێی

تێپەڕ بێ، ڤیتایی ئەو ڕەوەزە جۆرێکە کە سەری لووتی مرۆڤ ڕاست دەبێتەوە ڕێیدەخشێ. ئاخری لە تاریکیدا
ئەو بیست خولەکە ترسناکەمان تێپەڕ کرد و لە دوای ئەو گەیشتینە ڕێگایەکی دەتوانم بڵێم باشتر و شوێنێکمان بۆ خێوەتەکە لە بەرزایی ٧٢٠٠ میتری بەدیکرد. بەفر بارین و بای توند دەستی پێکرد و درێژەی هەبوو. ویتیک دەیهەویست بڕواتە خوارێ، گوتم هەر شوێنێک بچین هەر ئەوەیە، ئەگەر وایە شەو هەر لێرە بمێنینەوە باشترە و بەو جۆرە ڕازیم کرد. ڕۆژی دوایەش کەشوهەوا خراپتر بوو و لە سەر داوای من شەوێکی تریش ماینەوە. بەلام بەو جۆرە بێ کەلک بوو و گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت.

دوای حەوتوویەک هەر بۆ ئەو شوێنە گەڕاینەوە. ئەو جار بەهۆی بارینی بەفری زۆر ناچار بووین نیوەڕۆژێک بەدوای خێوەت و کەلوپەلەکانمان دا بگەڕێین. دووبارە بەهۆی بارینی بەفر و بای توند ناچار بووین بەرەو خوار بینەوە، بەلام هەر ئێمە نەبووین بەڵکوو گرووپی ژنانیش لە بەرزایی ٦٨٠٠ میتر و گرووپی یانۆژ کورژاب لە بەرزایی ٨٣٠٠ میتریڕا گەڕابوونەوە خوارێ. لە گەڕانەوە بۆ خێوەتگای تایبەت زۆرم هەوڵ دا کە لای چەپی ئەو سەهۆڵە ئەستەمانە بەتاقی کەمەوە، بەلام ویتیک مۆڵەتی نەدام. لەبەڕێوەبەرایەتی بنکەی گەشتوگوزاری پاکستان ویندا گرفتی بۆ پێش هاتبوو و نەماندەزانی کە ئەو مەسەلەیە لە کوێوە بە گوێی ئەوان گەیشتووەتەوە! ئایا لە لایەن ئەو دوو کەسەی لووتکەیان بەزاندووە؟ من لەو ڕووداوە هیچ هەواڵێکم نییە. وابزانم بۆ خۆسازگارکردن لەگەڵ کەشوهەوا و بۆ وێنە هەڵگرتنەوە باشترین شوێن بوو و K٢ دەبیندرا. بەو هۆیە بە ڕێگای برۆدپیکدا وەسەر کەوتبوون و بە هەر شێوەیەک بوو بەخێر گوزەرا.

لە گەڕانەوە بۆ لێهستان، ویندا لە شوێنی بنکەکەیان چاوێکی بە چالاکییەکاندا خشاندبوو کە هەر گرووپەی تا چ شوێنێک وەسەر کەوتبوون. بەلام هیچ ناوێکی لە بەزاندنی بەدزی لووتکەی برۆدپیک لە لایەن ئێمەوە نەهێنابوو. کاتێک کتێبی میسنێر بە ناوی سێ جار هەشت چاپ کرا، چون توانیبووی لە ساڵێکدا سێ لووتکەی هەشت هەزار میتری ببەزێنێ، لە کتێبەکەیدا نووسرابوو لە ڕێگای بەزاندنی برۆدپیک

لە بەرزایی ٦٤٠٠ میتری، ویتیک کۆرتیکا و هاوڕێی لێهستانییەکەیم چاو پێکەوت کە لە لووتکە دەگەڕانەوە. وابزانم میسنێری بەڕێز و خۆشەویست لە بیری چووبوو کە چ بەڵێنییەکی بە ئێمە دابوو.



## بەشی ٦

**کێوە بەلگەدارەکان**
**گاشەربرومی ١ ڕێگای باشووری ڕۆژئاوا**
**گاشەربرومی ٢ ڕێگای باشووری ڕۆژهەلات**

گەرمای هەتاو برستی لێ بڕیبووین و هەوا زۆر گەرم بوو. ئارەق چاوکان و ڕوومەتی دەبرژاندینەوە و دەستەکانمان دەلەرزین؛ سەرەڕای ئەو هەموو ئازار دیتنە، من و ویتیک، دانە دانە بۆشکە پڕ لە کەل و پەلەکانمان لە ئۆتۆمبیل دەهێنا خوارێ؛ پۆلیسی بەڕێوەبەرایەتی گوومرگی هیند ئەو کارانەی بە زۆر پێدەکردین کە پێشتر هیچ کام لەو جۆرە ئاکارانەمان نەدیتبوو، بەو جۆرە ئێمەی زۆر تووڕە کردبوو؛ پێشتر تێپەڕبوون بە سنووری هیندوستاندا بۆ نێو پاکستانی پێشوو ئەو جۆرە گرفتانەی نەبوو. بەلام شێوازی کارکردنی بەڕێوەبەرایەتی ئامرتیسار بەو جۆرە گۆڕابوو کە دەبوو بە گوومرگی هیند تێپەڕیبایەی؛ لەوێوە بێ لێپرسین بۆ شوێنێک کە ٢٠٠ میتر ڕێگا بوو و هیچ ئۆتۆمبیلێک توانای هاتنی بۆ ئەو شوێنە نەبوو لە کۆتایی سنوورێک دیاری کرابوو کە لە ڕاستیدا

لە ژێر چاوەدێری پاکستان بوو. پێشتر بەو جۆرە نەبوو،هەرکە لە هیند ئۆتۆمبیلەکەمان بەکرێ دەگرت بێ ڕاوەستان هەتا سنووری پاکستان دەچووین و لەوێوە لە ئۆتۆمبیلی پاکستانییەکانمان داویشت و وەڕێدەکەوتین بەلام بەو جۆرە نەمابوو.

بەنیاز بووین لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی قسە بکەین هەر وەلامیشیان نەدەدایەوە، ئەوجار ناچار بووین بارەکانمان لە ئۆتۆمبیل بێنینەوە خوارێ بەلام ئەوە هەمووی ڕووداوەکە نەبوو، بەڵکوو بەڕێوەبەرایەتی گوومرک زۆر شتی تریشی لێ دەویستین. دەبوو بارەکانمان هەڵڕێژین و لێکیان جیا کەینەوە هەرکە کارمان گەیيە ئەو ئاستە. ویتیک زمانی ئینگلیسی باشتر لە من دەزانی، دەنگی هەڵێنا و گوڕاندی و گوتی: ئاغای بەڕێز بە دوای چیدا دەگەڕێن، ئێمە نامانهەوێ بێینە نێو ولاتی ئێوە، بەڵکوو دەمانهەوێ بڕۆینە دەر، بەلێ هەر ئەوەمان کەم بوو، یەکی تریشی پێوە زیاد بوو، یەکی تریشی پێوە زیاد بوو دەستیان کرد بە پشکنینی کەلوپەلەکان، هێندێک کۆڵکێشمان کە دەیانتوانی هەر لەو شوێنە کار بکەن بەکرێ گرتن و بە هۆی ئەوانەوە بارەکانمان ڕاگوێست. هەڵبەت بەو پووڵەی کە دامان بەو کۆڵکێشانە دەمانتوانی ئۆتۆمبیلێکی باری بەکرێ بگرین و نیوەی، هیندوستانیشی پێ بگەڕێین.

بەخۆشییەوە هێشتا وەرزی بەزاندنی کێوەکان دەستی پێ نەکردبوو و ئێمە خۆمان لە نێو چیاکاندا دەدی. هەر لە بەڕێوەبردنی بەرنامەی $K_2$ و بڕۆدپیک بوو کە من و ویتیک، کاتی ئەوەمان بەدەست هێنا کە چەند ڕۆژێک ڕوونکردنەوە لە سەر ڕێگای کاشەربرۆمەکان بەڕێوە بەرین و هەر لەو لێکۆلینەوەدا بوو کە توانیمان ڕێگای باشووری لووتکەی شاردراوەی گاشەربرۆمی ١ هەڵبژێرین. لەو کاتەدا پێش ئەوی کە ئیسلامئاباد بەجێ بلێن، بەڵگەی پێویستی بەزاندنی ئەو ڕێگایەمان بەدەست هێنابوو، ئەوجار دەمانەویست هەر لەو کاتەدا لووتکەیەکی تریش ببەزێنین بەلام پارەی تەواومان پێنەبوو. لە ئیسلامئاباد یەکەمین کارێک کە دەبێ بەڕێوەبچێ ئەوەیە کە بەڵگەی پێویستی بەزاندنی لووتکە بەدەست بێنێ کە بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزاری پاکستان ئەو قەولەی پێدابووین، بەلام بەڕێوەبەری کاروبارەکان بە جێگای ئەو وەرگرتنی دۆلارەکان لێی پرسین گوتی بلێن بزانم بەڕێزان پارەکە چۆنتان لێ

تێپەڕ بوو لە لووتکەی برۆدپیک، لووتکەتان بەزاند ویستمان زۆر قسە نەکەین زۆر بە ئەسپایی و بەباشی لەگەڵی بدوێین، گوتمان پارەکە ئەو خاتوونەی کە بەڕێوەبەری بەرنامەکەی بە ئەستۆوە بوو هەمووی بۆ گێراونەوە؟ گوتی بەڵێ دەزانم بەڵام دەمهەوێ بەڵگەیەکی نووسراوەم لە ئێوە هەبێ، ڕیشمان لە گرێودا بوو بەڵگەی پێویستی گاشەربرۆممان دەویست، بەو جۆرە دەبوو بە ئارامی لەگەڵی بدوێین، ویتیک بە هەزار جۆر وەکوو مار بە دەوری خۆیدا دەسووڕا و لە قسەکانی خۆی بوارد هەتا ماندووی کردن. لە دواییدا توانی بە هەر جۆرێک بێ بە بەڵگەی پێویست ڕازیان بکا و ئێمەی ڕزگار کرد. بەڕێوەبەرانیش لە دەست گەرما بڕستیان لێ بڕابوو و ماندوو ببوون و هەتا بڵێی بەڵگە و ورەقەشیان لە سەر میزەکە دانرابوو و هەر چاوەڕوانی ڕۆژئاوا بوون و کاتی بەربانگ، ئێمەش بەڵگەمان لە گیرفان خست و ئەفسەرێکیان ڕەگەڵ خستین و دەرکەوتین.

کۆتایی مانگی مەی بوو کە دەمانتوانی ئەوجار بۆ کێو وەڕێکەوین، لە ئۆردووکاس و لە ژێر سەهۆڵەکانی بالتۆرق، لەگەڵ ڕووداوێکی تر ڕووبەڕوو بووین. ئەویش ئەوە بوو کە بەفرێکی زۆر باری کە چاوەڕوانیمان نەدەکرد. ئەوجار کۆڵکێشەکان وازیان لە ڕۆیشتن هێنا، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە ئەو پێڵاوانەی کە لەلایەن ئێمەوە پێیان درابوو، پێڵاوێکی زۆر باش نەبوون و تایبەت بوون بۆ ڕێپێوان و بۆ ئەو شوێنانە نەدەبوون کە زۆربەشیمان لەوێ کڕیبوون. ئەوجار مابووینەوە کە چبکەین و چۆن لە نێو ئەو چیایانەی قەرەقروومدا ٣٠ جووت پێڵاو بۆ ئەو کۆڵکێشانە وەدەست خەین. هەر خواردنەکەیان بۆ ئێمە گەلێکی پارە تێدەچوو کە ئەوەش بارێکی گرانی تر بوو. هەر بۆیە دەمهەوێ لە گرووپی کەمدا هاوڕێ بم و بەپێی لێکدانەوە خواردنی کۆڵکێشەکان سێکیلۆ برینجە و ئەگەر چەند شاخەوانی تریشی لەگەڵ با، دەبوو کۆڵکێشی تریش بە کرێ بگرین، ئەویش دەبووە خەرج و گرفتێکی تر بۆمان. ئەوجار بەفر لە چۆکان بوو و پێڵاویشیان دەویست، ئەوی ڕاستی بێ دەبوو ئێمە بۆمان دابین کردبان. بارەکانمان لە سەر بەفر دانابوو و بە ئیشارە دەیانهەویست ئێمە تێبگەیەنن کە ئیتر ئێرە کۆتایی کارە و دەگەڕێنەوە. ئەوەش بۆ ئێمە زۆر ڕوون بوو کە ئەگەر ئەوان بگەڕێنەوە هەر لێرەش کاری گرووپەکە کۆتایی دێ

چون ڕێگایەکی زۆرمان مابوو. لەگەڵ ویتیک دوای کەمێک لێکۆڵینەوە کەلوپەلەکانمان بەراوەرد کرد و ڕای من ئەوە بوو کە پارەکەیان بۆ زیاد کەین، بەڵام ویتیک نەیسەلماند و ڕای ویتیکیش ئەوە بوو کە کەمێک بڕۆینەوە خوارێ هەتا هەواکە بگۆڕێ و هێندێک خۆشی بکا و لە دواییدا بگەڕێینەوە سەرێ. گوتی چ ڕووی داوە و گرفتتان لەسەر چییە؟ پارەتان داونەتێ و دەبێ هەر کارێک ئێوە بڵێن بەڕێوەی بەرن. ئەوجار گوتی ئەفسەری هاوڕێتان لە کوێیە، ئەو پرسیارە کاری ئێمەی باشتر کرد، گوتم ئەفسەری هاوڕێمان پیاوێکی باش بوو زۆریشی لێ ڕازی بووین بەڵام بەداخەو دوو ڕۆژ لەمەوبەر بە هۆی نارەحەتی لاقی گەڕاوە بۆ چارەسەرکردنی، ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر لێرە بووایە زۆر بە باشی یاریدەی دەداین، بەڵام چۆن ئەو لێرە نەبوو نەمانویست جۆرێک بجوولێینەوە کە لە دواییدا گرفتی بۆ پێش بێ. ئەوجار ئەفسەری هاوڕێی ئاڵمانییەکان دەستی کرد بە لێکۆلینەوە و ڕوونی کردەوە و گوڕاندی و هەموو کۆلکێشەکانی کۆکردەوە. ئێمە کە هیچ لە قسەکانیان تێنەدەگەیشتین، هەر ئەوەندەی دەزانم کەسێ ڕۆژی دوای ڕووداوەکە لە خێوەتگای تایبەت بووین. قسەکانی زۆر بەتین بوو و وەک ئاور کاری تێکردن.

گرووپی شاخەوانانی سویسیش لە پێش ئێمەدا گەیبوونە جێ کە بەڕەێوبەرەکەیان ئیشتفان وەنێر بوو، کە چاومان پێککەوت هاوڕێ لەگەڵ مارسێل ڕوودی و ئێرهاردلۆرتن، شمان دین، کە لەو کاتەدا بە باشی بۆمان نەناسرابوون بەڵام دەمزانی کە لە یەکەمین کەسانی هیمالییان و دەیانهەوێ هەموو لووتکەکان ببەزێنن.

ئەو جاریش بەڵێنیمان‌دا لە ڕێگایەکی تایبەتەوە لووتکە ببەزێنین، ئێمە هەر لەوێ خێوەتەکانمان هەڵدا و لە پێش هەموو کارێکدا دەستم کرد بە نامەنووسین بۆ بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزاری ئیسلامئاوا کە دەمانهەویست لووتکەی دووهەمیش ببەزێنین. دەمانتوانی ئەو کارە هەر بۆخۆمان لە ئیسلامئاوا بەڕێوەبەرین، بەڵام چونکە پووڵمان نەبوو، بە نیاز بووین بەو جۆرە خۆمان وەک پوڵدارێک کە شتی لە بیر دەچێتەوە خۆبنوێنین و پییان ڕابگەیەنین و ڕازیان بکەین و نامەکە بدەینە دەست ئەو ئەفسەرە و بەڕێی بکەین کە دەمانزانی لە لایەن ئەوەوە زووتر بە دەستی کارگێڕان دەگا و دەمانزانی پێش

ئەوەی بگەینە خێوەتگای تایبەتی گاشەربڕۆمی ٢ بەڵگەی پێویستی بەزاندنی لووتکە دەگاتەوە دەستمان و بۆشمان نووسیبوو کە هەر گەڕاینەوە پارەی بەڵگەکەتان دەدەینێ.

ڕۆژی ٢٤ی ژووەن بۆ خۆسازدان لەگەڵ کەشوهەوا، گاشەربڕۆمی ڕۆژهەلاتمان بە بەرزایی ٧٧٧٢ میتر بەزاند، بەلام بەڵگەی پێویستمان بۆ ئەوەش پێنەبوو. بەلام بەزاندنەکەی چی وای لە گاشەربرۆمی ٢ کەمتر نەبوو. دوای حەسانەویەکی کەم، بۆ کارێکی گەورەتر دەستبەکار بووینەوە، ئەویش ئەوە بوو کە بە ڕێگایەکی تازەدا یانی بە ڕێگایەک کەهەتا ئەو کاتە کەس پێیدا وەسەر نەکەوتبوو، بەلای باشووری ڕۆژهەلاتی گاشەربڕۆمی ٢دا وەڕێکەوتین. ئەو کارە لە ماوەی سێ ڕۆژدا بەخۆشی کۆتایی هات. مانەوەی یەکەم شەومان لە گاشەربڕۆمی ١ بوو و شەوی دووهەمیش لە ژێر لووتکەی گاشەربڕۆمی ڕۆژهەلات ماینەوە و سێهەمین شەویشمان لە سەر ڕێگای گەڕانەوەی گاشەربڕۆمی ٢ تێپەڕ کرد و بێ هیچ ڕووداوێک گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت. ئەوجار دەبوو خۆمان سازدابا بۆ کارێکی پێویست یان وا باشە بڵێم لووتکەی شاردراوە یان دزیەتی گاشەربڕۆمی ١ کە ئەو هەموو لە دوای ماندوو ببووین کە ئەوەی ڕاستی بێ دەمانهەویست ئەویش بە ڕێگایەکی تازەدا بە لای باشووری ڕۆژئاوادا وەسەرکەوین. سویسییەکان ڕۆیشتبوونەوە کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر ئێمە ئەوانمان بۆ چێشتی شەو بانگهێشت کردبوو کە سالادی کاهوو و کەلەم و سۆسی سرکەمان دابوونێ، وابزانم زۆریان پێخۆش ببوو، هەر ئەوەش ببووەهۆی ئەوەکە ئێمەیان خەجاڵەت کردبۆوە، چونکە دوازدە بۆشکە خواردنیان بۆ بەجێ هێشتبووین و ئەوەی ڕاستی بێ زۆرتر لەوەی پێداویستیان بێ خواردنیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، بەلام نەیاندەویست لەگەڵ خۆیان بیبەنەو بۆ سویس کە دەتوانم بڵێم ٣٠٠ کیلۆ گۆشتی ڕان، پەنیر، شیرنی و شتیتر بوو. وا بزانم هەر ئەو ڕۆژە بوو من و ویتیک شتێکی زۆرمان خوارد، بێ ئەوی کە یەک دۆلاریش خەرج بکەین. ئەوجار هەتا بڵێی شتمان زۆر و هیچ ترسێکمان نەمابوو و هەر ئێمە لە خێوەتگا مابووینەوە.

بارینی بەفر دەستی پێکردبوو. چەند ڕۆژێک بوو لە سەر یەک دەباری. بەیانان کە دەرگای خێوەتمان دەکردەوە لە بەفر زیاتر هیچی ترمان نەدەدی. لەو ڕۆژانەدا کە هیچ کارێکمان نەدەکرد، هەر لە بیر زگماندا بووین. پێنج ڕۆژی تەواو بەفر باری. هەر کە بەیانیان

نانمان دەخوارد، دەستمان بە قسە و لێکۆلینەوە دەکرد و لە هەر شتێک بلێی و لە هەر بابەتێکی تێدا بوو، لە بارەی سیاسی و چۆنیەتی بنەماڵە و لێکۆلینەوە لە سەر بەرنامەی ڕێگای کێوەکانیش؛ دووبارە کاتی نیوەڕۆ دەهاتەوە و دەستمان دەکرد بە خواردنی باشی وەک گۆشتی ویشککراوی ڕانی بەراز و نۆقڵ و شیرینی˙ هەر لەو کاتەدا وردە وردە بە هۆی دانیشتن و خواردن بۆ بەزاندنی لووتکە ورەمان بەردەدا، وامان دەزانی بە پازدە ڕۆژ لووتکە دەبەزێنین و دەگەڕێینەوە و کەلوپەل کۆ دەکەینەوە و ماڵئاوایی دەکەین،بەلام بە جێی ئەو بیر و خیالاتانە هەر بەفر دەباری˙

دە ڕۆژ تێپەڕیبوو، هەر چەند کتێبی کە لە بەر دەستمان بوو خوێندمانەوە˙ کتێبی وابوو دووجار خوێندرابۆوە هی من بە زمانی ئینگلیسی بوو و ویتیکیش خەریکی فێربوونی زمانی فەڕەنسی بوو˙ دوو حەوتوو تێپەڕبوو، ئیتر هەرچی هەمانبوو لە خوێندنەوە و قسە و گاڵتە گشتی کۆتایی هات˙ جلوبەرگی دژەبام لە بەر کردبوو و بۆ پیاسەکردن لە خێوەتەکە چوومە دەر˙ ئەوەندەم چاوەڕوانی کردبوو مێشکم ورینەدەگرت˙

وردە وردە بیرم دەکردەوە کە دەبێ بیسەلمێنم کە بێبەختی ڕووی تێکردووین و هیچ شانسێکیشمان نەماوە˙ لەپڕێک هەوا ڕوونی کرد و تاو هەلات، شوێنێکم لە ژێر ڕێگای باشووری ڕۆژئاواوە چاو پێکەوت کە بۆ پێدا چوونە سەر بۆ لووتکەی شاردراوە دەبوو بە وێدا وەسەر کەوین˙ ڕێگایەکی هەڵەمووت و زۆر ڕژد و پڕ لە سەهۆلیش ئەو شوێنەی گەمارۆ دابوو˙ وێدەچوو لە سەتا سەت ڕنووی لێبێ و تا ئەو کاتە کەس نەیدەزانی چەندە بەفر لە وێدا کۆ بۆتەوە˙ هەر لەو بیرەدا بووم کە ئایا بلێی بتوانین بە وێدا تێپەڕ بین؟ دووبارە هەوا تێکچۆو و بارینی بەفر دەستی پێکردەوە˙ ئەو شەوە شەوێکی زۆر ناخۆش بوو و چەند جار لە خەو ڕاپەڕیم˙ هەموو لەشم تەڕ ببوو و سەرماش هێرشی بۆ هێنابووم˙ ئەوجار خەونم دەدی کە بە ڕێگا ناخۆشەکەدا وەسەر کەوتبووین و لە دواییدا دیتم کە شتێک بۆلای ئێمە هەڵدەفڕێ و باڵی گرتووە˙ کاتێک کە زانیم خەونە دووبارە خەوم لێکەوتەوە˙ ڕۆژی دوایی ویستم بیر لە کێو نەکەمەوە،بەلام بە جێی ئەوە بیرم لە ماڵێ دەکردەوە دەمگوت بلێی هیچ ڕووداوێکیان بۆ نەهاتبێتە پێش؟ ئەوجار ئەو پرسیارەم هاتەوە

بیری کە بۆچی کاتێک کە لە ماڵێین بیر لە کێو دەکەینەوە و کاتێکیش کە لە کێو بێکار دەبین بیر لە ماڵێ دەکەینەوە٠

بەڵێن وابوو کە ڕۆژی بیستەم کۆڵکێشەکان بێن و کۆکەینەوە و بەرەو خواربینەوە٠ ڕۆژی هەژدەی مانگی جوولای بەفر دەباری، بەلام ڕۆژی نۆزدەهەم هەورەکان ڕەوین و ئاسمان بەتەواوی ڕوون بووە٠ هەوا زۆر گەرم بوو و دەدرەوشاوە٠ لێمان ڕوون بوو ئەو هەوا خۆشە بەو زووانە کۆتایی پێنایا و سەقامگیر دەبێ٠ چاومان لە ڕژدە سەهۆلاوییەکە بوو کە لە پرێک ڕنوویەک هاتە خوارێ کە لە تەواوی ژیانمدا ڕنووی ئەوندە گەورەم نەدیبوو٠ هەموو ئەو بەفرەی کە لە ماوەی ئەو بیست ڕۆژەدا باریبوو لەگەڵ خۆی هێنایە خوارێ و لە نێو ئەو دۆڵ و دەرەیەی خست٠ ڕنوویەک کەدەیتوانی ئێمە لەگەڵ خۆی ڕەپێچەک دا٠ بەڕاستی زۆر ترسابووین٠ بە وەش خۆشحاڵ بووین کە لەو کاتەدا لە سەر ڕێگاکە نەبووین٠ بەخۆشییەوە ڕێوبانەکەی بۆ خاوێن کردینەوە هەرچەند لەوانە بوو کە دووبارە جێگای مەترسی هەبێ بەلام نە بە ڕادەی ئەو کات کە بەفری زۆری تێدا بوو٠ لەپرێک گوتم ئێمە بەیانی وەڕێدەکەوین٠ ئەوجار ئێمە تەنیا کۆسپێکمان هەبوو، ئەویش ئەوە کە بەڵێن وابوو کۆڵکێشەکان ڕۆژی بیستەم بێن و خێوەتەکان وەکۆکەن و بگەڕێنەوە خوارێ٠ ئەوجار لە هەوڵی ئەوەدا بووین کە چۆن ئەوان تێبگەیەنین کە دە ڕۆژ لەسەرمان ڕاوەستن٠ هیچ ئامرازێکی ڕاگەیاندنمان پێنەبوو و زمانی ئۆردووشمان نەدەزانی٠ لە کۆتاییدا بەوە گەیشتین کە وێنەی کێوێک بکێشینەوە و ڕێگای پێدا چوونە سەریشی تێدا دیاری بکەین٠ هەر واشمان کرد و وێنەی پێنج مانگیشمان تێدا کێشابۆوە، بەو مەبەستە کە پێنج شەوی تر لە کێودا دەمێنینەوە، ئەو وێنەیان بۆ بەجێ دێڵین و بەو جۆرە لێمان تێدەگەن٠ ئەوجار خواردنمان بۆ لە نێو بۆشکەیەکدا بۆ دانان و دەرگای بۆشکەمان ئاواڵە کرد تا بزانین کە بۆ ئەوان دانراوە٠ ئەوجار خێوەتەکەی خۆمان بە هەموو بەڵگە و کەلوپەل و پارە و پێداویستیەکان لە پەنایەکدا شاردەوە کە شوێنەکەشی زۆر پڕمەترسی بوو بەلام ئەگەر لە کێو گەڕاباینەوە هیچ شتێکمان نەدیباوە هێشتا بەوە بەختەوەر بووین کە لووتکەمان بەزاندووە، شتێک کە ئێمە بە هەر حاڵ بە هۆی ئەوەوە لێرە مابووینەوە٠

وەک هەموو گرووپە شاخەوانەکانی تر پێش وەڕێکەوتن شەوێکی زۆر تاڵمان ڕابوارد· هەموو کات لە بیری ئەوەدا بووین کە شتێکمان لە بیر نەچێ· هەتا بەری بەیانی بەباشی خەوم لێنەکەوت و هەر لەو بیرەدا بووم· کاتژمێر دووی بەرەبەیانی وەڕێکەوتین· هەتا ئەو جێگایەی لە تواناماندا بوو بە توندی ڕۆیشتین و ڕێگا ناخۆشەکەمان تێپەڕکرد و لە ژێر ڕەوەزێک ڕاوەستاین· هێندێک ماندوومان حەساندەوە و ڕێگا ناخۆشەکەمان لێ ڕوون بوو بەڵام هەموو سەهۆڵبەست بوو و ڕژدوهەڵەموت و پڕ بوو لە بەفر و لێرەدا زۆرتریش بوو· زۆربەی جێگاکانی سەهۆڵ بەستبوونی· هەرچەند دەچووینە سەرێ، سەهۆڵەکان ناخۆشتر دەبوون·

لە کۆتایی ڕژدەکەدا بە شوێنێک گەیشتین کە بەردەلانێکی زۆر ناخۆش بوو بە هۆی ڕاوەستانمان بەڵێنمان دا شەوی یەکەم هەر لەوێ خێوەت هەڵدەین، بەڵام دۆزینەوەی شوێنی خێوەت لە سەر ئەو بەرد و سەهۆڵە کارێکی زۆر ئاسان نەبوو· ئەوجار داوام لە ویتیک کرد لە بەردەلانەکە وەسەر کەوێ و لەوێ شوێنێک بدۆزینەوە· وا بزانم ڕێگاکە زۆر هەڵەموت بوو بەڵام هەر چۆنێک بێ دەمانتوانی هەوڵی خۆمان بدەین· سێ تا چوار کاتژمێری خایاند هەتا ئەو ڕێگایەمان تێپەڕ کرد، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە دەبوو بە کوڵینگ جێ پێمان خۆش کردبایە چونکە هەموو یەکسەر سەهۆڵ بوو· زۆر جار ویتیک بە دوو پێچی سەهۆڵ خۆی ڕادەگرت و دەڕۆیشت· لە دواییدا ناچار بووین هەر لە ژێر ئەو ڕەوەزە بەردە خێوەت هەڵدەین·

چووینە نێو خێوەتەکەوە· خێوەتێک کە لە سەر هەڵدێرێک بە بەرزایی چەند سەد میترێک هەڵاوسرابوو· بەیانی ڕۆژی دوایی نۆبەی من بوو کە لە سەرەتاوە دەستبەکار بم· زۆر بەتوندی لەو تەنافانەی کە ڕۆژی پێشتر ویتیک ڕایەڵی کردبوو وەسەر کەوتم· لە کۆتایی تەنافەکان تێگەیشتم کە بەو شوێنەدا ڕێگامان نابێ و هەرچەند هەوڵیشی بۆ بدەین و برۆینەوە خوارێ· من ئەو قسانەم زۆر پێ خۆش نەبوو، دوای بیست ڕۆژ چاوەڕوانی و ئەو هەموو ناخۆشییە کە لە سەر ڕووح و دەروونی من کاریگەر ببوون چۆن دەمتوانی لە نیزیک لووتکەڕا بگەڕێمەوە، منیش گوتم خواردن گرینگ نییە ئەگەر تەواوییش بێ دەتوانین ڕۆژێک خۆمان ڕاگرین، بەڵام ئەوەی جێگای نیگەرانییە کرانپۆنەکەی تۆیە کە

ئەویش بیرێکم بۆ کردۆتەوە من لە پێشەوە دەڕۆم و جێ پێت بۆ خۆش دەکەم و تۆش بە ئارامی بە دوای مندا وەرە. ئەوەی ڕاستی بێ دەمزانی قسەکانی من زۆر لە سەری کاریگەر نەبوون و ویتیک هەر لە سەر داوای خۆی مایەوە. هەر لەو قسانەدا بوو کە خەومان لێکەوت.

هێشتا هەر تاریک بوو کە بەرەو سەر وەڕێکەوتین و ئەوجار بۆ لای ڕاست ڕۆیشتین. هەتا ئەو جێگایەی توانیمان لە بەردەکانی ڕۆژی پێش کە ڕێگایان لێ بەستبووین دوور کەوتینەوە. ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە بە هەر دووکمان سێ لاقمان هەبوو، دوو لاقی من لە پێشەوە دەڕۆیشت و ویتیکش بە یەک لاق بە دووی مندا دەهات کە زۆر بۆی سەخت بوو. هەوا ڕووناک بوو و دووسەت میترمان تێپەڕ کرد، لەپڕ چاوم بە شتێک کەوت سەرم سووڕما و باوەڕم نەدەکرد، بەلام بەڕاستی بۆخۆی بوو ئەرێ کرانپۆنەکەی ویتیک لە ژێر لاقم وەدیهات. بەڕاستی بەڕاستی سەرسووڕهێن بوو. وەدیهاتنەوەی ئامرازێکی ئاوا بوو بە هۆی خۆشحالی هەردووکمان. بەوە خۆشارۆکێنی سەردەمی مندالیم وەبیر هاتەوە. ئێمە کرانپۆنمان لە لایەکی تر ون کردبوو، بەلام لە سەر ڕێگایەکی تر دۆزیمانەوە. زۆر خۆشحال بووین کە هەتا کۆتایی کار، بێ هیچ گرفتێک وەسەر کەوتین.

ئەوجار وەسەر کەوتن بە ڕێگای تازەدا بۆمان وەڕاست گەڕا، لووتکەی شاردراوە یان دزییەتی، لووتکەی شاردراوە یان گاشەربرۆمی ١ بەڕاستی کێوێکی جوان و بە قەلافەت بوو، وێنەیەکی جوان و بەفراوی. بەوجۆرە بەخۆشییەوەهە هەوا مۆلەتی داین کە کاتژمێرێک لە سەر لووتکە دانیشین. بەڕاستی زۆر بەباشی لەگەل کەشوهەوای ئەو مەلبەندە ڕاهاتبووین و زۆر بە باشی کەلکمان لە دیمەنی جوانی کێوەکانی دەورووبەریش وەرگرت و بە ئاسوودەیی لاقمان ڕاکێشا و سەرکەوتنی خۆمان هەر لەوێ جێژن گرت. جیبا لەو هەموو خۆشییە وێنەیەکی زۆریشم لە لووتکەکە هەلگرت و هەر لەوێ کۆلەنگەکەشیم دۆزییەوە. ئێمەش بزمارێکمان بە تەسمەیەک پێوە گرێ دا. بەردێکی چکۆلەم بۆ بیرەوەری لە سەر لووتکە دەست دایە و لە نێو کۆلەکەم هاویشت و ئەوجار بەرەو خوار بووینەوە.

هەر بیرمان لەوە دەکردەوە کە ئێستا بلێی لە خێوەتگای تایبەت چ ڕووی دابێ؟ بلێی کۆلکێشەکان هاتبن؟ ئەگەر هاتوون بلێی لەوێ مابن یان

کۆیان کردبێتەوە؟ هەر کە لە خێوەتگا نیزیک بووینەوە و لە دوورەوە خێوەتەکانمان چاو پێکەوت و کەمێک دوورتر چەند کەسێکمان دیت بەرەوپیری ئێمە دەهاتن. وا دیار بوو لەو وێنەیەی بۆمان کێشابوونەوە بەباشی تێنەگەیشتبوون، بەلام لە ڕێمان ڕاوەستابوون. ڕۆژی پێشتر لە چوونەسەردا ئێمەیان لە ژێر لووتکە بە دووربین چاو پێکەوتبوو، بەو جۆرە ڕێزیان بۆ هەموو شتێک دانابوو تەنانەت ئەو خواردنەی کە بۆشمان دانابوون دەستیان لێ نەدابوو.

دوای حەوتوویەک گەیشتینەوە ئیسکاردۆ. لەوێڕا بە ئۆتۆمبیلێک ئێمەیان گەیاندەو ئیسلامئاباد و لەوێ چاومان بە

ئەفسەرەکەی هاوڕێمان کەوت. بەڵگەی بەزاندنی لووتکەکانمان دایە دەستی کە زۆری پێخۆش بوو بەلام لە بەڕێوەبەرایەتی بەڵگەی تریان دەویست کە دەبوو نووسیبامان و پێویست بوو بەڵگەی بەزاندنی کێوەکان ڕاشکاوانەتر بایەن. ئەوەی بۆمان نووسیبوون لێیان سەلماندین بەلام دووبارە بۆمان نووسینەوە. ئەوجار نۆرەی ئەوە بوو کە پرسیارمان لێبکەن کە هەر لەو دەترساین. کە فەرموویان بۆچی گاشەربرۆمی ١تان بێ بەڵگە بەزاندووە؟ زۆر بە ئەسپایی گوتمان ئێمە نامەمان بۆ نووسیبوون و دەبێ بە دەستتان گەیشتبێ، ئێمە چاوەڕوانی وەلامی نامەی ئێوە بووین، بەلام نەمانتوانی هەر ئاوا ڕاوەستین و دەست لە سەر دەست دانێین و دەبوو بیرێکیشمان لە کەشوهەوا کردبا و کارەکانمان بەڕێوەبردبان، چونکە دەمانزانی کە ئێوە بەڵگەی پێویستمان بۆ دەنووسن و بە هیوای ئەو ڕۆیشتینە سەرێ. ئەوجار بەڕێوەبەر زۆر بە تووڕەیی گوتی: بەلام ئێوە هەر ئاوا ناتوانن سەر بەردەنەوە و برۆنە سەرێ. لە کۆتاییدا کە سەلماندیان هیچیان لە دەست نایە و ئێمەش لووتکەمان بەزاندووە، شەڕەکەیان خستە ئەستۆی ئەفسەری هاوڕێمان.

تازە کەس لە ڕێگادا نەمابوو و وەرزی بەزاندنیش کۆتایی پێهاتبوو و کەسیش لە مەڵبەندەکان نەمابوو. جیا لەوەش دووهەزار دۆلاریشیان پێدەگەیشت کە دەبوو پێش ئەوەی بگەڕێینەوە لێهستان ئەو بڕە دۆلارەیان بدەینێ. بەلام وا دیار بوو بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزار ئاواش دەستبەردار نەدەبوو، هەر بۆیەش ئێمەیان دە ڕۆژ ڕاگرت هەتا کاروباری بەڵگە پێویستەکان بەڕێوەچوو کە بەبێ ئەو بەڵگانە

نەماندەتوانی ڤیزا وەرگرین و لە پاکستان بڕۆینە دەر. ئەگەر ئەو ڕووداوە ڕووی نەدابا ئەو دە ڕۆژە بۆ ئێمە یەک ڕۆژی دەخایاند. نوێنەری لیهستان نامەیەکی بۆ بەڕێوەبەرایەتی نووسیبوو و تێیدا نووسرابوو کاتێ گەڕانەوە لیهستان قەرزەکەتان دەدەنەوە. ئەوجار شەڕ و کێشە کۆتایی پێهات و ئێمە گەڕاینەوە لیهستان. دەبێ بڵێم بە پیرۆزییەکی نیوەتەواو بۆ وڵاتەکەمان گەڕاینەوە کە دوو لووتکەی هەشت هەزاریمان لە دوو ڕێگای تازەوە بە کەلوپەلێکی کەمەوە بەزاندبوو و بەو جۆرە لە ئێمەش زیاتر کەس لەوێ نەمابوو. ئەوەی ڕاستی بێ گرووپی زۆر بە شێوەی ڕێکوپێک دێنە ئەو مەڵبەندانە و خێوەتی زۆر لە نێو ڕێگاکاندا هەڵدەدەن و ئەگەرچی لە کەلوپەلی باش و کەسانی بەتوانا کەلک وەردەگرن، بەو جۆرەش بە ئاسانی بۆیان ناکرێ دوو لووتکە بەیەکەوە لە ڕێگای تازە ببەزێنن و بۆ هەر لووتکەیەکیش دەبێ زۆر لەوش زیاتر دۆلار خەرج کەن.

لە کۆنگرەی بەڕێوەبەرایەتی شاخەوانی وڵاتەکەماندا کە بەڵگەی بەزاندنی لووتکەکانمان خوێندەوە، یەکێک لە بەڕێزان فەرمووی ئاغا ئەو پارانە نابێ بدرێن چونکە ئەو بەڕێزانە بێ بەڵگەی پێویست ئەو لووتکانەیان بەزاندووە. ئەوجار نۆبەی ئێمە هات کە وەڵامیان دەینەوە و گوتمان نا ئەوەی ئێوە دەفەرموون بەو جۆرە نەبووە کە لە دواییدا لێیان سەلماندین. ئێمە لێرەدا شتێکمان بۆ ڕوون نەبۆوە کە ئایا ئەو سەلماندنە بەهۆی پیرۆزی بەرچاوی ئێمە بوو یان بۆ ئەوە بوو کە لە دواڕۆژدا گرووپە لیهستانیەکان لە پاکستان گرفتیان بۆ پێش نەیەت؟ بەڵام هەرچی هەیە با هەبێ بۆ ئێمە هەر دانی پارەکان گرینگ بوون و نابێ لە بیرمان بچێتەوە کە ئەو کات لە ساڵی ١٩٨٣دا لە لهێستان ئەو جۆرە ڕووداوانە دەهاتنە پێشێ و لە سەر بەڵگە و کەلوپەل و پارە و پێداویستی تر زۆریان لێکۆڵینەوە دەکرد. وێنداش بەهۆی پشتیوانی ماڵی چەند هەزار دۆلاری بەرنامەی $K_2$ چوبووە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوە کە دەیانهەویست بزانن ئەو پارانەی لە کوێ هێناوە و پێیان دەگوت دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەیەوە و لە کۆتاییدا دوو ساڵ وێندایان وەکوو تەمبێ کردن ئیزن نەدا لە وڵات بچێتە دەرەوە لە وانە بوو بۆ وەها ڕووداوێک بەڕۆکی ئێمەش بگرن.

ئاندریزاواداش ڕووداوێکی ئاوای بۆ پێش هاتبوو کە لە کاتی خۆیدا

بەڕێوەبەری گرووپێکی تایبەت بوو کە دە خێوەتیان دابوونێ کە لە دوای بەرنامەکەدا پێنج خێوەتیان نەگەڕاندبۆوە٠ ئەویش بەو شێوەیە چووبووە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوە و داوایان لێدەکرد کە دەبوو لەتکە دڕاوکانی هێناباوە کە ئەوکات دەبوو بۆ هەر کیلۆ چوار دۆلار گوومرکی دابا کە زۆر کەسیش ئەو کارەیان دەکرد و خێوەتە دڕاوکانیان کۆ دەکردەوە و دەیانهێنا و دەیانداوە دەست عەمبارداڕەکان٠ بەو جۆرە دەبێ بۆ حیسێب و کتێبی گرووپەکان هەمیشە حازر بین و لەوانە بوو بەرگری لە تێکۆشانی ئێمەش بکەن، بەڵام یاژکۆفسکی بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی شاخەوانیی لێهستان ئەو میداڵە زێڕانەی کە بە هۆی سەرکەوتنی لە کێوەکان بەدەستمان هێنابوو لێی وەرگرتینەوە، بەڵام بۆ هیمالیبا بەرگریان نەکردین٠ بیرم لەوە دەکردەوە کە ئایا لە وڵاتانی تریش بەرگری لە شاخەوانان دەکرێ و ئایا لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بەڕێوەبەری گرووپەکان خێوەتە دڕاوەکان لەگەڵ خۆیان دێننەوە یان نا؟ لە لای خۆم لە قەدوباڵای ڕنهۆڵ میسنێرم بیر دەکردەوە کە ئەگەر شتێکی ئەو جۆرەیان لێ ویستبا چی دەکرد یان چۆنی خۆ نیشان دەدا؟




## بەشی ٧

**وەسەرپەڕینی مار**

**برۆدپیک لە ڕێگای لووتکەکانی باکوور، ساڵی ١٩٨٤**

بۆ ئەوەی کە ناومان لە بەرنامەی K٢ دا بنووسن، دەبێ چەند پارە بدەین؟ ئەوەم بە ئیستیفان ویژنیر گوت. ئیستیفان ویژنیر خەڵکی وڵاتی سوویس بوو و کاروباری نێوان هیمالییای بەڕێوە دەبرد. دوای کەمێک ڕاوەستان وەڵامی داینەوە و گوتی: دەبێ بۆ هەر کەسێک هەزار دۆلار بدرێ. وابزانم ئەو برادەرە پووڵی زۆر خۆش دەویست و ئەوەش بە باشی دەزانم کە لە دۆخی ئێمە بەباشی تێگەیشتبوو لەو بوارەش یاریدەی دابووین. ئەگەرنا ناوی ئەو بڕە پارەیەی نەدەهێنا. دوای هێندێک حیسێب و لێکدانەوە لەگەڵ ئیسلۆتی، بە هەزار جۆر بیر و خەیاڵ و هەڵسەنگاندنی کەلوپەلی پێداویست، وەلامی ڕاستیمان دانەوە و گوتمان ناوی ئێمەش لە ڕیزی خۆتاندا بنووسن. بەلام داوای سوویسییەکان داوایەکی باوەڕ پێنەکراو و سەرسووڕهێنەر بوو. ئەوەی ڕاستی بێ من و ویتیک دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر توانیمان بۆ وەرگرتنی

بەڵگەی پێویست بۆچوونە دەرەوە لە وڵات بڕێک پارە کۆکەینەوە٠ ئەوجار هێندێک لە پێداویستییەکانمان بە پارەی خۆمان بکڕین و بۆ کڕینی ئەو شتانەی کە دەماوە بەڵێن وابوو بچین بۆ لای وێرنێر و لە ئیسلامئاباد٠ بۆ ئەوە کە من و ویتیک دەمانهەویست بە یەکەوە لووتکە ببەزێنن، ئەوەش بۆ ئێمە جێگای بەختەوەری بوو کە وێرنێر ئێمەی لە هەموو بوارێک ئازاد کردبوو و کاری بە کارمان نەدابوو٠ لە لایەکی تریشەوە یانۆژتاژری لێهستانی کە خەڵکی کاتوویسی بوو، لە گرووپێکی چوار کەسدا دەیانویست لووتکەی بڕۆدپیک، ببەزێنن٠ ئەوجار ئێمە بەڵێنمان دا لە بەڕێوەبردن و کۆکردنەوەی کەلوپەلەکاندا بە یەکەوە بین٠ بە هۆی گیروگرفت و کەمی کەلوپەلی پێداویست بەتایبەت گوشت، بەوجۆرە بەڕێوەبردنی بەرنامەی گەورە لە لێهستان کارێکی زۆر هاسان نەبوو٠ بیرەوەرییەک کە هیچ کات لە بیرم ناچێتەوە، بردنی گۆشتی زیادی بوو کە کاتێک لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی، لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەوکات ڕووبەڕوو بووم کە دەیهەویست لە بارەی کارەکەماندا زورتری بۆ بدوێم، پرسیارەکە ئەوە بوو کە گوتی: تەواوی ئەو کارانە بۆ چییە؟ لەسەرەخۆی من لە وەڵامی ئەودا، بۆ بەزاندنی هیمالییا و پێداویستیەکان تەنیا پرسیارێکی تێدا هەبوو کە ئەویش ئەوە بوو کە ئەگەر کەسێک ئاوا بیر دەکاتەوە دەبێ کۆپینی ساڵانەی ڕاگرێ و لە کاتی پێویستدا کەلکی لێوەرگرێ و پێش ئەوەی قسەکانم تەواو کەم لە دیوەکەی خۆی وەدەرینام٠ لەو کاتەدا بێ گۆشت نەمدەتوانی بۆ پاکستان وەڕێ کەوم٠ ئەگەرچی لە قسەکانی بەڕێوەبەر زۆر نارەحەت و ناهومێد بووم، بەڵام ورەم بەرنەدا و دووبارە دەستبەکار بوومەوە وەبیر خاتوونێک کەوتمەوە کە دەیتوانی کارێکمان بۆ بکا٠ بە کەمێک نوقڵ و ئاڵای باشگا یان گرووپەکەیان و بە دەستە گوڵێکەوە بۆلای چووم و بەڵگەنامەی باشگام لە پێشی دانا و تێمگەیاند کاری ئێمە لەگەڵ سەفەر و پشوودانی حەوتووانە جیاوازە و تایبەتمەندی خۆی هەیە٠ ئەوجار داوای لێکردم کە بەڕێوەبردنی ئەو کارە بەو بسپێرم و گوتی هەوڵتان بۆ دەدەم و بەڕێوەی دەبەم، ئیتر نازانم چۆنی بەڕێوە برد٠ هەڵبەت بۆ ئێمە زۆر گرینگ نەبوو کە چۆنی بەڕێوە برد، گرینگ ئەوە بوو کە بەڕێوەی بردبوو و بردنی کەلوپەلەکان لە لایەن بارهەڵگرێکی گەورە، ٥٠٦ بەڕێوەچوو٠ بە دانی چەند دۆلارێک توانیمان بە ڕۆژ

چاومان بە سەهۆڵە بەستەلەکەکانی باڵتۆرۆ کەوێ. ڕۆژێک واریسکی و تۆمەک سۆیات کوفکسی بردنی بارەکانیان وەئەستۆ گرت.

کاتێک بە فڕۆکە بۆ ئیسلامئاباد دەچووین ویرنێر لەوێ چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد و بارهەڵگرەکانی تۆمەک و ڕۆژێکیش ڕۆژی دوایی گەیشتنێ. هەموو شتێک زۆر بە باشی بەڕێوە دەچوو، بەڵام لەپڕێک ئەو شتەی کە چاوەڕوانیمان نەدەکرد بوو بە هۆی گرفتاری ئێمە و وەدیهات. وا دیار بوو بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزاری پاکستان خوازیاری ئەوە نەبوو ناوی ئێمە لە نێو ڕیزی گرووپی سویسییەکاندا بنووسرێ. بیرم لەوە دەکردەوە و دەمگوت لەوانەیە بەهۆی بەزاندنی بێ بەڵگەی گاشەربرۆمی٢ گرفتی بۆ سازکردبێتین، زۆرجار دەمگوت لەوانەیە ڕووداوێکی لەوەش گەورەتر ڕووی دابێ، بەڵام لە کۆتایی تێگەیشتین کە بەهۆی ئەوە بوو کە زۆربەی شاخەوانان فێر ببوون کە لەگەڵ گرووپێک دەهاتن و لە نێو گرۆپێکی تردا ناوی خۆیان دەنووسی و بەو جۆرە کەلکیان لە بەزاندنی دوو لووتکە وردەگرت. ئەوە بوو هۆی ئەو ڕووداوە کە ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەش یەکێک لە پێداویستیەکانی وڵاتێکی فەقیری وەک پاکستانە کە دەبێ هەر کێوەی بەڵگەیەکی بۆ دروست بکا و سوودی لێ وەرگرێ؛ مەبەست بەڵگەی پێویست بۆ بەزاندنی کێوەکان.

ئیتر هیچ کارێک لە دەست ئێمە و ویرنێر نەدەهات و نەماندەتوانی لە گرووپی $K_2$ دا بەشداری بکەین، تەنانەت بەختەوەری ئێمە ئەوە بوو کە کارگێڕانی بەڕێوەبەرایەتی بەڵگەی بەزاندنی گاشەربرۆمی چواریان لێ سەلماندین کە توانیمان گرووپەکەمان بکەینە هاوڕێی گرووپی یانۆژمازۆ بەڵام بۆ من کە پێشتر لووتکەی برۆدپیکم بێ بەڵگەی پێویست بەزاندبوو، لەو ڕێگایەڕا زۆرم پێخۆش نەبوو، بەڵام دەمانتوانی ئەوجار لە ڕێگایەکی تازەوە بیبەزێنین، یان هەموو لووتکەکانی دەوروبەری بخەینە ژێر پێمانەوە، بە هەر حاڵ بەو جۆرە دەمانتوانی لە برۆدپیک دەستبەکار بین و گاشەربرۆمی ٤ کە ڕەوەزێکی سەرسووڕهێنەر بوو، بە ڕاحەتی لە کۆنکۆردیا دەمانتوانی خۆی بگەیەنینێ کە شوێنی تێپەڕبوونی هەموو شاخەوانانی لووتکەی $K_2$ ش بەوێدا بوو.

ئەو دیوارەیە یان ڕەوەزە، بە تەواوی بیری ئێمەی داگرتبوو کە

لەگەڵ ویتیک بەڵێنمان دا لە دوای بڕۆدپیک لووتکەی ٧٩٢٠ میتری گاشەربرۆمی ٤ ببەزێنن هەرچەند لە نێو ڕیزی چاردە لووتکە هەشت هەزارییەکان نەبوو. لە دواکاتەکان و پێش ئەوەی بەرەو خێوەتگای تایبەت وەرێکەوین بەرنامەکەمان گۆڕا. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە تۆمەک و ڕۆژیک بۆ لیهستان گەڕانەوە کە ئەوەش بوو بە ناڕەحەتی ئێمە. ئەگەرچی بەڵێن وابوو لە کۆتاییشدا بگەڕینەوە، بەلام بەو شێوەیە هەموو شتێکمان لێ شێوا. ئەوجار چارەمان نەمابوو یان دەبوو بارهەڵگرێکی تر بەکرێ بگرین، یان خۆمان ئۆتۆمبیلەکە لێبخوڕین. ئەوە جێگای خۆشحاڵی بوو کە لە نێو گرووپەکەدا ئۆتریشییەکمان لەگەڵ بوو بە ناوی ئیوەک ویسترلۆند کە بەڵگەی تایبەتی نێونەتەوەیی ئۆتۆمبیل لێخوڕینی هەبوو وبەو شێوەیە بۆ تێپەڕکردنی مەودای ٦٠٠ کیلۆمیتری نێوان ئیسلامئاباد هەتا ئیسکاردۆ، دوانیوەڕۆی هەر ئەوڕۆژە کاتژمێر٤ وەرێکەوتین و تا بەیانی ڕۆژی دوایی یەکسەر ئۆتۆمبیلمان لێخوری و وا باشە ئەوەش بلێم کە بە نۆرە ئۆتۆمبیلەکەمان لێدەخوڕی.

کاتژمێر هەشتی بەیانی دووبارە لە پشتی فەرمان دانیشتمەوە و ڕێگای پڕ پێچ و ترسناکم درێژە پێدا. لە لایەک ئۆتۆمبیلەکانی نێو ڕێگا و لە لایەکی تریشەوە هەڵدێر و ڕووبارە خوڕینەکان بەڕاستی سەرسووڕهێنەر و ترسناک بوون. ناوی جادەکە وابزانم بە ناوی ڕێگای گەورەی قەرەقوڕووم بوو. من بە هەردووک دەست فەرمانی ئۆتۆمبیلەکەم گرتبوو پێوەی نووسابووم و هیچ بۆ گاڵتەش نەدەبوو. هەر بەو جۆرە کە درێژەم دەدا، لەپڕ وەسەر مارێک پەڕیم کە بە جادەکەدا تێپەڕ دەبوو. ئارەقەیەکی ساردم کرد و مچوڕکێکم بە لەشدا تێپەڕ بوو. ئەوجار چوومە نێو بیر و خیاڵات کە نەکا دیتنی ماریش وەک پشیلەی ڕەش بەدشووم بێ. لە سەد و پەنجا کیلۆمیتری ئیسکاردۆ تێگەیشتین کە ئەو نیگەرانییەی من بێهوودە نەبووە، چون ڕنوو هاتبوو و یەکسەر جادەکەی بەستبوو و چوار ڕۆژی دەخایاند هەتا بیکەنەوە. ئەوجار سەری فەرمانم بۆ لای گێلگیت سووڕاندەوە کە ٦٥ کیلۆمیتر لەگەڵ ئێمە مەودای هەبوو و نیزیکترین شاریش بوو لەو ڕێگا پڕپێچ و هەڵدێرەی کێوەکاندا کە پێیاندا تێپەڕ دەبووین.

بە وەدیهاتنی دۆڵی سەرسەوزی گۆیی، چاومان بە دونیایەکی

تازەتر کەوت. نیوەڕاستی جادەی ئیسفالتم گرت و وەڕێکەوتم. جاروبار تووشی جۆگەی چکۆلەش دەهاتم و لە جادەکەدا پردی باریکیشمان دەهاتە سەر ڕێ و لێیان تێپەردەبووین. ئۆتۆمبیلەکەمان هێندێک بارەکەی لە خۆی زیاتر بوو بەڵام زۆرمان بۆ گرینگ نەبوو. هەرکە گەیشتینە یەکێک لەو پردانە، سەری فەرمانم کەمێک بۆلای ڕاست سووڕاند و کە ویستم بیخەمە نیوڕاستی پردەکە، لە پڕێک تێگەیشتم ئۆتۆمبیلەکەم لە دەستدا نەماوە. تەگەری پێشێ لە قەراغ پردەکە کەوتبوو و بەوجۆرە لە ڕژدێکدا مابووینەوە کە یەکسەر دەچووە نێو چۆمەکەوە. لە پێش ئێمەشەوە ڕژدێکی تریشی لێبوو کە بوو بە هۆی ڕاگرتنی ئۆتومبیلەکەمان. بە کورسی ئۆتۆمبیلەکەوە نووسابووم و بەخۆشییەوە هیچ شوێنێکم بریندار نەببوو.

ڕۆژێک پاولۆسکی جۆدۆکار بەیەک تکنیک خۆی لە ئۆتۆمبیل فڕێدا و جووتپێ لە سەر زەوی ڕاوەستا. بەو جۆرە ئەو کە لە بەر چاوم بوو هیچی لێنەهاتبوو، بەڵام لەوانەی کە لە پشتی ئۆتۆمبیلەکەدا بوون ئاگادار نەبووم. لەو بیرەدا بووم کە لەوانەیە بە هۆی کەوتنی بارەکان بە سەریاندا زۆر شپرزە بووبن، کە لە پڕێک دەنگ و ناڵەیانم گوێ لێبوو و خەیاڵم ڕاحەت بوو، بەڵام ئۆتۆمبیلەکەمان زۆر شپرزە ببوو و هەر بۆ فڕێدان دەبوو. ئەوجار ئۆتۆمبیلمان بەجێ هێشت و بۆ گێلگیت وەڕێکەوتین. هەرکە گەیشتینە گێلگیت بە دوای شاخەوانی بەناوبانگی پاکستانی بە ناوی شەرخاندا گەڕاین کە لەوێ دەژیا. ئەو بەڕێزە لەگەڵ زۆربەی گرووپە لێهستانییەکان هاورێیی کردبوو و باوکیشی لە ئەفسەرە خانەنشینەکانی هێزەکانی ئاسمانی بوو کە بەو هۆیەشەوە ببوو بە جێگای متمانەی زیاتر لە نێو بەڕێوەبەرایەتی وڵاتەکەدا. زۆری یاریدە داین و توانیمان بە جەرسەقیلێک کەلاکی ئۆتۆمبیل بۆ شار بێنینەوە و شوێنێکی تایبەتیشی نیشان داین بۆ دروست کردنەوەی، بەڵام ئەوی ڕاستی بێ ئەوێ شوێنی چاککردنەوەی ئۆتۆمبیل نەبوو، دوو کەس لەو شوێنەدا بوون کە یەکێکیان چەکوچ و ئەوی تریشیان هاچەری بە دەستەوە بوو کە لە سەر ئەو بڕوایە بوون چاکی کەنەوە و داوای چەند کەرەسەشیان بۆ ئۆتۆمبیلەکە لێکردین. پێویستە بگوترێ ئەو بەڕێزانە هەتا کاتی گەڕانەوەی ئێمە دوو مانگیان مۆڵەت هەبوو و، ئیوەک ویسترلۆند کە بۆ ئۆتریش دەگەڕاوە بەڵێنی دا کەلوپەلە

پێداویستەکانمان بۆ بنێرێ.

نامەیەکمان نووسی کە بە شێوەیەک تۆمەک و ڕۆژێک لێمان تێبگەن. ڕوداوەکەمان بۆ گێڕابوونەوە چونکە هەرچۆنێک بێ ئەو ئۆتۆمبیلە هی ئەوان بوو و زۆری نەمابوو کە بە ناوی کۆنە بیفرۆشین، بەلام لە دواییدا گوتمان با بۆخۆیان هەرچی لێیدەکەن با لێیبکەن. ئەوجار کە ئۆتۆمبیلمان پێنەبوو، دەبوو بارەکانمان کەم کردباوە، ئێمەش کەلوپەلی پێداویستمان وەک خواردن، کیسەخەو، خێوەت و هەرچی پێداویستمان بوو جیامان کردەوە و ئەوانی ترمان پێچایەوە و ئەوانەی مانەوە بۆ بەدەستهێنانی پوولی چاککردنەوەی ئۆتۆمبیلەکە و بەکرێگرتنی ئۆتۆمبیل دامانناً بۆ فرۆشتن. ئەوجار کە لە شەقام داماننابوون زۆری نەمابوو دەردەسەرمان بۆ ساز کا، پۆلیس بێتوو لەگەڵمان ڕووبەڕوو بێتەوە زۆربەی خەڵکیش دەهاتن و کەلوپەلەکانیان چاو لێ کرد و دەڕۆیشتن، لە دواییدا کابرایەک هات و هەموو کەمپووت و سابوونەکانی کڕین. لە کۆتاییدا هەموو شتێکمان فرۆشت و شەقاممان بەجێ هێشت و بۆ کێو وەڕێکەوتین.

خێوەتگای تایبەتمان لە سەر ڕێگای باشووری بڕۆدپیک دامەزراند بەلام هیچمان پێمان خۆش نەبوو کە بە ڕێگای تایبەتی لووتکەکەدا وەسەر کەوین، چونکە ساڵێک پێش بەو ڕێگایەدا لووتکەمان بەزاندبوو و بەڵێنمان دا کە هەموو لووتکەکانی دەورووبەری بە ڕێگای باشووردا کە هەتا ئێستا کەس نەیبەزاندبوون ببەزێنین کە ئەوەش بۆ ئێمە وەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی تازە و تایبەتیتر بوو، بەلام لە سەرەتاوە دەبوو هێندێک لێیان نیزیک بینەوە چونکە لە خێوەتەکەمانڕا بەباشی نەدەبیندران. هەڵبەت هەر ئاواشی لێهات، یەکەمین هەنگاومان وەک ئەوەی کە ئاوێکی ساردمان بەسەرداکەن وابوو، هەموو ڕێگاکە پێویستی بە تەناف ڕایەڵکردن هەبوو. جاری دووهەم کەوتینە سەر هەڵدێرێک پڕ لە سەهۆڵ و شەومان بە سەردا هات و مانەوە، چێشتێکمان دروست کرد و بە ماندوویی لە نێو خێوەتەکەدا خواردمان و لە کیسەخەوەکانمان خزاین. هێشتا خەومان لێنەکەوتبوو وام هەست کرد کە دەنکە برینج بەسەر خێوەتدا دەڕێژن و دەنگەکە هەر دەهات و زۆرتر دەبوو بەجۆرێک خۆمان خڕکردەوە و بە میلەی خێوەتەکەوە نووساین بۆ وی کە نەشکێ. دوای تاوێک

دەنگێک هات و شتێک وە خێوەتەکەمان کەوت، بێ هەست ڕاوەستاین و کاتێک چاومان هەڵێنا دیتمان دوو بەردی گەورە بە گەورەیی سەری ئینسان درووست لە نیوەڕاستی خێوەتەکەدا لەو جێگایەی پێشتر لەو ڕووداوە هەر دووکمان بە بڵاوی دانیشتبووین. ئەوانە ئیتر چ بوون نازانم! ئەوەش بەلایەکی تر بوو بۆمان ئیتر نەماندەتوانی بۆ هیچ کوێ بچین، چون شەو درەنگ بوو و لە لێژێکی ٥٠ دەرەجەدا مابووینەوە. لە سەرەتاوە وامان دەزانی باشترین شوێنمان بۆ خێوەت هەڵبژاردووە و سێ کاتژمێریش پێوەبووین هەتا خۆشی کەین. لەوێش بە ناهۆمێدی گەڕاینەوە و شوێنێکی ترمان بۆ خێوەت دۆزییەوە بەلام من گەڕامەوە بە ویتیکم گوت ئەگەر بۆمبێکیش لە ئاسمان بەربێتەوە دەزانم ڕاست وە خێوەتەکەی ئێمە دەکەوێ، جا لە هەر شوێنێکیش بین بۆ ئێمە هیچ فەرقی نییە با هەر لێرە بمێنینەوە. بەلام ویتیک وەلامێکی نەدامەوە و بەو جۆرە هەم خێوەتەکەمان دڕابوو و هەم بە تەواوی ورەمان لە دەست دابوو، بەلام هەتا بەیانی لەو شوێنە ماینەوە.

دوای لێکۆڵینەوەیەک ناچار بۆ خێوەتگای تایبەت گەڕاینەوە. ئەو جار لە هەوڵ و تێکۆشانێکی تردا توانیمان هەتا بەرزایی ٦٢٠٠ میتری وەسەرکەوین. لەو شوێنە بە ڕژدێکی زۆر هەڵدێر و سەهۆلاوی گەیشتین کە بە نووکی کرانپۆنیش نەدەکرا پێیدا تێپەڕ بین، ئەوەش بوو بە هۆی پرینگانەوەی ئێمە لە کارەکەمان. وا بزانم بە ڕێگای باشووردا بتوانین لووتکەکە ببەزێنین، بەلام لەوانە بوو نەتوانین بە لابەلای ڕێگاکەدا تێپەڕ بین و هەر ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە ویتیک لە قسەی هەوەڵ پەشیمان بێتەوە و ڕێگای باکووری کێوەکە هەڵبژێرێ. ئەگەرچی داوایەکم لێی هەبوو بەلام بێدەنگەم لێکرد و هیچم نەگوت. بێدەنگەم لێکرد و هیچم نەگوت. لە خێوەتگای تایبەت کەوتینە نێو لێکۆڵینەوە لە سەر چۆنیەتی ڕێگاکان، بەلام بۆ من زۆر سەخت بوو کە دەستهەڵگری ڕێگای باشوور بم، بەلام ویتکیش هەر لە سەر بڕوای خۆی بوو و بە هیچ شێوەیەک کۆتا نەدەهات هەتا ئەو جێگایەی کە منیش نەمتوانی هیچی تر خۆم ڕاگرم و گوتم: ئێستا کە ئەوەندە خوومان بە یەکەوە گرتووە باشە بەو ڕێگایەی کە ئێوە دەڵێن بەوێدا دەڕۆینە سەرێ و گرینگ ئەوەیە کە هەر ڕانەوستین، با تێبکۆشین دەست لە سەر دەست دانان هیچ کەلکی نییە. بەم جۆرە ئەوجار لە ڕێگایەکی

تازەوە دەستبەکار بووین و پێنج ڕۆژی خایاند.

بەزاندنی لووتکەی باکوور زۆر سەخت بوو، لووتکەی نیوەڕاست هاسانتر بوو و بێ ئەوەی ڕووداوێکمان بۆ بێتە پێش کارەکەمان کۆتایی پێ هێنا. لە دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر کە لە ڕەوەزەکانی باشوور نەمانتوانیبوو وەسەرکەوین حاڵوهەوایەکی تازەی بۆ ئێمە ڕەخساندبوو. ئەگەرچی بڕوای ویتیک ڕێگای باکووری بە لابەلاکەیدا پێ باشتر بوو بەڵام من هەر لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە بە سەر ڕێگای باشووردا وەسەرکەوین و بە ڕێگای تایبەتی لووتکەدا بێینەوە خوارێ. لە ڕێگادا چاومان بە جێپێی گرووپێکی ئیتالیایی و شاخەوانانی لێهستانی یا نۆژمازۆر و ئەوانی تر کەوت. لە بەرزایی ٦٤٠٠ میتری دەوروبەری شوێنی خێوەتگای دووهەم تێگەیشتم کە ویتیک دیار نییە، سەرم سووڕما بەڵام ئەو ئەو کەسە نەبوو کە بێ هیچ ئامۆژگارییەک سەری داخا و بڕوا. کەمێک لە ڕێ ڕاوەستام لە دواییدا لە هەوڵی ئەوەدا بووم لە دووی بگەڕێم، لە پڕێک سەروکەلەی ودیهاتەوە و بۆی گێڕامەوە کە لە هەوڵی ئەوەدا ببوو کە خۆی بە تەنافێکی کۆن کە لە ڕێگادا بوو ڕابگرێ، بەڵام تەنافەکە پساوە و ئەویش هەڵدێرراوە هەتا نیزیک ڕژدێکی ئەستەم خلۆر بۆتەوە و بەخۆشییەوهە لەو هەڵدێررانەدا دوای هەوڵێکی زۆر گرانپۆنەکانی بە سەهۆڵەکەوە گیر بوون و توانیویەتی خۆی لە مردن ڕزگار کا. وا دیار بوو شوومی وەسەرپەڕینی مارەکە هەر درێژەی هەبوو. یەکەم بەڵگەی پێویستی $K_2$ی نەداینێ، دوای ئەو بارهەڵگرەکەمان وەرگەڕا و ئەوجار زۆری نەمابوو ویتیک بە تەواوی بەرەوپیلی مردن بچێ، بەڵام لابەلای لووتکەکانی برۆدپیک بۆ ئێمە زۆر گرینگ نەبوو و زۆرتر لە بیری گاشەربرۆمی چواردا بووین کە چاوەڕوانی دەکردین. کاتی ئەوە هاتبوو کە بۆ لای ئەو ڕەوەزە بەناوبانگە وەڕێ بکەوین کە زۆر جوان و ڕێکوپێک بوو و هەزاران شاخەوان بەئاوات بوون پێیدا وەسەرکەون. کێوێک کە لە چاو پێکەوتنێکدا نەتدەتوانی بڵێی ناچم و کەس نەیدەزانی بڵێ چ کاتێک لە لایەن کێوە دەبەزێندرێ. ئەوەی ڕاستی بێ بۆ یەکەم جار کە ئەو کێوەم لە نیزیکەوە چاو پێکەوت، هیچ کات بڕوام نەدەکرد کەسێک بتوانێ لێی وەسەرکەوێ و دوای چەند جاری تر کە بە لایدا تێپەڕ بووم، هەر کات ڕادەبردم تیر لێم دەڕوانی و چاوم لە ڕەوەزە ٣٠٠٠ میترییەکەی کە

بیری ئێمەی ئاڵۆز کردبوو دەکرد.
کەمێک هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە ڕۆژێک لەوانەیە بتوانم بیبەزێنم. ویتیک زۆری قسە لە سەر ڕەوەزەکە دەکرد بەڵام من لە سەر ئە بڕوایە بووم کە بەزاندنەکەی ئیمانێکی بەهێزی پێدەوێ. لە هەوڵ و تێکۆشانێکی تاقیکردنەوەدا توانیمان ٢٠٠ میتر وەسەر کەوین و هەوڵم دا ڕێگاکە لە بیر خۆم نەبەمەوە و وردە وردە بڕوام بە ویستنەکەی خۆم بوو. لە دوای چەند ڕۆژ حەسانەوە و ڕوونکردنەوەی کەشوهەوا، ڕۆژێک هات و ئێمەش لە دانیشتن وەڕەز بووین. کەلوپەلی پێداویستمان بۆ پێنج ڕۆژ تێکنا و کۆڵەبارمان بەستن و ڕێگای هەشت کاتژمێری نێوان خێوەتگا تا ژێر ڕەوەزەکە وەسەر کەوتین و دەستبەکار بووین، خۆ هەتا سەر نەماندەتوانی هەر چاوەڕوان بین. هێشتا لە دەستپێکردنی کارەکەمان زۆر تێنەپەڕیبوو کە لەپڕێک ویتیک دانیشت و داوای لێکردم بگەڕێینەوە بۆ ماڵێ. گوتی: دەزانی چییە، هەر بڕۆ لە بەر چاوم ونبە، ئەو ڕەوەزەم بەدڵ نییە و دڵم بە هەواکەشی خۆش نییە، وەرە با بگەڕێینەوە. زۆر نارەحەت بووم، ئەو هەموو ساڵە هەوڵی دا و ئێمەی ڕازی کردبوو کە بەو ڕەوەزەدا وەسەر کەوین، ئێستا کە لە بەر ڕەوەزەکە بووین بۆخۆی پەشیمان ببۆوە و دانیشتبوو. منیش گوتم زۆر باشە ویتیک دەگەڕێینەوە بەڵام هەتا ماوەیەک بۆ لای من مەیە. بەو جۆرە گەڕاینەوە بۆ خێوەتگای تایبەت و بەو جۆرە بەرنامەی ئێمە کۆتایی پێهات.
مازێر ویلسکی، پاولوسکی و فییۆت توانیبوویان لە گرووپێکی چوارکەسی و بە ڕێگایەکی خۆشدا لووتکەکە ببەزێنن. لەو ڕووداوەدا ویلسکی ڕێکۆردێکی تازەی بەدەست هێنابوو و توانیبووی لە بیست و سێ کاتژمێردا لە لووتکەکە بچێتە سەرێ و بێتەوە خوارێ کە سەرکەوتنێکی گەورە بوو، بەڵام نەک بۆ شاخەوانی چون پتر وەک هەڵاتن دەچوو. لە کاتی گەڕانەوەدا هەردووکمان پێویستمان بە تەنیایی هەبوو و هەر لەوێوە بەبێ کێشە ڕێگایەکی ڕاستمان بۆ هاتنە خوار هەڵبژارد. ئەوجار من ڕێگایەکی تری ماشەربرۆمی یەکم هەڵبژارد کە کەمتر بوو و بە نێو گوندێکی چکۆلەدا تێپەڕ دەبوو و بە ئیسکاردۆ دەگەیشت. هەر لە سەرەتای کارەکەوە لووتکەی جوانی بیارچای بە بەرزایی ٦٧٠٠ میتریم چاو پێکەوت کە هیچ کات نەمدەتوانی لە بیر

خۆمی بەرمەوە هەتا ئەو کاتەی بەزاندم. بەڕاستی ئەو کێوانەدا شتی زۆر بەکەلکیان تێدایە کە ئینسان بتوانێ سوودیان لێ وەرگرێ. هێندە وەڕەز بووم بێ ئەوەی کەسم لەگەڵ بێ لەتەک خۆم قسەم دەکرد و هەر کارێک بەپێویستم زانیبا بەڕێوەم دەبرد و خۆم بە ئی کێوەکان دەزانی. ئاگاداری و بەڵگەکانی ئێمە لە سەر ئەو شوێنانە زۆر ڕوون نین و ناتوانین زۆر لە سەر زنجیرە کێوەکانی قەرەقرووم قسە بکەین و بیانناسێنین.

پێش هاتنە خوار پرسیارم لە چێشتکەرەکەمان کرد، ئەو لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە دەبێ من تەنافێکی دەمیتری لەگەڵ خۆم بەرم. لە ڕێگادا تووشی زۆر قەڵش و کونە سەهۆڵ و پزووە بەفر هاتم، ئەگەر دوو یا سێ کەس باین زۆر باش دەبوو، یەکمان دەمانتوانی سەری تەنافەکە بگرین، بەلام بەتەنیا دەبوو خۆم لێم ڕوون بێ کە دەبێ چبکەم، ئەگەر بازم دابا دەمتوانی لێواری قەڵشە سەهۆڵەکە بگرم یان ئەگەر نەتوانم بیگرم دەکەوتمە نێو قەڵشە سەهۆڵەکە و نەمدەتوانی بێمەوە دەرێ، بەو جۆرە لە قەڵشە سەهۆڵەکان ڕزگاریم بوو. لە کۆتاییدا چاوم بە سەوزاییەکی زۆر دڵگیر کەوت کە بۆ من دنیایەکی تازە و تایبەت بوو کە جیاواز لە بەفر و سەهۆڵ و بەرد بوو. وردە وردە هەوا بەرەو تاریکی دەچوو و هێشتا هێندێک لە کێو و بەفر و سەهۆڵەکان لە سەر ڕێگام مابوون کە لەوانەبوو لە یەکێک لەوان هەڵدێررێم. لە کۆتایی ئەو ڕێگایەشدا تووشی ڕەوەزێکی پازدەمیتری بووم کە هەموو ئەو دیمەنە سەرسەوزانەی لێ ون کردم. وابزانم چێشتکەرەکەی ئێمە ئەو شتانەی لە بیر بوو بۆیە دەیگوت تەنافێکی دە میتری لەگەڵ خۆت بەرە. لە لای خۆم بیرم کردەوە و گوتم ئەگەر ڕۆژێک بێ ئەو کابرایە ببینمەوە، بەتەواوی لە بارەی ئەو ڕێگایەدا لێی دەپرسم بزانم وایە یان نا. لە دواییدا پێچێکی سەهۆڵیم داکوتا و تەنافم لێبەست، دیتم کە هێشتا پێنج میترێکی بۆ سەر زەوی دەما. هەر لەو بیرەدا بووم کە بازدەم یان نا کە دەتوانم بڵێم شوێنەکە بە بەرزایی یەک نهۆمی خانوویەک دەبوو. ئەگەر لاقم نەشکابا لەوانە بوو قەڵشە سەهۆلی لێبا، بەلام چارەم نەمابوو دەبا هەوڵێکم دابا. هەوڵ کۆڵەکەم بەرداوە و لە دوایی‌دا تۆنیکی پێویست بوو و بەڵێن وا بوو بۆی لە لێهستانەوە بێ هەواڵێک نەبوو. لە سەر ئەو بڕوایە بووم کە تۆمەک و ڕۆژێک کە خاوەن‌ماڵی بارهەڵگرەکە

بوون ئەوەندە قەڵسن کە پێیان خۆش نییە چاویان بە ئێمە بکەوێ و لەوانەیە لە پشت سەر زۆریشیان قسە پێگوتبین. هەرچۆنێک بێ بەڵگەی پێویستی فرۆشتنی ئەو بارهەڵگرەمان لە دەوڵەتی پاکستان وەرگرت. من و ویتیک بێجگە لە پارەی فرۆشتنی ئۆتۆمبیلەکە، حەوسەد دۆلاریشمان لە سەر دانا و بەو جۆرە لە لایان خاوەنماڵەکانەوە بەخشراین. بەو جۆرە بە لابەلای لووتکەکانی برۆدپیک بەڵگەیەکی بەکارهاتووم لە نێو کارنامەی خۆمدا نەدەدی و بارهەڵگر و زۆربەی کەلوپەلەکانیشمان لە دەست دابوو. بەو جۆرە لەو بەرنامەیەدا هیچی تر بە هەشت هەزارییەکانیشم زیاد نەبوو و لەگەڵ کەسانێک کە تەمەنێک بەیەکەوە بووین لەو بەرنامەیەدا نەسازاین. کەمێک پەشۆکابووم و دەبوو لە سەرەتاوە دەستبەکار ببامەوە. کاتێک کە لە ویتیکم پرسی کە لەگەڵ دوو بەرنامەی دوو لووتکە لە زستاندا یانی دائولاگیری و چۆئایۆ چۆنی؟ گوتی: پێم وانییە بتوانیت و قسەی قۆڕیش مەکە، تۆ شێتی، ئەسڵەن کاتی ئەو کارەمان نییە بەلام لەوانەیە ئەو لێکۆلینەوانە زۆر باش بن بۆ کارەکەمان، ئەگەر وایە هەر یەکەی بە ڕێگای خۆماندا برۆین. گوتم: دەزانی وادیارە کاتی ئەوەیە کە ئەو کارەی کە بە یەکەوە دەستمان پێکردووە بەیەکەوەش کۆتایی پێ بێنین؟ گوتی: تۆ بە ڕێگای خۆتدا برۆ و من بە ڕێگای خۆمدا. ئەو بوو کۆتایی بەرنامەکانی من لە ساڵی ١٩٨٤دا.



# بەشی ٨

**دائۆلاگیری لە نێو مژ و بەفردا**

کاتێک کە لە دەرگای ماڵی خەسوم دا وەبیر ڕۆژانێک کەوتمەوە کە بۆ خوازبێنی چووم کە دیاری و گوڵم بە دەستەوە بوو بۆ خەسووی دوارۆژم: هەر لەو شوێنەدا بوو کە ئەو کات زۆر بەباشی پێشوازیان لێکردم بەڵام ئەو جارەیان شێوەی هاتنم زۆر جیاواز بوو، لە سەرەتاوە هەواڵی سلینایان لێپرسیم کە لە وەڵامیاندا گوتم ئەو لە نەخۆشخانەیە و بە وتەی دوکتۆری چارەسەری، هیچ گرفتێکی نییە و باری تەندروستیشی باشە و بەو زووانەش منداڵەکەی دەبێ و زۆریشی پێخۆشە کە دووهەمین منداڵیشمان دێتە دنیا: سەختی وتەکەم لێرەدا بوو کە منداڵەکەمان بە دنیا دەهات: لەمێژ نەبوو لە هیمالییا گەڕابوومەوە و لەو کاتەشدا دەمهەویست بگەڕێمەوە بۆ هیمالییا، یانی هەمووی ئەو ڕووداوانە دوو مانگی خایاندبوو یانی مانگی سێپتامبەر هاتبوومەوە و مانگی ئۆکتۆبریش منداڵەکە بە دنیا دەهات و مانگی نۆوامبریش بۆ بارنامەی زستانیی دائۆلاگیری خۆم ساز دەکرد کە

له هیمالییادا پێویست بوو بەر لەوەی لەگەڵ سلینا قسە بکەم دەبوو ماڵی خەسووم ڕازی کردبا، چونکە لە مانگەکانی یەکەمدا بوونی باوک بۆ منداڵ زۆر پێویستە و تەنیا بە یاریدەدانی ئەوان بوو کە دەمتوانی ئارام بگرم و واش بەڵێن بوو کە بۆ یەکەم جار لە ساڵی تازەی زایینیدا لە ماڵێ نەبم و ئەوجار نەک بۆ بەزاندنی لووتکەیەک بەڵکوو دەمانهەویست دوو لووتکە هەڵبژێرین· دایکم لە سەرەتاوە بەڵێنی پێدابووم یاریدەم بدا بەڵام بنەماڵەی خێزانم دەبوو ڕازی کردبان· لە کۆتاییدا هەمووی بە یەک وشە تەواو بوو، گوتیان بەڕاستی ئەگەر لە لات ئەوندە گرینگە بڕۆ ئێمە خۆمان لەگەڵ سلینا قسە دەکەین· پێموابێ لەو کاتەوە وەک خەڵک نەمدەڕوانییە دایکی خێزانم هەمیشە ڕێزێکی تایبەتیم بۆ خەسووم دادەنا·

ڕۆژی بیست و شەشی ئۆکتۆبر منداڵی دووهەمم بە ناوی ویتیک، بە دنیا هات· کاتێک دەمانشۆرد زۆر پێدەکەنی و وشیار بوو· هەرچەند سلینا ئیزنی دابووم بەڵام بەرانبەر بە منداڵەکانم هەستم بە گوناهێکی تایبەت دەکرد کە ماڵم بەجێ دەهێشت· لەو کاتەی کە ڕۆیشتمە نێو باشگا و ویستم لە سەرەتاوە زۆرێک لەو ڕووداوانە باس نەکەم، چون نەمدەتوانی لە بەرامبەر خورافات و قسەی ئینسانە جۆراوجۆرەکان گوێ ڕاگرم کە ئێمەیان بەوە تاوانبار کردبایە کە بە دەستێک دوو شووتی هەڵدەگرم· ئاندرێزاوادا، بەڕێوەبەرایەتیی بەرنامەی چۆئایۆی بە ئەستۆوە بوو· ئادام بیلژۆسکی ناوی ئێمەی لە ڕیزی گرووپی خۆیدا نووسیبوو، بەڵام لەو کاتەدا گرینگیی ئەوتۆی بە ئێمە نەدابوو، کە بەڕێوەبەری گرووپی دئائولاگیری بە ئەستۆوە بوو کە بەڵێن درا هەوەڵی مانگی نۆوامبر کەل‌وپەلی پێداویستی گرووپەکە بەڕێبکەن کە لە کۆتایی کارەکاندا خۆم گەیاندە ئەوان، بەڵام وابزانم منیان لە بیر خۆ بردبۆوە و پێم وایە هۆکارەکەشی ئەوە بووبێ کە ئێمە نەمانتوانیبوو لە بەرنامە دارشتن و کۆکردنەوەی کەل‌وپەلەکاندا یاریدەیان بدەین· هۆکارەکەشی کار کردن لە سەر دووکەڵکێشەکان بوو کە ئەوی ڕاستی بێ من مۆڵەتم نەبوو· بەشێک لە خەرجی پێداویستمان باشگا دابووی و بەشێکیشی بۆخۆم دام· بەو جۆرەش کە کاتێک تەلەفۆنم کرد تێگەیشتم کە تەنیا کەل‌وپەلەکانی من ماوەتەوە و بەڕێ نەکراوە· بە دوو بۆشکەی پڕ بە تەنیا مامەوە، بەڵام من لەوان دێزەتر بووم· ئەوجار بە زووترین

کات نامەیەکم بۆ بیلژۆسکی بەڕێ کرد کە لە نامەکەدا داوام لێکرد ناوم لە ڕیزەکە دەرنەهاوێن هەتا خۆیان دەگەیەنمێ و لەوێ بە دوی کەڵوپەلی بەرنامەی زاوادا کەوم.

ئەو کاتەی گەیشتمە کاتماندۆ کارەکانی خۆم بەوان ڕاگەیاند و پێم گوتن دەمهەوێ دوو لووتکەی هەشت هەزاری ببەزێنم بەلام لەبەر وەی کە گرووپی دائۆلاگیری لە مەڵبەندەکەدا بوو بەپێویستم زانی کە منیش لەوێوە دەستبەکار بم،

چونکە هەتا ئەو کات بۆ بەرنامەی چۆئایۆ هیچ کارێکی ئەوتۆ نەکرابوو و ئەگەر هاتبا و منیش لەوێوە دەستبەکار ببام لەوانە بوو نەمتوانیبا لووتکەی دووهەم ببەزێنم. لەپڕێک بێدەنگییەک ڕووی دا لە دواییدا ئیرادگرتن دەستی پێکرد، ژۆگاهاینریش لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بەڕێوەبردنی کارەکان لە ئەستۆی هەمووانە، بەلام من لە گرووپەکەدا نەدەبوو بەشدار بم و گوتی کە لە دواییشدا بۆ هاتنە نێو ڕیزی گرووپەکەوە زۆر دڵنیا مەبە چونکە بۆ ئێمەش هەر دەردەسەری. کانەداییەکانیش کە لە نێو گرووپی چۆئایۆدا بەشدار بوون ڕازی نەبوون. زۆربەی برادەرانیش گوتیان لێیگەڕێن هەر کارێک دەکا با بیکا، بەلام زاوادا لە داواکەی من ڕازی بوو و ئەو داواکارییەی منی پێ باش بوو و دڵنیاش بوو کە سەرکەوتوو دەبین و بە پێکەنینەوە ڕێزم بۆ قسەکانی دانا.

ڕۆژی دوایی بە چل کیلۆ کەڵوپەلەوە بۆ پۆخارا وەڕێ کەوتم، کاتم کەم بوو و زستانی نیپالیش بۆ گاڵتە نەدەبوو. دەبوو بۆ خۆگەیاندنە خێوەتگای تایبەت ڕێگایەک بدۆزمەوە کە هەرچەند جێگای ترس بوو بەلام کاتی کارەکەمی نیوە دەکرد. بە فڕۆکەیەکی فۆگێری بیستکەسی کە بەهۆی کەشوهەوا بۆ هەڵفرین کاتێکی تایبەتی بۆ دیاری کرابا چونکە بە دوو شوێنی بەرز و ئەستەمدا تێپەڕ دەبوو کاری ئێمەی سەختتر کردبوو. جەژنی کریسمەس بەڕێوە بوو و من هێشتا ڕێگایەکی زۆرم مابوو بگەمە ژێر کێوەکە، چونکە چەند جارێک فڕۆکەکە نەیتوانیبوو هەڵفڕێ ئەوەش ببووە هۆکاری ئەوە کە ئێمە وەدوا کەوین. بۆ تێپەڕبوونی کاتی ڕۆژانە دووچەرخەی بەکرێ دەگرت و سەرتاپای شار دەگەڕام و چاویشم بە دەریای چکۆڵە و کێوی ئاناپۆڕنا و لووتکەی ماچاپۆچار دەکەوت. ئەو هۆتێلەی کە بە

نرخی یەک دۆلاری بەکرێم گرتبوو ئینسانی وەبیر کۆخی بەرازەکان دەخستەوە کە هەر جێگا خەویکی دار و میزێکی تێدابوو. بەوجۆرە دوور لە بنەماڵە و دابونەریتی خۆماڵی و ساڵی تازە بووم. بە کڕینی کەمێک ساردین و تەڕە و میوە و دروستکردنی سووپی ئالۆ، جێژنێکی چکۆڵەم بۆخۆم گرت. لەو جێژنەدا کتێبی موقەددەس و هێندێکیش شیرنیم بۆ مدفەڕک لە لا بوو کە دەبوو بە خێر بیدەم بە خەڵک، بەلام بەداخەوە تەنیا بووم و بێجگە لە هەموو پەژارە و فرمێسک هەڵوەران شەمێکیش داگیرسابوو هیچی تر کە دەروونی ئێمەی گەرمتر دەکرد. جارجار کەلوپەلەکانم کۆ دەکردەوە بەلام بەهۆی تێکچوونی کەشوهەوا دیسان دەگەڕامەوە هۆتێلەکە. ئەگەر هەر لە یەکەم ڕۆژەوە بەپێیان وەڕێ کەوتبام وابزانم دەگەیشتمە شوێنی دیاریکراو. بەو جۆرە لەپڕێک هەلێک ڕێک‌خسترا و بە فڕۆکەیەک وەڕێ‌کەوتین کە بە دۆڵێکی دوورودرێژدا تێپەڕ بوو. فڕۆکەوانەکە هەر داوای لێبووردنی لە خەڵکەکە دەکرد، بەهۆی کۆنی فڕۆکەکەو و چۆنێتی دۆخی هەوا، بای توندیش هەر فڕۆکەکەی ڕادەژاند کە هەر بەو هۆیە بەڵێنیم بە خۆم دا هەتا کاتی مردن سواری ئەو جۆرە فڕۆکانە نەبمەوە. دوو گەشتیاری ئامریکایی و تاقمێک لە خەڵکی شارەکە کە هێندێکیان قەفەزی داری پڕ لە باڵندەیان بە دەستەوە بوو هاوڕێیانی فرۆکەکە بوون. بەو شێوەیە بە ترس و لەرزەوە مالاواییمان لە فڕۆکەوانەکە کرد و دەستبەجێ بە دوای کۆڵهەڵگرێکدا گەڕام. بە دوای کەسێکەوە بووم کە بەباشی ڕێگا بەڵەد با و لە چۆنێتی زستانیش شارەزا با و بێجگە لەوانەش ددان‌تیژ نەبایە و هێندێکیش لە بیری گیرفانی ئێمەشدا با. ئەگەرچی لەو وەرزەدا زۆر کەم کەسێک بۆ کێو دەچوون، ئەوەش ببوو بە هۆی گرفتێکی تر بۆ بەدەستهێنانی کۆڵکێشێکی ئاوا. دوای دوو کاتژمێر تازە لاوێکم دۆزیەوە کە دەیگوت ئەگەر پێویست بێ چێشتیشتان بۆ دروست دەکەم، بەلام نرخەکەی دووبەرابەری کۆڵکێشێکی هاوین بوو. هەرکە وای گوت بێ هیچ قسەیەک ڕازی بووم و بیست و پێنج کیلۆم لە کۆڵەکەی ئەو خست و پازدە کیلۆشم بۆخۆم دەست دایە و وەڕێ‌کەوتین. دەبێ بڵێم هەتا گەیشتینە ئەو شوێنەی کە فەڕەنسیکان لێی تێپەڕ ببوون، زۆر بەباشی و بێ هیچ گرفتێک لێی تێپەڕ بووین و هەر لەوێ من چێشتم لێنا و کۆڵهەڵگرەش چای لێنا کە زۆرم بەدڵ بوو.

هێشتا نەگەیبووینە شوێنی بەفرە زۆرەکان و شەوێکی ساردمان ڕابوارد تێگەیشتم کە دەبێ دەست بە خواردنەکەمانەوە بگرین. هەرکە گەیشتینە بەرزایی ٥٢٥٠ میتری، وردە وردە کۆڵکێشەکە لە من وەدوا کەوت، لە سەر ڕێ ڕاوەستام و بەشی ڕێگاکەی ترم لێ پرسی، بەلام وابزانم ماوەیەکی زۆر بوو بێرەدا تێپەر نەببوو چون زۆر بەباشی پێی‌نەدەزانی. ئەوجار ناچار بووم بڕوانمە ئەو نەخشەیەی کە پێم بوو، بەلام ئەویش زۆر ڕوون نەبوو و کۆڵهەلگرەکەش ناچار دەبوو لەگەلمدا بمێنێ و بە دوامدا بێ و نەیدەتوانی لەو کوێستانەدا هیچ بکا. هەرکە شەو خێوەتمان هەلدا شێوازی کارەکەمان گۆڕا، دەبوو چاوەدێری لە کۆلکێشەکەش بکەم، چووبووە نێو کیسەخەوکەیەوە و ئیتر نەیدەتوانی هیچ کارێک بکا. ڕۆژی دوایی ڕێگای پڕ بەفری لای دامبۆشم هەلبژارد و چون لە ڕێگادا هەر دەهات و لێم دوور دەکەوتەوە، بەشی پتری کەل‌وپەلەکانم لێ‌وەرگرت و بۆخۆم هەلمگرت. ئەو ڕێگایە لە نێو نووسراوکانی شاخەوانیدا ناوێکی تریان پێدەگوت کە لێرەدا من لەگەلی ڕووبەڕوو ببوومەوە. دەشتێکی زۆر کە دەتوانم بلێم ٢ کیلۆمیتر درێژایی بوو و پڕیش بوو لە بەفر کە هەر چۆنێک بێ لێی تێپەڕ بووین. دەتگوت لە کۆتایی ڕێگای هەشت هەزار میترییەکداین، هەنگاو بە هەنگاو گەیشتینە سەر سەهۆلەکان کە سێ یان چوار کیلۆمیتر دەبوو کە خێوەتگای تایبەتی دائۆلاگیری لەوێ بوو. بەلام دۆزینەوەی شوێنی خێوەتەکان زۆر هاسان نەبوو. من لای خۆم بیرم کردەوە کە باشترین شوێن هەلبژێرم بۆ خێوەت هەلدان و بۆ لای ئەوێ وەڕێ‌کەوتم لە ڕێیە چاوم بە قوتووی بەتالی خواردنی لێهستانییەکان کەوت و تێگەیشتم کە بەهەلە نەچووم، بەلام هیچ کەس لەو شوێنە نەبوو. کەوتمە لێکۆلینەوە لە بیرمدا دەمگوت بۆ دەبێ لێرە نەبن؟ لەوانەیە کۆتاییان بە کارەکە هێنابێ و گەڕابنەوە. کۆلکێشەکەم کەمێک دوورتر لە من دەهات و من بە ناهومێدی بە دەوری خۆمدا دەمڕوانی کە لەپڕێک چاوم بە یانوژشوورک و ئاندریچۆک کەوت. خۆم شاردەوە و چاوەڕوانی نیزیک بوونەوەیان بووم. هەرکە لێم نیزیک بوونەوە دەرپەڕیمە دەر و گوتم بێ‌دەنگ ڕاوەستن و پەساپۆرتەکانتان دەربێنن. جارێک لە سنووری چەکۆسلاواکی ئاوا لەگەل ئێمە جوولانەوە، لە جێی خۆیان نەبزووتن و بێ‌دەنگ ڕاوەستان، کاتێک چاویان بە من کەوت هاتن بۆ لام و لاچاویان

ماچ کردم و زۆریان بەخێر هێنام. لەدواییدا بە زووترین کات بەڵێنیان دا کە بە جێگای ڕێپێوان لەگەڵ من بگەڕێنەوە خێوەتەکانیان. ئەوجار لێم ڕوون بۆوە کە هێشتا لووتکەیان نەبەزاندووە و تەنیا توانیویانە خێوەتگای دووهەم هەڵدەن کە بۆ من جێگای خۆشحاڵی بوو. هەر لەوێ هێندێکم پارە دا بەهاوڕێکەم و بەڕێم کردەوە خوارێ. بەخۆشییەوە هەتا ئێرە کۆتاییمان بە ڕێگاکە هێنابوو، پێم گوت لە ڕێگادا وشیار بە و بە شوێنی باشوور کە بێ مەترسییە بگەڕێوە خوارێ و هەوڵ بدە لە شوێنە ئەستەمەکان خۆ بپارێزە.

خێوەتگای تایبەت زۆر لە خوارەوەی ئێمە و لە دۆڵێکدا کە دەوروبەری هەموو دارستان بوو جێگیر ببوو، بەلام خێوەتگای دووهەم لە پێش ئێمە و لە پشت شاخێکی گەورەدا شاردرابۆوە و بە هاسانی نەتدەتوانی بیدۆزیەوە. ڕنوو زۆربەی خێوەتەکانی خێوەتگای تایبەتی لەگەڵ خۆی بردبوو بەلام ئەو شوێنە وا بزانم باشتر بوو چونکە لە جێگا ڕژدەکانی کێوەکانی دەوروبەری دوورتر بوو.

وا دیار بوو هیچ قسەیەک لە ڕێگای تازە و بۆ لووتکە بەزاندن نەکرابوو و منیش کە هاتبوومە نێو گرووپەکەوە نەمدەتوانی هیچ هەوڵێک لەخۆم نیشان دەم. وا باشە ئەوەش بڵێم کە هێشتا کارمان زۆر مابوو و ڕێگایەکی دووروودرێژمان لە پێشدا بوو و بارەکانیش هێشتا نەگەیبوونە ئێمە و تەنیا توانیبویان هەتا بستووی پێش خۆمان کە لە بەرزایی ٥٧٠٠ میتریدا بوو بێنە سەرێ. هاتنیساڵی تازەش ئێمەی وەبیر ئەو ڕۆژانە دەخستەوە کە لەگەڵ ئاندرێ و یانۆژ بەیەکەوە کێبەرکێی سوورتمەسواریمان دەکرد، بەلام لێرە سارد و سەرما بە ڕادەیەک بوو کە نەماندەتوانی بۆ خۆشی بارینی بەفری ساڵی تازە بچینە دەرەوە. ئەو سەهۆڵانەی کە لەسەریان خەوتبووین ئەوندە سارد بوون کە مۆڵەتی نەداین چێژنێک بگرین کە وەک شەوێک بیرەوەری بۆ هەمیشە لە لامان بمێنێتەوە و نەمانتوانی زۆری کەلک لێ وەرگرین زۆر. زوو چووینە نێو کیسە خەوکانمانەوە. بۆ ڕاهاتن لەگەڵ کەشوهەوای مەڵبەندەکە هێندێک نیگەران بووم، چونکە ئەوان ماوەی سێ حەوتوو بوو کە لەو بەرزاییانەدا دەژیان و من تازە لە بەرزایی ٥٢٠٠ میتری تێپەڕ ببووم. بەو حاڵەش لە ڕێپێوانی دووهەمی ژانوییەدا پێبەپێی ئەوان وەڕێکەوتم. گرفتی دائۆلاگیری سەهۆڵەکانی

بوو کە بە ڕادەی ئەڵماس سەخت بوون کە ئەوە جیا لە بارینی بەفرێک کە لە هەموو شوێنێک دەبیندرا نیشانەی بای توند لە شوێنەکەدا بوو· لە نیوەشەو و کاتێک بەفر هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو زۆر بەسەختی توانیمان خۆمان بگەیەنینە خێوەتگای دوو کە هەوایەکی زۆر ناخۆشی هەبوو· ڕۆژی دوایی بەهۆی بارینی بەفر و تەپومژێکی زۆر نەمانتوانی هیچ کارێک بکەین و هەروا هەر درێژەی هەبوو· زۆر جار هەتا سەر سینگمان دەچووینە نێو بەفرەوە· ڕووداوەکە زۆر ئەستەمتر لەوە بوو کە بیرمان لێدەکردەوە· بەو جۆرە هۆکارە سەختەکەشی هاتنی ئێمە بۆ کێوەکان بوو· چۆنیەتی دەروون و لەشی خۆم خستە ژێر چاوەدێریەوە، ئەو کاتەی کە هاتبووم بۆ ئێرە دڵم ٧٠ جار لە خولەکدا لێیدەدا و لە زۆربەی کاتەکان وا بوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی چەند حەوتوو و خووگرتن بە کەشوهەوای مەڵبەندەکە، هاتە سەر ٤٨ لە خولەک· دوو ڕۆژ مانەوە لە خێوەتگای دووهەم هیچ کەلکی نەبوو و بەرەو خواربووینەوە· ئەوجار جێگامان لەگەڵ ئەو کەسانەی لە خێوەتگاکە بوون گۆڕییەوە و ئەوجار کە گەڕاینەوە خێوەتگای دووهەم، توانیمان خێوەتگای سێهەمیش هەڵدەین· ئەوجار منیان بۆ پێشاهەنگی ڕۆیشتن هەڵبژارد و توانیمان لە بەرزایی ٧٠٠٠ میتری خێوەتگای چواریش هەڵدەین، هێندێک لە لووتکەکە دوور بوو بەڵام لەو بڕوایەدا بووین کە دەتوانین لەوێوە لووتکەکە ببەزێنین· لە ئێوارەی ڕۆژی دوایی گەیشتینە نیزیک هەشت هەزار میتری و لەوێ زانیمان ناتوانین لووتکەکە ببەزێنین· یانۆژ قسەی دەپەڕاند و بە دوای ئەودا هەموومان گەڕاینەوە خێوەتگاکەمان و لەوێشەوە گەڕاینەوە بۆ خێوەتگای تایبەت· ئەوەی ڕاستی بێ هاتنی با ئازاری دەداین، بەڵام ڕێگاکەمان بەباشی دەدی و کاتێک هەوروهەڵا بوو و باش نەدەهات ئێمەش باش بووین، بەڵام· پتر لە پازدە میتر پێش خۆمان نەدەبیندرا· ڕێگای باکووری ڕۆژهەڵاتی دائۆلاگیری زۆر سەخت نەبوو و دەتوانم بڵێم لە ئاناپوڕنا ڕاحەتتر بوو، بەڵام لە دوای ڕەوەزە سەختەکە یانی ئەو جێگایەی کە دەگەیشتە بەردەلانێک، نەماندەزانی ڕەوەزەکە درێژە بدەین یان دەوری لێدەینەوە· لە خێوەتگای تایبەت بەڵێنمان دا کە خێوەتگای چوار کەمێک بەرینە سەرێ و لە نێوەڕاستی مانگی ژانوییەدا بووین کە بیرم لە چۆنایۆشی دەکردەوە· کات و ساتێکی

زۆرمان نەبوو، مانەوە لە خێوەتگای چوار و وەڕێکەوتن بۆ لووتکە لە لایەکی تر. ئەگەر من و ئاندرێ و یانۆژ سێبەسێ لە گرووپێکدا باین لەوانە بوو ئەوانی تر نەتوانن لووتکە ببەزێنین و بۆ ئەوەی کارەکە باشتر بەڕێوە بچێ ئادام بیلژۆسکی بەڵێنی دا کە یانۆژ کە کەمێک بێ هێز بوو لەگەڵ ماچینگ خێوەتگای چوار بەرنە سەرتر و من و ئاندرێش بە ناوی بەزاندرانی لووتکە هەڵبژێردراین. یانۆژ لەگەڵ ئەو هەڵبژاردنە ڕازی نەبوو ڕەتی کردەوە، بەلام داوای بەڕێوەبەری گرووپ بوو و نەیتوانی هیچ بڵێ بۆ خێوەتگای چوار وەڕێکەوتن. بەلام ساردی و ناخۆشی هەوا بە جۆرێک بوو کە نەیانتوانی لە خێوەتگای چوار بچنە سەرێ. ڕۆژی دوایی من و ئاندرێ لەگەڵ مێریک کە وەکوو سێهەمین پشتیوانی ئێمە بوو لە خێوەتگای سێهەم وەبن بەفر کەوتبوو تێپەر بووین و خۆمان گەیاندە خێوەتگای چوار لە هەوڵی ئەو دابووین کە خێوەتەکە بەرینە سەرتر بەلام لەپڕ بەفرێکی زۆر خزی و ئێمەی کشاندەوە دواوە دەتگوت دەخنکێین، هێستا هەر مابووین کە من هاوارم کرد و بە دوای چەقۆیەکدا دەگەڕام کە ئاندرێ ئارامی کردینەوە و گوتی بە لادانی بەفر دەتوانین خۆمان ڕزگار کەین و پێویست ناکا خێوەتەکە بدڕێنین. هێندێک هەوڵم دا و هەلاتمە دەرێ و چاوم بە ڕائۆ کەوت، ئاندرێ پێلاوکانی لەبەر نەکردبوو و مێریکیش دەستەوانەکانی پێ نەمابوو کە جێگای نیگەرانی بوو و وا دیار بوو کە پێش ئەوی سەرکەوتوو بین گەیبووینە کۆتایی ڕێگا، بەلام دیتم کە خێوەتەکە بەتەواوی تێکنەقرماوە تیرەگەکانیش نەشکاون. دوای دوو کاتژمێر توانیمان خێوەتەکە لە ژێر بەفر بێنینەوە دەرێ. لە وێنەی قامکەکانی مێریکڕا دیار بوو بەرەو مەترسی دەچووو، بەو هۆیە ئەو بەرەو خوار بۆوە و ئێمەش بەرەو لووتکە وەڕێکەوتین و لە کۆتایی ڕۆژئاوابووندا بەسەختی دەوروبەرمان دەدیترا و تەنیا کۆڵەنگ و کرانپۆنەکانی یەکترمان دەدی. گەیبووینە بەرزایی ٧٧٠٠ میتری کە لەوێ خێوەتێکی شپرزەمان لە ڕێگایەکی باریک هەڵدا، بەوجۆرە هێشتا هەموو گرفتارییەکانمان کۆتایی پێنەهاتبوو، وا دیار بوو بەیانی کاتێک کە ڕنوو هاتبوو، بەنێو گێترەکانی ئاندرێدا بەفرێکی زۆر چووبووە نێو لاقی و قاچەکانی کەمێک سەرما بردبووی (گێتر شتێکە کە بە جێگای زەنگاڵی کوردی دەبەری دەکەن)، بەلام حەزی نەدەکرد

بگەڕێتەوە خوارێ و بە هیوای دەستپێکردنەوەی ڕۆژی دوایی چووینە نێو کیسەخەو.

بەهۆی بارینی بەفری زۆر لە باشترین کاتدا تەنیا دەتتوانی هەر سەد میتر ئەولای خۆت ببینی. ڕەوەزی کێوەکەمان زۆر بەسەختی دۆزییەوە، بایەکی زۆر توندی دەهات، بەلام ئێمە نەپرینگاینەوە و درێژەمان بە ڕێگا دا و لە ڕژدێکی تکنیکیدا کارەکەمان دەکرد کە تێکەلاو بە بەرد و سەهۆڵ بوو و بەردەلانەکە پلەی سەختی دوو ، سێ تەنانەت چواریشی نیشان دەدان وەک ڕەوەزەکانی تاترا پێیدا وەسەر دەکەوتین. ڕەوەزەکە وێنەی مشارێکی بەخۆوە گرتبوو و ڕێگاکە بە نێو قەڵشە سەهۆڵ و بەردەلاندا تێپەڕ دەبوو. وردە وردە لووتکەمان لێ وەدەرکەوت کە دەبوو بەرزترین شوێنی کێوەکە لە ڕێگادا کە لە یەک یان دوو تەپکی تریش تێپەر بووباین. پشویەکمان دا و تێگەیشتین کە هێشتا بۆ لووتکە کەمێکمان ماوە، بەلام کاتژمێر ٣ی دوای نیوەڕۆ و بەتەواوی لێمان ڕوون بوو کە لە سەر لووتکەکە ڕاوەستاوین. بایەکی توندی دەهات، ڕدێنی ئاندرێ بە هۆی ساردی هەوا سەهۆڵ بەستبووی، دەزانم کە منیش وێنەم لەو دەچوو. هەوڵی دا بێسیمەکە دەربێنێ کە گوتم دەست هەڵگرە، لە خوارێش دەتوانین پەیوەندییان لەگەڵ بگرین. چەند وێنەیەکمان گرت و دووبارە حەزی کرد سەرکەوتنی کارەکەیان پێ ڕابگەیەنێ کە گوتی ئێمە لووتکەمان بەزاند. دیار بوو خۆشحاڵی ئەوانمان لە نێو بێسیمەکەدا گوێ لێدەبوو، بەلام کاتژمێرەکەمان بەباشی چاو لێنەکردبوو، کاتژمێر ٣ نەبوو بەڵکوو ٤ی ئێوارە بوو. ئەوجار بێسیمم لە دەستی ئاندرێ وەرگرت و بەتوندی گوتم ئێمە دەبێ بە زووترین کات بڕۆینەوە خوارێ و ماڵ ئاوایم کرد و بێسیمم لە نێو کۆڵەکە خست و وەڕێکەوتین. زۆر درەنگ بوو، دەوروبەرمان تاریک داهات، لەو بیرەدا بووین کە لە کوێوە بڕۆینەوە خوارێ، چونکە ڕژدێکی زۆری تێدا بوو و لە شەویشدا ڕێگابڕین سەخت بوو و لەوە دەترساین ئەگەر لەوە زیاتر بڕۆینە خوارێ لەوانەیە بگەینە داوێنی بەردەلانەکە کە لەوێ تووشی هەڵدێرێک دەهاتین. بەو هۆیە داوام لە ئاندرێ کرد کە وا باشە بمێنینەوە، ماینەوە و دەستم کرد بە هەڵکۆڵینی بەفر بۆ شەو تێدا مانەوە، بەلام بەفرەکە وەک تۆز بوو و بۆمان کۆ نەدەبۆوە و هەر لێک بلاو دەبۆوە. کاتژمێرێک لەگەڵی خەریک بووم بەلام بێکەلک بوو.

بە دوای ئاندرێدا وەڕێکەوتم کە وامدەزانی ڕێگای سەر ڕەوەزەکەی دۆزیوەتەوە، بەو جۆرەش بە کەلک وەرگرتن لە تەناف نەمانتوانی درێژە بە ڕێگا بدەین بەم شێوەیە چوونە خواریشمان بێکەلک بوو و لەوانەش بوو کاری بەیانیشمان لێ سەختتر بکا˙ بەو هۆیە ئەو شەوە وای لێکردین کە لە سەرمای چل پلە لە ژێر خاڵ، ناچار پاڵمان وەکۆڵەپشتییەکانمان دا وماینەوە و دەبوو هەتا سیوادی بەیانی خۆ ڕاگرین˙ بیر و خەیالات وای ئازار دەدام کە زۆر جار خولەکێکم بە چەند کاتژمێر لێ تێپەڕ دەبوو˙ ئاخری ڕووناکی داهات و ئێمە بەرەو خوار بووینەوە و توانیمان لە نێو کاتژمێردا خۆمان بگەیەنینە خێوەتەکە˙ بە زووترین کات پەیوندیمان لەگەڵ برادەران گرت چونکە دەمانزانی کە چاوەڕوانی ئێمەن˙ لەو پەیوەندییەدا تێگەیشتین کە بەڕێوەبەری گرووپ دوای حەڤدە ساڵ قەدەغەکردنی جگەرە دووبارە دەستی بە کێشان کردۆتەوە و چۆنیەتی لاقی ئاندرێش باش نەبوو و هەر دەهات خراپتر دەبوو˙ زۆر ماندوو بووین و بەردەوام خەویشمان دەهات˙ پێش بەفر تواندنەوە بۆ چا، قاچەکانی ئاندرێمان بە نۆبە چارەسەر دەکرد و دەبوو هەرچی زووتر لەو بەرزاییانە هاتباینە خوار˙ بۆ ئەوەی باری تەندروستیم باشتر بێ هەرکە لە خەو هەستام زۆرم تینوو بوو، دوای ئەوە کە بەفرم تواندەوە، قابلەمەیەکم ئاو خواردەوە˙ کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆ بوو کە خێوەتەکەمان کۆ کردەوە و وەڕێکەوتین˙ بە هۆی خۆشحاڵیی سەرکەوتنمان درەنگ وەڕێکەوتبووین و بە لەبەر ئەوەی کە ڕێگا بەڵەد بووین و دەمانزانی زۆر سەخت نییە زۆر لەسەرەخۆ دەڕۆیشتین و پەلەمان نەدەکرد˙ لە سەرەتاوە لەو بیرەدا بووم کە دەتوانین خۆمان بگەیەنینە خێوەتگای دووهەم˙ نێزیک بە خولەکێک پشووم دا و دانیشتم، بەلام ئاندرێ درێژەی بە ڕێگا دا و لە بەر چاوم ون بوو˙ لەپڕ دەستی کرد بە بەفر بارین، بەجۆرێک دەباری کە نەمدەتوانی ١٠ میتر پێش خۆم بەباشی ببینم و جێ پێیەکانیشی پڕ کردبۆوە، جنێوم دەدا و دەمگوت دەزانم ئێستا ئەو لە خێوەت دانیشتووە˙ ئەوەی ڕاستی بێ دەبوو بەڕێگاکەدا بەرەو خوار نەڕۆم بەڵکوو دەبوو بە لابەلاکەدا ڕۆیشتبام و خێوەتەکەم دۆزیباوە بەلام خێوەتم نەدۆزییەوە و ئەوجار بۆ لای ڕەوەزەکان گەڕامەوە و بەرەو خوار وەڕێکەوتم˙ توانای شەوێکی ترم نەبوو لە هەوای ئازاددا

بمینمەوە و هیچ هەواڵێکم لەئاندریش نەبوو. بۆ ڕزگاربوون لە مردن تێدەکۆشام و پێویستیم بە خواردنێکی گەرم بوو. ڕێگاکە هەر دەهاتوو ڕژدتر دەبوو، کوڵەنگم لە زەوی دەدا بەلام هەر سەهۆڵ بوو، ناچار ڕاوەستام و کۆلەپشتییەکەم کردەوە. بە هۆی تاریکی چرا قەوەکەشم ون کردبوو. جاروبار ڕووناکاییەکم دەهاتە بەر چاو کە لەوانە بوو ئەو گوندانەی خوار کێوەکان بن. زۆر دەترسام دەستم بە هەڵقەندنی قوڵکەیەک کرد، هەر دەهات و قووڵترم دەکرد و توانای دەرهێنانی کیسەخەوەکەم نەبوو کە لە بن کۆڵەکەمدا بوو، چون دەترسام هەموو ئەو شتە وردانەی لە ژێر کۆڵەکەدا بوون هەڵڕژێن و ون بن و خۆم بەوە ڕازی کرد کە کیسەخەوەکەم تەڕە.

بەیانی کە هەوا ڕووناک بوو دیتم ڕێگاکە ئەوندە ئاسانە تەنانەت دەتوانی بە سەریشیدا هەڵێی و من دەمتوانی هەر ئەو شەوە خۆم بگەیەنمە خێوەتەکەمان، بەلام لە شەودا ناتوانی ئاوا بیر بکەیەوە، هەر ڕووناکی ڕۆژە کە ئینسان ئاقڵ دەکا. لە شوێنی خێوەتگاکە هاواری بەرزم هەموویانی خۆشحاڵ کرد. هەر لەوێش تێگەیشتم کە ئاندریش بەهۆی هاوەڕێیانی نێو خێوەتەکەوە توانیویەتی خۆی بگەیەنێتەوە لایان دەنا ئەویش ون دەبوو و کە کاتژمێر دەی شەو گەیوەتەوە خێوەتەکە، یانۆژ و مێریک لەوێ بوون و دەستەکانی مێریکیش چاک ببوونەوە. خێوەتگای دووهەمیشمان کۆ کردەوە و بە سەر بەفرێکی نەرمدا بەرەو خوار بووینەوە خۆمان گەیاندە خێوەتگای یەکەم. بۆ سێهەمین جار لە نێو خێوەتگای یەکەم و خێوەتگای تایبەتدا شەو ماینەوە، بەلام بە خۆشییەوە ئەو جارەیان هەموو جۆرە خواردنێکمان پێبوو و لەوەی کە هەوا گەرم بوو و باشی نەدەهات، کاتژمێر چواری ئێوارەی ڕۆژی دوایی خۆمان گەیاندەوە خێوەتگای تایبەت. هەرکە گەیشتینەوە، دوکتۆر لاقەکانی ئاندریی تیمار کرد کە هۆکارەکەی سەرمای پلە ٣ بوو. ئەو بەرێزانەی کە لەوێ بوون، لەوەی کە خواردنمان بەرەو تەواوبوون دەچوو زۆرتر چێشتی ئاوەکیان دەخوارد و گۆشت و خواردەکانی تریان بۆ من دەهێشتەوە. بە خواردنی ئاخرین چێشت کاری بەرێزان کۆتایی پێهاتبوو بەلام بۆ من ٨١٦٧ میتر بەفر و مژ تازە دەستی پێدەکرا و کاری دووهەمم لەپێشدا بوو. گیاوگوڵی سەرسەوز و برینجی گەرم لە کۆتایی دۆڵەکەدا چاوەڕوانی دەکردم، کۆڵەم خستە سەر پشتم و وەڕێ کەوتم.



## بەشی ٩

**نێردیوانی شکاو**

**چۆئایۆ ، ردوەزدکانی باشووری رۆژهەلات لە زستانی ١٩٨٥**

ئەو کەل وپەلانەی کە پێویستم بوون وەک خێوەت، کیسەخەو، چرای چێشتلێنان، جلوبەرگی گەرم، خواردن و... هەموویانم لە نێو کۆلەکەم خست و هەر بەو کۆلەبارە ٢٥ کیلۆییەوە بۆ ئەوەی کە خۆم بگەیەنمە ڕێگای بەزاندنی لووتکەی چۆئایۆ، دبوو سنووری ڕێگای فەرەنسییەکان تێپەڕ کەم. لە گەڕانەوە لە لووتکەی دائۆلاگیری، لاقەکانم کەمێک سەرما بردبوونی بەلام بە ئەندازەی قاچەکانی ئاندری کۆلەوار نەبوون. کاتێک دوکتۆر لاقەکانی ئاندرێی تیمار کرد من ڕووداوەکەم لێ شاردەوە و پێم نەگوت.

بە هۆی کەمبوونەوەی ماوی بەزاندنی چۆئایۆ کە ڕۆژی پازدەی فێورییە کۆتایی پێدەهات، بەڵێنم دا بە جێگای ئەوەی کە بگەڕێمەوە کاتماندۆ، سنووری ڕێگای پڕبەفری فەرەنسییەکانم هەڵبژارد کە لە سەر ئەو بڕوایە بووم کە زۆر سەخت نەبێ بەلام زۆرتر لە بەفردا نوقم

دەبووم کە وەگریانی خستبووم و دەبوو بە هۆی دواکەوتنم، بەلام هەر ئاوا تێکۆشام و نەپرینگامەوە· ئەوجار لە ڕێگاکە بەهۆی توشبوون بە بەردەلانێک توانیم باشتر بڕۆم، بەلام بەداخەوە هەرکە گەیشتمە سەر بەردەکان، تێگەیشتم کە بەفری نێو ئەو بەردانە زۆرتر لەوەیە کە من بیرم لێ دەکردەوە· مەلّبەندەکە پڕ بوو لە دار و دەون کە لە خوارەوی من بوو و ڕووم تێکرد و بۆ نێو دارستانەکە وەڕێ کەوتم·

هەموو شەوێ برینی لاقەکانم دەرمان دەکرد و دەمپێچاوە· بەو ڕادەیەی کە لێیمدەزانی بلۆقەکانم دەدڕاند، کێماو و خوێنێکی زۆریان لە بەر دەڕۆیشت، ئەمجار بەباشی دەمشۆردن و دەمپێچانەوە پێلاوکانم دەکردنە بەر و وەڕێدەکەوتم· ئاخری خۆم گەیاندە دارەستانەکە و لەویش بەفرەکە هێشتا هەر زۆر بوو· تووشی هێندێک جێ شوێنی پێ بووم و بیرم لێکردەوە کە ئەگەر گیانلەبەر بێرەدا تێپەڕ ببن منیش دەتوانم بەو ڕێگایەدا بڕۆم· جێپێیەکان زۆرتر وەک جێپێی ئاسکەکێوی دەچوون نەوەک بەبر· وردە وردە ڕێگاکە خۆشتر دەبوو· هێندێک کە ڕۆیشتم گەیمە گوندێک بە ناوی موورفا· جێپێیەکان وایان نیشان دەدا کە پێشتر کەسێک بێرەدا تێپەڕ بووە· کابرایەک چاوی تێبڕیبووم کە دەمزانی باوەڕ ناکا لە کوێوە هاتووم· ئەو کابرایە خاوەنماڵێک بوو کە بە لای ماڵی ئەواندا تێپەڕ دەبووم بڕوای نەدەکرد من لووتکەی دائۆلاگیریم بەزاندووە و بە سنووری ڕێگای فەڕەنسییەکاندا بە تەنیا هاتوومە ئەو گوندە· وابزانم لە لای خۆی گوتی لێیگەڕێ با دڵی بەو قسانە خۆش کا، بەلام زۆر بە ئەسپایی گوێی بۆ قسەکانم شل کردبوو· ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر لە لیهستان ئەو قسانەم بۆ کەسێک گێڕاباوە دەستێکی بە سەری دادێنام و منی وەک بێئەقڵێک دەهاتە بەر چاو· ئەو کابرایە لە نێو قسەکانی مندا جاروبار وای نیشان دەدا کە بۆ ئەو زۆر سەختە بڕوا بکا کە لەو وەرزەی ساڵا کەسێک بتوانێ دائۆلاگیری ببەزێنێ و بە ڕێگای فەڕەنسییەکاندا بێتە خوارێ·

حاڵ و هەوایەکی خۆشم هەبوو، لە قەراغ ئاوری گەرم دانیشتبووم و برینج و چام دەخوارد و بیرم لە شەوانی ساردی دائۆلاگیری دەکردەوە کە دەنگی ڕادوییەکم گوێ لێبوو کە دەیگوت گرووپێکی لیهستانی بە ناوەکانی ئاندرێ جووکۆیۆ و جێرزی کۆکۆشکا بۆ یەکەم جار لە لیهستان لووتکەی دائۆلاگیرییان بەزاند· لە سەرەتاوە بەباشی

لە قسەکانی ڕادیۆ تێنەگەیشتم کە بە چ شێوەیەکی ناڕاست ناوی ئێمەی خوێندەوە، وابزانم لەبەریان گران بوو ناومان بەڕاست بە سەر زماندا بێنن، زۆرم بیر لێ نەکردەوە، بەلام ئەوەی کە بۆمان جێی سەرسووڕمان بوو، گۆڕینی قسەکانی کابرا لە نێو گوندنشینەکاندا بوو کە ئەو جار لە بارەی مندا بەڕاستی دەدوان و بۆ جارێکی تریش چای گەرمیان بۆ هێنام.

هەرکە گەیشتمەوە شار تێگەیشتم کە تا سێ ڕۆژی تر فڕۆکە نییە. بەو هۆیەشەوە کەمێک نیگەران بووم ئەگەرچی لاقەکانیشم زۆریان ژان دەکرد، بەلام نەمتوانی ڕاوەستم و بە زووترین کات کۆلهەلگرێکم وەدەست خست و بێ ئەوەی کە پارەی زیادی بدەمێ وەڕێ کەوتم. بە شێوەیەک دەڕۆیشتین کە ڕێگای بوخارا ئەگەر حەوت ڕۆژ دەخایەنێ، ئێمە بە سێ ڕۆژ تێپەڕمان کرد. هەرکە گەیشتینە جێ زۆر زوو ئۆتۆمبیلێکمان گرت و خۆمان گەیاندە پاسەکان و بێ ڕاوەستان تەنانەت بۆ خواردنەوەی ئاوێکی ساردیش سوار بووین و بۆ کاتماندۆ وەڕێکەوتین. هەرکە گەیشتینە وێ بە زووترین کات چوومە ئاژانسی گەشتیاری و پەیوندیم لەگەڵ خێوەتگای چۆئایۆ گرت. هەر دڵەخورپەم بوو پەیوەندیم پێکردن و گوتم: گرووپی لیهستانی چۆئایۆ؟ دووجار هەر ئاوا دووپاتەم کردەوە. لە نێو خشەخشی پەیوەندییەکەدا دەنگێکی ناسراوی لیهستانی وەک «یاسیک ئۆلگ»م گوێ لێدەبوو کە لە خێوەتگای تایبەت مابۆوە. زۆر بەباشی ئێمەی وەرگرت و گوتی بە زووترین کات فڕۆکەیەک بگرە وەرە بۆ لۆکلا، چاوڕێتین، تەواو.

فڕۆکەکانی لۆکلا پڕ بوو لەو گەشتیارانەی کە بۆ خێوەتگای تایبەتی ئێوێرێست دەچوون و وەگیرکەوتنی جێگا وا بە ئاسانی نەبوو. بەو جۆرە ڕۆژی شەشی فێورییە توانیم دوای ڕۆژێک وەدواکەوتن بلیت وەرگرم، بەلام هەرکە گەیمە فڕۆکەخانە بەهۆی پشکنینی بارەکان و وەڕێنەکەوتنی فڕۆکەکە، دووبارە بۆ هۆتێل گەڕامەوە و بەوجۆرە ڕووداوی ڕۆژی دواییش دووبارە بۆوە و ئەمجار بەخۆشییەوە لە دوایین مۆڵەت و بەو جۆرەی کە بەراوردم کردبوو توانیم سواری فڕۆکەیەک بم و وەڕێکەوم. ئەگەرچی لاقەکانم پێویستیان بە دەرمان کردن هەبوو، بەلام بێڕاوەستان کۆلهەلگرێکم گرت و لە سەرەتاوە پێم گوت کە ئێمە لە هیچ شوێنێک ڕاناوەستین. بە ڕۆژێک سێ شوێنی

مانەومان تێپەڕ کرد کە هەر یەکەی بۆ یەک ڕۆژ دانرابوون˙ شەوێک لە مالّی کۆلّهەلّگرەکە ماینەوە کە لە سەر ڕێگامان
بوو˙ هەرچەند ڕێگاشمان لێ ون ببوو، هەتا بەیانی بە خۆشییەوە لە ڕێگادا تووشی خاوەنهۆتێلێک بووین کە بەهۆی زستان و نەبوونی میوان بەرەو خوار دەبۆوە کە لەگەلّ خۆمان هەلّمانگەڕاندەوە سەرێ و شەوێکی خۆش و خۆمالّییانەمان تێپەڕ کرد˙ هەرچەند زۆرتر لە مالّ وەدوور دەکەوتین کۆلّهەلّگرەکە دلّتەنگتر دەبوو، ئەو کاتەی کەمێک نیگەرانی هێرشی بۆهێنام، دەتگوت لە ئاسمانەوە کەسێکیان هاتە خوار، هەر بەو جۆرە ئاندرێ زاواداش کە نیگەرانی ئێمە ببوو و کۆلّهەلّگرێکی بۆناردین، ئەویش بارەکەی لە کۆلّکێشەکەم وەرگرت و بێ هیچ گرفتێک درێژەمان بە ڕێگامان دا˙ ڕۆژی هەشتی فێورییە دوای نانی نیوەڕۆ گەیشتینە خێوەتگای تایبەتی چۆئایۆ˙ ژۆگا هاینریش بە پیرمەوە هات و گوتی ئەوە کوڕەکان لە سەر ڕەوەزەکانی باشووری ڕۆژهەلاّت کار دەکەن کە ڕێگایەکی تازەیە˙ دوو کەسمان بە ناوی ماسیج لە گرووپەکەدا بوو، ماسیج بەربەکا و ماسیج پاولیکۆفسکی کە لە خێوەتگای چوار مابوونەوە و جگە لەوەی کە بارەکانیان دەگواستەوە بۆ خێوەتەکانی تر، خۆیان ساز دەکرد بۆ هەولّدان بۆ بەزاندنی لووتکەی گینگچرۆباک و میرۆسلاو گاردیزسۆلیش لە خێوەتگای سێدا مابوونەوە بۆ پشتیوانی کردن و یاریدەدان و لە کۆتاییشدا هەولّێک بۆ بەزاندنی لووتکە˙ لە پەیوەندیەک کە لەگەلّ گینگدا هەمانبوو، بە باوەڕە بوو کە لەو بەرزاییەدا ماندوو بووە و دەیهەوێ ڕێگاکەی بگۆڕێ و لە ڕێگایەکی ترەوە دەستبەکار بێ˙ پێویستی نەدەکرد لەوە پتر خۆمان وەدوا خەین، هەر بۆیەش لەگەلّ ژۆگا هاینریش بەیەکەوە بۆ خێوەتگای یەکەم وەڕێکەوتین و ڕۆژی دواییش لە خێوەتگای دووهەم چاوەڕوان بووین هەتا گرووپی بەزاندنی لووتکە ڕوون بێتەوە˙ دەبێ بلّێم ڕێگایەکی هەزار میتری زۆر هاسان نەبوو، بەلاّم بەوەش ناهومێد نەبووین و لە خۆشمان ڕادەدی˙ لە ڕێگای خێوەتگای چوار چاومان بە دوو ماسیجیش کەوت کە هەوالّی بەزاندنی لووتکەیان پێدایین، پیرۆزباییم بەوان گوت بەلاّم لە دلّمدا ئێرەییم بەوان دەهات کە لە پێش مندا لووتکەیان بەزاندبوو و بۆ من زۆر جێگای خۆشحالّی نەبوو، بەلاّم چارەشم نەبوو و دەبوو لە بیر خۆمی بەرمەوە˙ هەرواش بوو و بۆیان

ڕوون کردینەوە کە چ کاتێک تەناف لەگەڵ خۆمان بەرین، چونکە لە پێش وەش پێویستمان پێی بوو، ئەگەرچی من و ژۆگا زۆربەی ڕێگاکەمان بێ کەلکوەرگرتن لە تەناف تێپەڕ کرد، بەلام وامان‌دەزانی لە نێردیوانێک دەچینە سەرێ کە زۆربەی پلیکانەکانی شکاون· بە درێژایی سێ گوریس لە ڕێگاکە لە خوارەوەی خێوەتگای چوار کەمێک ناخۆش بوو و تەنافیشمان پێنەبوو، بەلام پێچی سەهۆڵیان بە نێوانی هەر بیست هەتا سی میتر لێ داکوتابوون· کەمێک درەنگ ببوو و ئەوەش ببوو بە هۆی وەدواکەوتن و توند ڕۆیشتنمان· پێش هەوا تاریک‌بوون ئەو شوێنەمان تێپەڕ کرد، بەلام بەو شێوەیەی کە بیرمان دەکردەوە وا نەبوو بەڵکوو ئەو ڕێگایەی هەتا خێوەتەکە مابۆوە زۆر ناخۆشتر لەو شوێنە بوو کە ئێمە بیرمان لێ‌دەکردەوە· شەو داهات بەلام چراقەوکەم کز ببۆوە کە لە کاتی گۆڕینی باترییەکانی لە دەستم بەربۆوە و ون بوو· ڕێگاکە یەکسەر ڕژدێکی سەهۆلاوی بوو هەردەبوو بە هۆی تەوری سەهۆڵ جێ لاقمان خۆش کەین و بڕۆین· ئەو ڕێگایە لە تاریکییەکی زۆر سامناک‌دا تێپەڕ دەبوو و بەردەوام لە بیری کیسە خەو و چای گەرمدا بووین کە بە تەواوی فکری ئاڵۆز کردبووین هەتا گەیشتینەوە سەر لێواری ڕەوەزەکەوە·

تا لە دەست ناخۆشیی سەهۆڵەکە خەلاسیمان هات دوو کاتژمێری خایاند، لە تەواوی ئەو کاتەنەدا ژۆگا چاوەڕوانی منی دەکرد تا بە هۆی تەنافەوە ڕایگرم و بێتە سەرێ· کۆڵینگم لە بەفر ڕۆ کرد و بۆ یاریدەدانی ژۆگا دەست‌بەکار بووم· زۆر تاریک بوو و با مۆڵەتی نەدەداین تا دەنگی یەکترمان گوێ لێبێ و هەر بە هۆی ڕاوەشاندنی تەناف لە یەکتر تێدەگەیشتین· دوای ماوەیەکی زۆر هەواڵێکم لەو نەما، لە دڵی خۆمدا گوتم لەوانەیە ڕووداوێکی بۆ پێش هاتبێ، بانگم دەهێشت و هاوارم دەکرد: ژۆگا! هاهە! و هەوڵم دەدا کە ئەوە بە خۆم بسەلمێنم کە دەنگی ئەوم لە نێو هاشەی بادا گوێ لێبووە· چەند کاتژمێر تێپەڕیبوو، لەپڕ بە هانکەهانک لێم وەدەرکەوت· گوتم بۆچی ئەو هەمووەت پێچوو؟ لە کاتێکدا بە زۆری هەناسەی دەکێشا بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: لە ڕێگا لابەلاکەدا هەڵخلیسکام و سێ میتر بەربوومەوە و لە شوێنێکدا هەلاوەسرابووم تا لە دواییدا توانیم بەهۆی تەنافەوە خۆ بێنمەوە سەر ڕێگاکە· لە کۆتاییدا هەرچەند

کارەکەی سەرسوورهێن بوو خۆی گەیاندەوە من˙ لە تاریکی و لە نێو هاشەی بای توندا دانیشتبوو˙ شوێنێکمان کە جێگای دوو کەس دەبوو لە نێو بەفردا هەڵکۆڵی و خۆمان بە جلوبەرگی گەرم داپۆشی و بەو جۆرەش هەتا بەیانی لاقمان هەڵاوەسرابوون˙ هەرکە ڕووناکی داهات تێگەیشتم کە لەگەڵ خێوەتەکە هەر ٥٠ میترمان مەودا هەبوو˙ لە بیر خەوی دوێنێ شەودا بووین کە بەپێویستمان زانی بۆ ماوەیەکی کورت لە خێوەتەکەدا بحەسێینەوە˙ بەڵام بەهۆی ماندوویەتیی زۆر هەمووی ڕۆژەکە خەومان لێکەوتبوو˙

ڕۆژی پازدەی فێورییە کە دەبووە دوا ڕۆژەکانی مۆڵەتمان، لە بەرزایی ٧٤٠٠ میتریدا بووین˙ هەر لە سەرەتاوە بەهۆی ڕێگای سەخت و ماندوویەتی زۆر، لە ڕۆیشتندا گرفتمان هەبوو˙ ئەگەرچی توندوتۆڵ نەبووین بەڵام بەخۆشییەوە ورەیەکی تایبەتمان هەبوو˙ ژۆگا بە هۆی ئەو ڕووداوەی ڕۆژی دوایی و نەهاتنە سەر بۆ خێوەتەکانی سەرێ، باش بە کەشوهەوا ڕانەهاتبوو، ئەوەش کەمێک ببووە جێگای نیگەرانیمان˙ کاتژمێر چواری ئێوارەی نیشان دەداین˙ ئەگەر ویستبامان کە پێش هەوا تاریکبوون خۆمان بگەیەنینە لووتکە، ناچار دەبووین لە تاریکیدا بگەڕێینەوە خوارێ˙ ژۆگا ٤٨ ساڵی تەمەن بوو و وابزانم کەمێک لەمن شێتتر بوو، گەڕاوە بە منی گوت زۆرمان نەماوە بۆ لووتکە، هەتا ئەو جێگایەی بتوانین دەڕۆینە سەرێ، لە لێکۆڵینەوەکانمدا ئەوەم بەدەست هێنابوو کە مرۆڤ دەتوانێ بە زستانیش لە بەرزایی ٨٠٠٠ میتریدا بمێنێتەوە و زیندووش بمێنێ˙ بەهۆی لێهاتوویی ژۆگا منیش وەغیرەت کەوتم و کەوتینە سەر سەهۆڵەکانی خۆمان و بە ڕەوەزەکانی ڕێگای لووتکەداوەڕێکەوتین˙ بەهۆی ماندوویی و شەکەتبوون و هەناسەبڕکەی زۆر، هەر دەهات و کاتمان درەنگتر دەبوو˙ ڕۆژ زۆری نەمابوو ئاوا بێ و تیشکی کۆتایی خۆر، ڕەنگی زێڕینی بە هەموو شێوەیەک دەنواند˙ لەو کاتەدا بوو خۆمان گەیاندە لووتکە، لووتکەیەک بە وێنەی مەیدانی تۆپێن کە دەتگوت لە نێو دۆڵێکی سامناکەوە هاتووین و کەوتووینە سەر شوێنێکی پانوبەرین کە بۆ ئێمە خۆشییەکی تایبەتی پێوە دیار بوو˙

کاتژمێرەکەمان ٥و ١٥ خولەکی نیشان دەداین کە سەروکەلەی

ژۆگاش وەدیهات. کەشوهەوایەکی زۆر خۆشی هەبوو، دەستم بۆ لەتکە شیرنییەک برد کە وابزانم هی ئەو دوو ماسیجەی کە لەگەڵمان بوون بوو کە لە پێش ئێمەدا لووتکەیان بەزاندبوو لە بیریان چووبۆوە. تیشکی جوانی خۆر لە بەر چاومان بوو کە بە کامێرا وێنەمان لە یەکتر دەگرت. کامێراکان بریتی بوون لە سووپر هەشت کە هی من و ئاندرێ و ژۆگا بوون، بەڵام بە دانەوەی هێندێک لە وێنەکان دەرکەوت کە بەهۆی ساردی هەوا تایبەتمەندی خۆیان لە دەست دابوو، بەڵام زۆریشیان باش بوون.

جوانی وێنەی ئەو شوێنە بە ڕادەیەک بوو کە نەماندەتوانی لە لووتکە بێینە خوارێ. زۆر بەتوندی و لە ترسی مانەوە لە تاریکی شەو، بەو ڕژدە پڕ لە بەفرەدا بەرەو خوار بووینەوە. ژۆگا هەر وەدوا دەکەوت و منیش بە سەریمدا دەگوڕاند دەمگوت هەستە زووبە وەڕێکەوە، زۆر جاریش بۆخۆم لە بەفردا قوم دەبووم و جاڵە دەبوومەوە. ئەویش تۆڵەی خۆی دەکردەوە و دەیگوت هەستە وەڕێ کەوە، دەتگوت لەگەڵ یەک بەشەڕ دێین. زۆر جاریش پێویست بوو یەکتر بگرین. ترسمان لە تاریکی نەبوو و درێژەمان بە ڕێگا دا هەتا ئەو شوێنەی کە تێگەیشتم کە خۆمان بۆ ڕاناگیرێ، هەتا ئەوندەی کە لەبیرم بوو هەڵدێرێکمان لە پێشدا نەبوو، کە بە ئەسپایی ویستم جێگای لاقم خۆشکەم و خۆم ڕاگرم، هەر ویستم خۆم بکێشمە خوارێ هەڵدێررام و کەوتمە سەر سەکۆیەک، بەڵام بە خۆشییەوەهە ڕووداوێکم بۆ پێش نەهات و زیندوو مامەوە. لەو تاریکییەدا ئاوڕێکم داوە سەرێ و تێگەیشتم هەڵدێرێک بە بەرزایی پێنج میتر لە سەر ڕێی ژۆگایە. هاوارم لێکرد و پێم گوت مەیە هەڵدەدێرێی و ئاوا ئەوم ڕزگار کرد و ئەو بە لای ڕاستی هەڵدێرەکەدا هاتە خوارێ بۆ لای من. بە زووترین کات خێوەتە دڕاوەکەم دەرهێنا و لە سەرمای چل پلە لە ژێر خاڵدا وەبیر لاقەکانم کەوتمەوە کە بە دوکتۆرم نیشان نەدابوون، ئەویش بەهۆی ئەوە بوو کە دەمگوت نەوەک نەهێڵێ بۆ لووتکە بچم و بۆ وەی ژۆگاش لێم پەشیمان نەبێتەوە بەویشم نەگوتبوو. لەو کاتەشدا هیچ کارێک لە دەست کەس نەدەهات. ڕۆژی دوایی تێگەیشتم کە هەر ٢٠٠ میترمان مابوو بۆ خێوەتەکان کە بە هۆی ماندووییەتی زۆر هەموو ڕۆژەکە لەوێ ماینەوە؛ یەک چێشتی لێدەنا و

یەک خەوی دەهات و وەنەوزی دەدا٠ ڕۆژی دوایی وامانده‌زانی هەموو ڕێگاکە تێپەڕ دەکەین و دەڕۆینە خوارێ بەڵام ماندوویەتییەکی زۆر بە ڕووی ژۆگاوە دیار بوو، بەو هۆیەوە هەر توانیمان خۆمان بگەیەنینە خێوەتگای دووهەم٠ لە خێوەتگای تایبەتیش هاوڕێیانمان دەیانزانی کە لووتکەمان بەزاندووە، بەڵام لە هاتنە خوارمان هەواڵێکیان نەبوو و ئەوەش ببوو بە هۆی نیگەرانی بۆ ئەوان٠ هەرچەند لە ڕێگادا بە بێسیمیش پێمان ڕاگەیاندبوون بەڵام ڕۆژی دواییش لە کاتی خۆی وەخەبەر نەهاتبووین٠ دەورووبەری کاتژمێر نۆی بەیانی بوو کە وەڕێکەوتین و لە پێش خۆمان چاومان بە چەند کەسێک کەوت کە بۆ لای ئێمە دەهاتن کە یاریدەمان دەن٠

لە کۆتاییدا شەوی نۆزدەی فێوریيە گەیشتینەوە خێوەتگای تایبەت و هەموو شتێکیان تێکنابوو و چاوەڕوانی ئێمە بوون کە خێوەتەکان کۆ کەنەوە و بگەڕێنەوە خوارێ٠ لە دوای ئەو ڕۆژانە چوار هەتا پێنج کاتژمێر بە ڕێگادا دەڕۆیشتین ماندوو و زۆریش کز ببووین، ئاکاریشمان شێوەیەکی تایبەتی بە خۆیەوە گرتبوو، بەڵام بەهۆی ئەوە کە لە بەرزایی هاتبووینە خوارێ، هێزێکی تایبەتم لە خۆمدا بەدی دەکرد٠ لە دوای بەزاندنی لووتکەی چۆئایۆ تێگەیشتم کە دەتوانم لە بەرامبەر ڕینهۆڵد میسنێردا ڕاوەستم٠ کاتێک هاوڕێکانم ئاوایان بە من دەگوت پێیان پێدەکەنیم و پێم دەگوتن لێیگەڕێن با کەمێکی تر پارە خەرج کا٠ بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر بتوانم خۆم ڕەپێش مێسنێر خەمەوە تەنیا ڕێگایەکی هەبوو و ئەوە بوو کە مێسنێریان لە کۆشکەکەی دا لە بەندیخانە کردبا و هەموو بەڵگە پێویستەکانی لووتکەکانی هیمالییایان دابا بە من و هەر جۆرێک دڵم ویستبای لە هیمالییادا بەڕێوەم بردبا٠ هەڵبەت نامهەوێ بەهانەیەک بێ بۆ ئەوەی کە کێبەرکێیەک بەڕێوە نەچێ، بەڵام بەزاندنی دوو لووتکەی هەشت هەزاری لە زستان و لە یەک ساڵدا کارێکی تازە بوو و هەتا ئێستاش لە لایەن کەسەوە بەڕێوە نەچووبوو٠ لە ڕاستیدا زۆر شتی تری تێدا بەدی دەکرا، وەک ئەوەی کێبەرکێکە کەس پێی نەزانێ و بێ بەرنامە دەستی پێبکرێ، دووهەم ئەوە کە کەسێک زووتر دەستبەکار بێ و سێهەم ئەوە کە بەزاندنی لووتکەکان لە ڕێگای خۆیانەوە و هەر بۆ بەزاندنی هەموو

٨٠٠٠ هەزارییەکان بێ و ئەوەی من بە دوایەوە بووم دەمهەویست لە ڕێگای تازەوە ١٤ لووتکە ببەزێنم، ئەوەش نەخۆشییەک بوو کە من بیرم دەکردەوە و قسەکردنیش لە سەر ئەو کێبەرکێیە ئەوە بوو کە تەنیا ژانی لاقەکانمی لە بیر دەبردمەوە چونکە پتر لە توانایان کاریان پێکردرابوو.

لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا چووم بۆ لای دوکتۆر و پێم ڕاگەیاند، کە چاوی پێکەوتن سەری سووڕما و لە دوای لێدانی دەرزی پنیسیلین سیرۆمیشی لێ وەسڵ کردم و خستمییە ژێر چاوەدێری تایبەت. کریژیسیو کە لە نەخۆشخانەی سەحراییەکەمان بوو هەموو ڕۆژێ لاقەکانی بۆ دەرمان دەکردم. خواردنیشم یاڕەماسی برژاو بوو کە یەکێک لە کۆلکێشەکان دەیدامێ و پێم لە هەموو شتێک خۆشتر بوو. لەشم پێویستی بە خواردن و ئاو بوو کە هەر دەمخوارد و دەمخواردەوە. بەیانی کەس نەبوو لەگەڵم بێ بۆ شوێنی پاسەکان. لە ڕێگا ڕۆیشتن پێویستم بە کەس نەبوو لەگەڵم بێ، چونکە شوێنە سەرما بردووەکان کاتێک کۆن دەبێ ئێش نامێنێ. هەتا گەیشتمە کاتماندۆ کەلکم لە حەبی ئێشبەر وەردەگرت و بەهۆی چۆنیەتی لاقەکانم زۆر زوو بۆ دیهلی وەڕێکەوتم تا بتوانم بۆ لێهستان فرۆکە بگرم. لە ڕێگای ئاسمانی ئێرفلووت بۆ لێهستان فرۆکەمان وەگیر نەکەوت و بە نامەی باڵوێزی لێهستان و بە چوونە لای بەڕێوەبەرایەتیش نەمتوانی شتێک بە شتێک بکەم. دە ڕۆژ بەو جۆرە مامەوە و لە هۆتێلەکان جێگام لەگەڵ مشکەکان بوو. هەر ئەوە جێگای خۆشحاڵیم بوو کە پەیوەندیم بە دوکتۆرێکەوە گرت کە زۆر مرۆڤێکی بە ڕێز و حورمەت بوو و بۆ گەشتوگوزار هاتبوو. ئەگەرچی کەلوپەلی پێویستی لە لا نەبوو، بەلام ئەوەندەی لە دەستی هاتبا بە لاقەکانم ڕادەگەیشت.

مانگی مارس گەیمەوە ماڵێ و قامکی لاقەکانم لە مەترسی ڕزگاریان بوو. لەوێ کە لە نێو منداڵەکانمدا بووم زۆر خۆشحال بووم و پتریش بە هۆی بەزاندنی کێوەکانەوە.

لەو نێوانەدا شتێک بوو کە ئێمەی زۆر ئازار دەدا کە زۆربەی برادەران ئەوەیان بە لاتاو بە من دەگوت کە دەیانگوت ڕێگای چۆئایۆ گرووپی هەوەڵ ئامادەیان کردبوو و من هەر بە نێردیوانەکەدا هەلاچوومە، هەرچەند لە کاتی بەزاندنی من و ژۆکا هێندێک لە پلیکانەکانی لە نیزیک لووتکە شکابوون.



## بەشی ١٠

**نەبەخشراو**
**نانگاپاربات، کۆکۆشکا و ١٤ لووتکەی ٨٠٠٠ میتری**
**ڕەوەزەکانی باشووری ڕۆژهەڵات، ساڵی ١٩٨٥**

بە دوای بەرنامەکانی دائۆلاگیری و چۆئایۆ، ئاگادار بوومەوە کە گرووپێک لە مەڵبەندەکانی کرالکۆ لە هەوڵی ئەوەدان کە بەرنامەیەک لە نانگاپاربات بەڕێوەبەرن؛ منیش ئەوکات لە ماڵی خۆمان بووم و نەشمدەویست لەو بەرنامەدا بەشداری بکەم، چونکە دە ساڵ لەمەوبەر لەو مەڵبەندە بیرەوەرییەکی زۆر ناخۆش بۆ من ڕووی دابوو، ئەویش ئەوە بوو کە منیان لە چوون بۆ نانگاپاربات گەڕاندبۆوە و ئەو ڕووداوە هیچ کات لە بیر من نەدەچۆوە؛ ئەوجار کاتی ئەوە بوو کە ئەوان داوا لە من بکەن، دەشمزانی کە ناوی منیشیان لە ڕیزی گرووپەکەیاندا نووسیەوە بەلام هێشتا پێیان ڕانەگەیاندبووم هەتا ڕۆژێک لە لایەن بەڕێوەبەری گرووپەکەوە تەلەفۆنم بۆ کرا و ئاگادار کرامەوە؛ ناوی بەڕێوەبەرەکەش پاوڵ موولارتیز بوو کە داوای

لێکردم لەگەڵ بەرنامەکەیان بەشداری بکەم. بەهۆی هاتوچوو کردنم بۆ نێو گرووپەکان، توانیم لە سلیزا ئەو پێداویستی و کەلوپەلانەی کە وەگیر نەدەکەوتن بەدەست بێنم. ودەستهێنانی ئەو جۆرە خواردنانە لە لای ئێمە هێندێک سەخت بوون. خواردنەکان بریتی بوون لە گۆشت، سۆسیس و میوەی ویشک کە ئۆتۆمبیلەکەی خۆم پڕ کرد و گەڕامەوە. ڕۆژی ڕۆیشتنم بەرامبەر بوو لەگەڵ ساڵوەگەڕی یاسای نێوخۆیی ئەوکاتی ولاتی لێهستان کە دەبوو بە ڕۆژی سێهەمی مانگی مەی ١٧٩١، کە خەڵک بەهۆی نارەزایەتی دەستیان بە شۆڕش کردبوو و ئەوەش ببوو بە هۆی گرفتێکی تر بۆ ئێمە. هەر بەو ئۆتۆمبیلە پڕ لە شتومەکەوە لە کراڵکۆ لە کاتی گەڕانەوەدا ڕووداوێکی تریشم بۆ هاتە پێش، ئەویش ئەوە بوو کە کاتێک دەمهەویست بەنزین لە ئۆتۆمبیلەکەم بکەم، باڵتۆکەم لە بەنزینخانە لێ بەجێما کە گشت بەڵگە پێداویستەکانیشم، وەک پەساپۆرت و پێناسە و هێندێک شتی تر کە لەوێدا بوون بەجێمان و ئەوەش بوو بە ڕووداوێکی تاڵی تر بۆم هەتا پۆلیسی بەڕێوەبەرایەتیم تێگەیاند ئەویش دوو ڕۆژی خایاند و بوو بەهۆی دوو حەوتوو وەدواکەوتنی گرووپەکە لە ڕۆیشتن و ئەو گرووپەش بە ناوی گرووپی نێونەتەوەیی ناوبانگی دەرکردبوو.

بەرپرسی بەڕێوەبەری کارەکان موولارتیز و پییۆتر کاڵمۆس بوون. دەبوو ڕێگای سێ کاتژمێر بە پاس هەتا گێلگیت و ئەو بەشەی تریش بە جیب بە نێو دۆڵ و شاخاندا تێپەڕمان کردبا. بیرەوەری هەشت ساڵ لەمەوبەرم وەک شریتێک دەهاتەوە بەر چاو. کاتێک بۆ یەکەمین جار لەگەڵ هیمالییای گەورە ڕووبەڕوو بووم، تاڵیی تێکشکانم دەهاتەوە بیر،بەلام ئەوجار وەک ئەو ڕووداوانەی کە لە نێو کتێبەکاندا بە ناوی ترس و مردن و بەزاندنی کێوەکان لە هیمالییا باسی دەکەن دەهاتە بەرچاوم. بێ ئەوەی کە خۆم بە زل بزانم بە ڕێزەوە خۆم لە وێدا دی و هیمالییاشم بە هی هەموو کەس دەزانی چ شاخەوان و چ خەڵکی تر. نانگاپاربات یەکەمین لووتکەیە کە خێوەتگای تایبەتی لە بەرزایی ٣٢٠٠میتریدایە کە بە دوو ڕۆژ دەتوانی خۆی بگەیەنی کە بە ئاورکردنەوە لە دەوروبەری خێوەتەکان جوانی دیمەنەکە دەرازێتەوە. دەتوانم بڵێم بەزاندنی ئەو لووتکەیە لە هەموو ورزەکاندا هەوڵی بۆ دەدرێ، لە گەرمای بێئامانی هاوینڕا هەتا سەرمای چل پلە لە ژێر

خاڵ کە لە بەرزایی هەشت هەزار میتریدا دەتوانی هەستی پێ بکەی· ئەو کێوە شێوەی گواستنەوەی بارەکانت بۆ هیمالییا زۆر بە باشی فێر دەکا·

ڕووداوی ماندووبوونی کۆڵکێشەکان کە دەبێ وەک ئیسترێک ڕاگوێزن بە ڕادەیەکە کە سەرت سووڕ دەمێنێ کە هەموو ڕۆژێک درێژەی هەیە· کەلوپەلەکان بریتی بوون لە خواردەمەنی، سووتەمەنی، کیسەخەو، خێوەت، تەناف و کەرەسەی پێداویست بۆ شوێنە ئەستەمەکان· وەبیرم هاتەوە کە لەو سالانەدا لەگەڵ مارک پرۆنۆیس و مانییۆس پیکۆتۆسکی، دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر نەمانتوانی لووتکە ببەزێنین و لە بەرزایی هەشت هەزار میتریڕا گەڕاینەوە و لە ٧٤٠٠ میتری، لە نێو خێوەتەکەماندا خۆمان حەشار دابوو و زۆر بەباشی دەمانزانی کە لەگەڵ لووتکە مەودایەکمان نەماوە، بەلام بەهۆی ڕێگایەکی زۆر سەخت و بەردەڵێن ڕێگامان لێ بەسترا· زۆر بەباشی لەبیرمە کە من قسەم دەپەڕاند و دەمگوت دەبێ چ بکەین؟ دووبارە بگەڕێینەوە سەرێ· بەلام مارک ئیتر هێزی نەمابوو کە درێژە بە ڕێگا بدا گوتی: ئیتر من ناتوانم، قاچەکانم برستیان لێ براوە، ماتییۆسیش کە بە چۆکدا هاتبوو گوتی: هیچ هۆمێدێکمان نەماوە کە بتوانین لووتکە ببەزێنین· ئەگەرچی هەموو کەلوپەلەکانم کۆ کردبۆوە دووبارە داوام لێکردن کە مارک لێرە بەجێ بێڵن با لاقەکانیشی بحەسێتەوە و ئێمەش هەوڵ و تێکۆشانێکی تر بکەین بەڵکوو لووتکەکە ببەزێنین· گوێگری وەلامێک بووم بۆ چوونە سەر یان بەرەو خوار بوونەوە، بەلام بێدەنگی حاکم بوو و لە سەرەتاوە وەلامی ئێمەی دابۆوە· ئەوجار من بەو جۆرە هەستی خۆم دەربڕی و گوتم: لەوانەیە بۆخۆم بەتەنیا بڕۆم بۆ لووتکە و ئێوە دەتوانن بڕۆنە خوارێ· گوتیان باش بیر بکەوە، لە نێو ئێمەدا هەر تۆ باش ماوی، ئەوەی ڕاستی بێ هەر واش بوو، لاق و دەستی مانییۆس ڕەشهەڵگەڕابوون و سەرما بردبوونی و وایدەزانی ئێتر دەمرێ و نامێنێ و مارکیش هەموو قامکی لاقەکانی لە دەست دابوون· بەو جۆرە کاتی مالاوایی لە لووتکە بوو، بەلام بۆ من ڕۆژێکی زۆر تاڵ بوو کە لە حاڵێکدا لە نێو ئەو دوو سامانە بەفرانەدا خۆمان حەشار دابوو، ئاسمان ڕوون و بێ ئەوی کە باشی بێ لەگەڵ لووتکە مەودایەکمان نەبوو کە ببوو بە داخێک لە سەر دڵم و هەر لە بیرم نەدەچۆوە· هەر وا

بیرم لێدەکردەوە کە لەپڕ هاواری مارک بیری پەڕاندم کە گوتی: هۆی تەنافەکەت تەواو بووە هەستە وەرە. لە دواییدا خێوەتمان خڕکردەوە و پاییزی نانگامان بە هەموو دیمەنە جوانەکانییەوە جێهێشت. زۆر جار ئەوە بۆ من بۆتە پرسیارێکی گەورە کە ئەگەر بەتەنیا چووبام لەوانە بوو لووتکەم بەزاندبا، ئێستاش دوای سالانێک لە وەلامی ئەو پرسیارە ئازار دەبینم و زۆرتر ئەوە دێتەوە بیرم کەچ کەش‌وهەوایەکی خۆشی بوو و بۆ کەلکمان لێ وەرنەگرت؟ لەپڕ دەنگی شۆفیرێک بیرەوەری هەشت ساڵ لەمەوبەری لە بیر بردمەوە کە ڕێگای ئێمە بەرەو کێوێک دەچوو کە جارێک لەوێ بە ناهومێدی گەڕابوومەوە. ئەگەرچی هیچ ترسێکم لەو شاخە نەبوو، بەلام هەر بەزاندنی ئەو کێوەش بوو کە دەیتوانی تاڵیی ئەو چەند ساڵەم لە بیر بەرێتەوە.

لە هەمان کاتیشدا دەبوو ئەوەش لە بیر خۆم بەرمەوە کە بەرنامەکەمان هێندێک سەختە چون بەڵێنمان دابوو کە بە ڕێگایەکی تازە و بەلای باشووری ڕۆژئاوادا وەسەرکەوین. ئەو ڕێگایە لە ساڵی ١٩٧٧دا هەوڵی بۆ درابوو کە بەهۆی کەمی کەل‌وپەلی پێداویست وازمان لێهێنابوو، بەلام ئەوجارەیان بە شێوەیەکی باشتر و کەل‌وپەلێکی زۆرترەوە دەست‌بەکار ببووین و کەسانێکی بە توانای وەک، تادیژ پییۆترۆسکی و ژۆگامان لەگەڵ بوون کە پسپۆڕێکی زۆر باش بوون و لە هیمالییادا توانایەکی بەرچاویشیان لە کاردا هەبوو. هێندێک لەو کەسانەی لەگەڵ گرووپەکەدا بوون تازەکار بوون، کە دوو کەسیان بە ناوەکانی کارلۆس کارسۆلیۆ و ئیلسا ئاویلا میکزیکی بوون، کە بە ناوی نوێنەڕانی ولاتی کاکتۆسەکان لەو بەرنامەدا بەشدار بوون کە دەبوو چاوەڕوانی ئەوە بکەین بزانین هەتا چ ڕادەیەک لە کارەکانیاندا شارەزان. لەو بڕوایەدا بووم کە لەگەڵ تادیژ پییۆترۆسکی و ژۆگا هاینریش بەیەکەوە لە یەک تەنافدا کار بکەین، بەلام زۆر زوو پێش ئەوەی کە هیچ هەوڵێک بدرێ بەڕێوەبەری گرووپ بیروڕای منی ڕوون کردەوە و گوتی ئەگەر بڕیار وابێ ئەو کەسانەی زۆر شارەزا و بەتوانان لەیەک ڕیزدابن، ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە ئەوانی تر ناتوانن لووتکە ببەزێنن. لە سەرەتاوە هێندێک قسەکانیم بە دڵ نەبوو، بەلام کە لە ڕێگایەکی ترەوە هەڵمسەنگاند، تێگەیشتم کە ڕاستە و دەبێ وابێ. ئەوی ڕاستی بێ لە نێو بەرنامەی شاخەوانی خۆماڵی، ئەوجۆرە شێوازانە زۆرن، وەک کەسانێک کە

بەهێزترن لەیەک ڕێزدا کاریان دەکرد و لووتکەیان دەبەزاند، ئەوانی تریش دەمانەوە بۆ پشتیوانی و ئاگاداربوون لە پێشهات و ڕووداوەکان· منیش ئەو جۆرە شێوازانەم زۆر بەدڵ بوو، وابزانم دەبێ واش بێ کە گرووپی جۆراوجۆر لە نێوبەرنامە کەدا باشتر بە کارەکان ڕابگەن و ئەوەش باش بوو کە منیش نارازی نەبووم· بڕوام وایە کە نابێ هەمیشە جۆرێک بیر بکەیەوە و ئەوەش ڕەچاو دەکەین، بزانین چ دەبێ· بەوجۆرە لە سێ گرووپی چکۆلەدا دابەش کراین کە تادیژ بەڕێوەبەری گرووپی یەکەم، ژۆگا گرووپی دووهەم و منیش گرووپی سێهەم· بێجگە لەوەش تادیژ پیێوترۆسکی، سێ ساڵ لەمەوبەر و لەگەڵ گرووپێکی ئالمانی بە بەڕێوەبەرایەتی هێرلیگ کۆفێر، لەو ڕێگایەدا بەشداری کردبوو، بەلام بۆ ئەوانی تر ڕێگاکە یەکەم جار بوو· ئەو لەو بەرنامەدا لەگەڵ ئاندرێ بیلۆن هەموو کاتەکان لە پێشەوە ڕۆیشتبوون و ئالمانییەکەش توانیبووی هەتا ڕەوەزەکانی نێزیک لووتکە بڕواتە سەرێ کە زۆری نەمابوو بۆ لووتکە· گرفتی نەچوونە سەریش بەهۆی هەبوونی دالانی زۆر لە ڕێگادا بوو کە زووزوو ڕنوو دەهات· ئەوەش بوو بەهۆی وشیاربوونەوەی ئێمە کە بە نێو ئەو دالانانەدا نەڕۆین و لەکاتی پێویست بەوێدا تێپەڕ بین· بەخۆشییەوە هەتا سەری ڕەوەزەکان ڕێگاکەمان لێ ڕوون بوو، ڕێگای خێوەتەکانمان بەهۆی ڕنووی زۆر لێک دوور بوون، دەتوانم بڵێم نێوان خێوەتگای تایبەت تا خێوەتگای یەکەم ١٠٠٠ میتر دەبوو· خێوەتگای دووهەم لە بەرزایی ٥٣٠٠ میتریدا بوو· لە بارەی ڕوونکردنەوەی تەنافەکانی پێویست بۆ ڕێگاکان بە هەڵە چووبووین و لێمان دەبڕا، هەر بەو هۆیە بەپێچەوانەی ویستمان بۆ بەدەستهێنانی تەناف گەڕاینەوە بۆ شاری گێلگیت·

ڕژدی و هەڵەمووتیی ڕێگاکان بەڕادەیەک بوون کە برستیان لێبڕیبووین و زۆر جار دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر لە سەر ئەو ڕێگایانەی کە لە سەرەتاوە تەنافیان لێ ڕایەڵ کرابوون هێشتا کاتمان نەدەما بۆ ڕایەڵکردنی تەنافی تر و هەر لەوێوە تەنافەکانمان جێدەهێشت و دەگەڕاینەوە خوارێ· زۆرجار بەهۆی گرێدانی تەنافە پساوەکان کە بە بەردەکان وایان لێدەهات کاتی زۆرمان لە دەست دەچوو· حەوتوویەک تێپەڕ ببوو بەلام ئێمە هێشتا کارێکی ئەوتۆمان بەڕێوە نەبردبوو· چ کارێکمان دەبا کردبا چ دەبوو بە هۆی ئەوە کە

کۆتایی بەو سەختیە بێ و ڕێگامان بۆ خێوەتگای سێش بۆ بکاتەوە. بەڵێنمان دا کە هەموو کەلوپەلە پێویستەکان بە یەک جار لەگەڵ خۆمان بەرینە سەرێ و ئەگەر پێویست بێ نەچینە خێوەتگای سێ و شەو لە ڕێگادا بمێنینیەوە. ئەوی ڕاستی بێ بۆ خۆگەیاندنە خێوەتگای سێ ئەوە بیر و بڕوامان بوو کە ٣٠٠ میتر لە پشتی خۆمانەوە و لە کۆتای تەنافەکاندا بمێنینەوە کە لە ڕژدێکی سەخت و سەهۆلاوی قوڵکەیەکی چکۆڵەمان دۆزییەوە کە جێگای خێوەتێکی دووکەسی دەبوو، بەلام ئێمە شەش کەس لە پاڵ یەک خزاین. ڕۆژی دوایی خێوەتگای سێهەممان لە بەرزایی ٦٢٠٠ میتری و لە ژێر سامانە سەهۆڵێکدا هەڵدا. بەفر دەستی بە بارین کرد و هەر دەهات و زۆرتر دەبوو و بەو جۆرەش نەماندەتوانی خێوەت بەجێ بێڵین، چونکە لەوانە بوو لە دواییدا بۆمان نەدۆزرێتەوە. ئەوجار بەڵێنمان دا کە من و ئیسلاوک بمێنینەوە و ئەوانی تر بڕۆنەوە بۆ خێوەتگای تایبەت.

هەڵمی چێشتلێنان و بارینی بەفری زۆر لە لایەکی ترەوە ببووە هۆی قورسایەکی زۆر بە سەر خێوەتەکەماندا و لەو باوەڕەدا بووین کە ئەو سامانە سەهۆڵە بۆ خێوەتەکەمان زۆر باشە و بەرگری لە هاتنی ڕنوو دەکا و هۆی هەڵدانی خێوەتەکەش لەو شوێنە هەر ئەوە بوو. بەوجۆرە بەجێی حەسانەوە هەر بەفرمان لە سەر خێوەتەکان دەماڵی و لەدواییدا خێوەتەکەمان لە سامانە سەهۆڵەکە نیزیک کردەوە. بەیانی ڕۆژی دوایی تاو هەلات و هەوا زۆر خۆش بوو. ئێمە گەڕاینەوە بۆ خێوەتگای تایبەت کە لە نێو ڕێگادا کوڵێکم دۆزییەوە کە لە سەر بەردێک هەلاوەسرابوو و بوو بە هۆی نیگەرانیمان. هەرکە گەیشتینەو خێوەتگای تایبەت لە ڕووداوەکە تێگەیشتین کە بەوجۆرە بووە، ئاندرێ سامۆویچ ڕنوو لێیداوە کە بەخۆشییەوە ڕزگاری هاتبوو و تەنیا هێندێک بریندار ببوو. هاوڕێکەی پاوێڵ مولارتیز بۆ ئەوەی باشتر یاریدەی بدا و زووتر بیباتەوە خوارێ، کوڵەکەی لە سەر بەردێک دادەنێ و بەجێی دێڵێ. ئەگەرچی هاوڕێکەمان لەمردن ڕزگاری ببوو، بەلام ئەوەش بۆ هۆی ئاگاداربوونەوەمان کە دەبوو زۆر وشیار بین. دوای حەسانەوی پێویست لە خێوەتگای تایبەت بەڵێن درا دەستبەکار بین بۆ ڕایەڵ کردنی تەنافەکان لە سەر ڕێگای خێوەتگای چوار. بەهۆی سەختی ڕێگای نێوان خێوەتگای تایبەت و خێوەتگای

دوو، بڕیار درا کە دەست لەو شوێنە هەڵگرین و شوێنی خێوەتگای سێ بۆ دەستبەکاربوون هەڵبژێرین و بەڵێنیش وابوو کە هەر لە کاتی پێویست یان کاتی حەسانەوە بگەڕێینەوە خوارێ. تادیژ و میکۆلاژ لە کەش‌وهەوایەکی زۆر ناخۆشدا توانیان ٢٠٠ میتر تەناف ڕایەڵ کەن و بەشەکەی تریان دا بە ئێمە. لە کاتی چوونەسەر بۆلای خێوەتگای یەکەم کە ئیسلاوک و کارلۆسم لەگەڵ بوون، تێگەیشتین کە خێوەتگای یەکەم بەهۆی هەرەسەوە لەبەین چووە و تەنیا دوو کیسەخەو نەبێ نەماوە. چۆنیەتی مەڵبەندەکە بە شێوەیەک بوو کە دەبوو ئێزن لە کێو وەرگرین و دەستبەکار بین. ئەو جار ڕۆژی دوایی لە ترسی ڕنوو بە شێوەی مارپێچ لە ڕێگای نێوان خێوەتگای دوو ڕۆیشتینە سەرێ. لە کاتی بەرەبەیان ڕنووەکان کەمتر دەهاتن، بەڵام لە کاتی نیوەڕۆ بەهۆی گەرمای هەتاو وەک بۆمب دەتەقینەوە و بەو هۆیە ناچار بووین هەر لە کاتی بەرەبەیاندا درێژە بە ڕێگا بدەین و زۆر جاریش لە ئێوارەدا.

ڕۆژی دوایی لەگەڵ بەفرێکی زۆر ڕووبەڕوو بووین کە چاوەڕوانمان نەدەکرد و هەتا سەرەوەی خێوەتگای سێهەم تەنافەکانمان ڕێک‌وپێک کرد و دووبارە گەڕاینەوە خێوەتگای سێهەم. ڕێگایەکی زۆر سەخت بوو و برستی لێ‌برین و کاتێکی زۆریشی لێ گرتین. بەو شێوەیە ڕۆژی دوایش لەگەڵ ژۆگا ١٠٠میتری ترمان تەناف ڕایەڵ کرد. هەر ئەو ڕۆژە لە خێوەتگای تایبەتەوە بە ناوی گرووپی دووهەم و پشتیوانی لە ئێمە سێ کەس وەڕێ‌کەوتن کە بریتی بوون لە تادیژ، پییۆتریک و میرک گاردزیلۆسکی کە ئەگەر لە کۆتاییدا ئێمە نەمانتوانی لووتکە ببەزێنین،

بەیانی ڕۆژی دوایی تاو هەڵات و هەوا زۆر خۆش بوو. ئێمە گەڕاینەوە بۆ خێوەتگای تایبەت کە لە نێو ڕێگادا کۆڵێکم دۆزییەوە کە لە سەر بەردێک هەڵاوەسرابوو و بوو بە هۆی نیگەرانیمان. هەرکە گەیشتینەو خێوەتگای تایبەت لە ڕووداوەکە تێگەیشتین کە بەوجۆرە بووە، ئاندرێ ساموٚویچ ڕنوو لێی‌داوە کە بەخۆشییەوە ڕزگاری هاتبوو و تەنیا هێندێک بریندار ببوو. هاوڕێکەی پاوێڵ مولارتیز بۆ ئەوەی باشتر یاریدەی بدا و زووتر بیباتەوە خوارێ، کۆڵەکەی لە سەر بەردێک دادەنێ و بەجێی دێڵێ. ئەگەرچی هاوڕێکەمان لەمردن ڕزگاری ببوو، بەڵام ئەوەش بۆ هۆی ئاگاداربوونەوەمان کە دەبوو زۆر

وشیار بین· دوای حەسانەوی پێویست لە خێوەتگای تایبەت بەڵێن درا دەستبەکار بین بۆ ڕایەڵ کردنی تەنافەکان لە سەر ڕێگای خێوەتگای چوار· بەهۆی سەختی ڕێگای نێوان خێوەتگای تایبەت و خێوەتگای دوو، بڕیار درا کە دەست لەو شوێنە هەڵگرین و شوێنی خێوەتگای سێ بۆ دەستبەکاربوون هەڵبژێرین و بەڵێنیش وابوو کە هەر لە کاتی پێویست یان کاتی حەسانەوە بگەڕێینەوە خوارێ· تادیژ و میکۆلاژ لە کەشوهەوایەکی زۆر ناخۆشدا توانیان ۲۰۰ میتر تەناف ڕایەڵ کەن و بەشەکەی تریان دا بە ئێمە· لە کاتی چوونەسەر بۆلای خێوەتگای یەکەم کە ئیسلاوک و کارلۆسم لەگەڵ بوون، تێگەیشتین کە خێوەتگای یەکەم بەهۆی هەرەسەوە لەبەین چووە و تەنیا دوو کیسەخەو نەبێ نەماوە· چۆنیەتی مەڵبەندەکە بە شێوەیەک بوو کە دەبوو ئیزن لە کێو وەرگرین و دەستبەکار بین· ئەو جار ڕۆژی دوایی لە ترسی ڕنوو بە شێوەی مارپێچ لە ڕێگای نێوان خێوەتگای دوو ڕۆیشتینە سەرێ·

لە کاتی بەرەبەیان ڕنووەکان کەمتر دەهاتن، بەڵام لە کاتی نیوەڕۆ بەهۆی گەرمای هەتاو وەک بۆمب دەتەقینەوە و بەو هۆیە ناچار بووین هەر لە کاتی بەرەبەیاندا درێژە بە ڕێگا بدەین و زۆر جاریش لە ئێوارەدا·

ڕۆژی دوایی لەگەڵ بەفرێکی زۆر ڕووبەڕوو بووین کە چاوەڕوانمان نەدەکرد و هەتا سەرەوەی خێوەتگای سێهەم تەنافەکانمان ڕێکوپێک کرد و دووبارە گەڕاینەوە خێوەتگای سێهەم· ڕێگایەکی زۆر سەخت بوو و برستی لێبڕین و کاتێکی زۆریشی لێ گرتین· بەو شێوەیە ڕۆژی دوایش لەگەڵ ژۆگا ۱۰۰ میتری ترمان تەناف ڕایەڵ کرد· هەر ئەو ڕۆژە لە خێوەتگای تایبەتەوە بە ناوی گرووپی دووهەم و پشتیوانی لە ئێمە سێ کەس وەرێکەوتن کە بریتی بوون لە تادیژ، پییۆتریک و میرک گاردزیلۆسکی کە ئەگەر لە کۆتاییدا ئێمە نەمانتوانی لووتکە ببەزێنین، ئەگەر ئەوان لە توانایاندا بوو بیبەزێنن·

ڕۆژی دوایی هەڵیکردە بایەکی توند و بارینی بەفریش دەستی پێکردەوە کە خێوەتی ئیسلاوک و کارلۆسی لە جێ هەڵقەندبوو· گرووپی خوارەوەش وەدوا کەوتبوون کە لە خراپترین کات یانی لە جەنگەی نیوەڕۆدا لە نێو دالانە بەفرەکان و لە نیزیک خێوەتگای یەکەم لە حاڵی ڕۆیشتندا بوون کە لەو کاتەدا ڕووداویان بۆ پێش

هاتبوو٠ پیپۆتریک وەبەر ڕنوو دەکەوێ و بەهۆی توندی ڕنووەکە لە تەناف دەبێتەوە و ڕنوو لەگەڵ خۆی دەیبا٠ تادیژ و میرکیش دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر توانیبویان خۆیان ڕزگار بکەن٠ بەهۆی ئەوە کە ئێمە زۆر لەوان دوور بووین هیچ کارێکمان لە دەست نەدەهات و تەنیا ئەو کەسانە کە لە خێوەتگای تایبەت بوون دەیانتوانی هەواڵێک لە پیپۆتریک بەدەست بێنن و هەرواش بوو٠ کاتژمێر چواری ئێوارە لە ڕێی ڕادیۆوە ئاگادار بووینەوە کە مەیتی ئەویان لە نێو بەفرەکاندا دۆزیوەتەوە٠ بەهۆی ئەو ڕووداوە غەم و پەژارە سارتاپای گرووپەکەی داگرتبوو٠ ئێمە یەکێک لە هاوڕێ خۆشەویستەکانمان لە دەست دابوو٠ ئەوجار لەوەدا مابووین چ بکەین؟ ئایا کەلوپەلەکانمان کۆکەینەوە و بڕۆینە خوارێ، یان ئەوانی تر سەختی بردنەخواری مەیتەکە لە نیزیک خێوەتگای دووهەمڕا وەئەستۆ بگرن و ئێمەش لە بیری بەزاندنی لووتکەدا بین و ئاواتی پیپۆتریک وەدی بێنین٠ ئەگەرچی بەوەش لە غەم و پەژارەمان کەم نەدەبۆوە بەڵام بەهۆی بەزاندنی لووتکە ئاواتی گرووپەکە وەدی هات٠ لە نێو ئەواندا چاوەڕوانی ئەوە بوون کە من شتێک بڵێم، بەڵام توانای گوتنی هیچ شتێکم نەمابوو٠ ژۆگا بەڕێوەبەری تکنیکی بەرنامەی بەئەستۆوە بوو و منیش لە سەر قسە و بیروباوەڕی ئەو بووم، بەڵام لە ڕاستیدا کارەکانیان بە ژۆگا سپاردبوو و بە بڕوای من نەدەبوو وا بایە، چونکە ئەو لە هیمالییادا تەنیا کاری نێوان خێوەتەکانی خوارێی پێدەسپێردرا و هەر بۆ ئەو جۆرە کارانەش تەرخان دەکرا و جاروباریش لووتکەی بەزاندبوو، و جارێکیش لە چۆئایۆ بەکارەکانی ئێمەی سەرسووڕ کردبوو٠ لەپڕ دەستی بۆ تەلەفۆن برد و گوتی ئەگەرچی غەم و پەژارەیەکی زۆر لە خوارێ بەرۆکی گرووپەکەی گرتووە، بەڵام دۆخێکی وای بۆ ئێمە پێش هێناوە کە دەبێ هەرچی زووتر دەستبەکار بین و ئیتر تەواو٠

دۆستی لەمێژینەی پیپۆتریک لەگەڵ پاوڵ مۆلارتیز، قسەی دەکرد کە دەیهەویست بەهۆی مردنی هاوڕێکەی بڕواتەوە خوارێ٠ لە کۆتاییدا دوای دوو کاتژمێر بەڵێن درا کە ئەو کەسانەی لە خوارەوەی خێوەتگای چوارن، مەیتەکە بەرنە خوارێ و ئەو شەش کەسەی سەرەوەش بۆ لووتکە وەڕێ کەون٠ بەڵام بەو خێوەتە و بەو کەلوپەلەوە، لەوانە بوو هەموومان نەتوانین لووتکە ببەزێنین کە بەو هۆیەوە دەبوو

هەڵمانبژاردبان.
ژۆگا کەسێکی بە هێز و توانا و زۆریش تێگەیشتوو بوو کە دەمزانی لەگەڵ ئەودا بەباشی کاردەکەم. بەڵام سێهەم کەس دەبێ کێ بێ؟ ئەویش کارلۆس بوو پێکراو بەڵام کەمێک بەتاڵووکە بوو. ئیسلاوکیش لە کێوەکانی ئامریکادا زانستێکی تایبەتی بەدەست هێنابوو و لەگەڵ سامۆییل گرووپەکەیان لە بارەی ماڵی هەتا ڕادەیەک یاریدە دابوو. ئەوجار لە لایەن منەوە شتهایەک گوترا کە من و ژۆگا و ئیسلاوک بە ناوی گرووپی یەکەم دیاری کراین و کارلۆس و مێکۆلاژ و سامۆییلیش ناوی گرووپی دووهەمیان بەخۆوە گرت. دیاربوو بەهۆی ئەو ڕاگەیاندنە کۆتاییم بە هەموو شتێک هێنا، چونکە دەیانزانی گرووپی دووهەم ناتوانن بەهۆی کەمی کات لووتکە ببەزێنن، هەر بەو هۆیەوە بۆخۆیان هەوڵیان دا کەلوپەلەکانیان کۆکەنەوە و بڕۆنە خوارێ. لەو نێوانەدا هەر کارلۆس خۆڕاگرانە لە سەر قسەی خۆی بوو کە دەیگوت چێشت ناخوم و تەنیا حەزدەکەم لەگەڵتاندا بم و ئەوە یەکەم هەشت هەزاریی منە و داواتان لێدەکەم بە ناوی یەکەم مێکزیکی ئێمەش لەگەڵ خۆتان بەرن و هەر ئەوەش بوو بەهۆی ئەوە کە شاخەوانێکی زانای لێ هەڵکەوێ.

لە هیمالییادا بەو شێوەیە کارەکانمان بەڕێوە چوو، سامۆییل و مێکۆلاژ ڕۆیشتنەوە خوارێ و ئێمەش بەرەو سەر وەڕێکەوتین. گرووپێکی شپرزە کە نە خۆراکمان تەواو پێبوو نە خێوەت بەتەواوی و شوێنی خێوەتگای پێنج لە بەرزایی ٧٦٠٠ میتریدا بوو. هەوا زۆر سارد بوو، دەستمان بە سووتەمەنییەوە دەگرت تا هێندێکمان بۆ ڕۆژی دوایی بۆ بمێنێتەوە. ٦٠٠ میترێک لە کۆتایی ڕەوەزەکە بایەکی زۆر توندی دەهات کە مردنی پێوە بوو کە دەبا تێپەڕمان کردبا. لەو بیرەدا بووین کە ئایا پێویستە شەوێکی تر لە شوێنێک خۆ حەشار دەین؟
بەو جۆرە سووتەمەنیمان زووتر لە کاتی دیاریکراو تەواو دەبوو بەو شێوەیە دوو ڕۆژ بێچێشت دەماینەوە. داوای ژۆگام نەسەلماند و پێم گوت سووتەمەنی لەگەڵ خۆمان نابەین و بە بارێکی سووکەوە دەڕۆینە سەرێ و نایەڵین تاریک دابێ دەگەڕێینەوە. زۆر زوو وەڕێکەوتین و تا کاتژمێر چواری پاشنێوەڕۆ کە بایەکی زۆر توندی دەست پێکردبوو، بە تەنافەکانەوە خۆمان ڕاگرتبوو و هەروا دەچووینە سەرێ. وردە

وردە ڕوخساری هەورەکانیش وەدیهاتن کە لە ژێر ڕەوەزەکە لەگەڵ سەهۆڵێکی زۆر ڕووبەڕوو بووین کە لە کاتی ڕۆیشتنەکە تەنیا بە بزمارێک خۆم بەستبۆوە و هێزێکی زۆریشم لە دەست دابوو. لەو کاتەدا ئاوڕم داوە و هاوارم کرد و گوتم واباشە ئەوڕۆ دەست لە چوونەسەری لووتکە هەڵگرین و جێگایەک بۆ شەو بدۆزینەوە. کاتێک هاتمە خوارێ دیتم دیوێکی چکۆڵەیان بە بەفر دروست کردووە کە هەر چوارمان لە دەست با ڕزگارمان دەبوو. لەپڕ ژۆگا وەجاغەکەی لە کۆڵەکە دەرهێنا و دەستی کرد بە بەفر تواندنەوە چون ئەوەی بۆ ئێمە زۆر پێویست بوو ئاو بوو کە لە ژێر ڕەوەزەکە دەمگوت هەتا بۆتان دەکرێ بارەکانتان سووک کەن، بەلام لێرە گوتم ڕەحمەت لە بابت بۆ کاری کردووتە. خۆمان لە نێو کیسە خەوەکان خست و لەگەڵ سەرمای چل پلە لە ژێر خاڵدا دەستمان کرد بە بەربەرەکانێ. زۆر جار دەست و لاقمان وە سەروسەکوتی یەکتر دەکەوت، هەتا دووبارە بەیانی داهات و بە درێژایی هەشتا میتر لە تەنافەکە وەسەرکەوتین. لە شوێنێک دەمهەویست دانیشم، لەپڕ تەنافم لە دەست بەربۆوە و ناچار لە سەر نووکی کرانپۆنەکەم خۆم لە ڕژدێکی زۆر سەخت و سەهۆلاویدا ڕاگرت کە بەخۆشییەوە سەرەکەی تری تەنافەکە بە ژۆگاوە بەسترابۆوە، بەو جۆرە ژۆگا دەبا جارێکی تریش بەو ڕێگایەدا هاتباوە سەرێ و هەموومان گەیشتینە سەر ڕەوەزەکە. ئەگەر بتوانی لە بەرزایی هەشت هەزار میتریدا جیاوازێک دابنێی دەتوانم بڵێم ڕێگا ئاسانتر دەبێتەوە. گەرمای هەتاو برستی لێبڕیبووین و لەوانە بوو چاومان بە بەفر بکەوێ و دەتگوت بە خەیالاتەوە بە ڕێگادا دەڕۆیشتین. هێزمان تێدا نەمابوو و برستمان لێبڕابوو. هەر حەوت هەنگاو جارێک ڕادەوەستام و پشوویەکم دەدا و نەمدەتوانی هەنگاوێکیش زیاتر هەڵێنمەوە. لووتکەکەم دەدی و بەباشی دەمزانی کە بە ئاواتم دەگەم و دەیبەزێنم. هەرکە گەیمە لووتکە پڕ بە دەرروونم هاوارم کرد: هوریا. لەوەی کە نەمدەزانی دەمهەوێ چ شتێک ڕوون دەکەمەوە هەواڵێکم لە خۆم نەبوو، بەلام هەر دەزانم کە لە دوای هاوارەکەم هەناسەبڕکەم ڕێکەوت و دانیشتمە سەر زەوی. لووتکەکە لە پێش چاوم وەک تەپۆلکەیەک دەچوو کە بەرینایی هەر چەند میترێک دەبوو. ژۆگا و ئیسلاوک و کارلۆسیش خۆیان گەیاندە لووتکە و پشتمان وەیەک دا، وەک

بۆکسێڕەکان کە لە کۆتاییدا بێهێز ناتوانن لێک جودا ببنەوە وابووین و بەختەوەرییەکی زۆر بوو بۆ کارلوس کە خەڵکی ولاتی مکزیک بوو و بە هیچ جۆرێک بۆ من نەدەسەلمێندرا چون لەگەڵ شوێنی لەدایکبوونی زۆر جیاواز بوو. لە کۆتاییدا لەگەڵ پاوڵ بە بێسیم قسەم کرد و هەواڵی لووتکە بەزاندنم دانێ و بوو بە هۆی ئەوە کە خەم و پەژارە لە دڵی گرووپەکە دەربهاوێ. سەرەڕای ئەوەی کە زۆر ماندوو بووین بەلام دەمانتوانی خۆشحاڵی هاوڕێیانمان لە پشتی بێسیمەوە هەست پێبکەین کە ئەوە ببووە هۆی خۆشحاڵی ئێمەش، هەر بەو هۆیەش سەرکەوتنی گرۆوپەکە باشتر دەهاتە بەرچاو و بۆ جارێکی تریش هاتنە خوارمان لە هیمالییادا هاتەوە بەر چاو و کەوتە ژێرپێمان کە بەلێکدانەوی کاتەکان دیار بوو تا چ ڕادیەک

وەدوا کەوتبووین. ئەگەرچی وامانەزانی تا خێوەتگای ٥ ڕێگایەکمان نەماوە بەلام چوار کاتژمێری خایاند تا خۆمان گەیاندەوە ئەو شوێنەی کە شەو لێی مابووینەوە. ئەوجاریش بەهۆی ماندوویەتی زۆر هەر پێنج هەنگاو جارێک ڕادەوستاین و شەوێکی ساردی ترمان بێ ئەوەی هیچ شتێک تەنانەت ئاویش بخۆین تێپەڕ کرد و ڕۆژی دواییش بە جێگای دوو کاتژمێر هەموو ڕۆژەکە لە ڕێگادا بووین تا گەیشتینە خێوەتگای پێنج.

هەتا گەیشتینە شوێنی خێوەتگاکە هەموو کاتەکان هەر دەهاتین و بە سەر کارلوسدا دەمگوڕاند هەستە وەڕێ کەوە، کۆڵێنگەکەت دەست دەیە، خەوت لێ نەکەوێ، ئەو هەموو خۆبەزۆر زانینە هەر بۆتە ئەوە دانیشی. تەپومژ هەموو ولاتی داگرتبوو، پێش ئەوەی بگەینە خێوەتگای پێنج، لە دالانێکدا ڕێگا بە هەڵە چووین کە من بە ژۆگام دەگوت دەبێ بۆلای چەپ بڕۆین و ئەویش وایدەزانی کە دەبێ بۆ ڕاست بڕۆین. بەباشی دەمزانی کە ڕێگا بەهەڵە چووین، داوام لێکردن ڕاوەستن تا ڕێگاکە بدۆزمەوە. دووبارە پەنجا میتر گەڕامەو سەرێ و لەوێ چاوم بە لەتکە دەستەوانەیەکی سوور کەوت کە لە سەر تەنافەکە گرێ درابوو، گوتم وەرن ڕێگا ڕاستەکەم دۆزییەوە، دەمزانی توانای هاتنەوە سەریان نییە بەلام ئەوە ڕێگای خێوەتگای پێنج بوو. ئیسلاوکیش بە دەردی کارلۆس چووبوو و بڕستی لێبڕابوو. ئەوجار ژۆگام وەپێش دا و بۆخۆم لە دواڕا دەهاتم تا بتوانم یاریدەیان دەم. لە خێوەتەکە هەر کەپسوولێکی گازی

لیٚ بوو كه هه‌ر ده‌مانتوانی به‌شی چوار قومقومه‌ی به‌فر پیٚ بتوێنینه‌وه و هیچی تر. ڕۆژی دوایه له خێوه‌تگای چواریش هیچمان وه‌ده‌ست نه‌كه‌وت بۆ خواردن و به زووترین كات بۆ خێوه‌تگای سیٚ وه‌ڕیٚكه‌وتین كه سامانه سه‌هۆڵێك به سه‌ریدا ڕووخابوو و سه‌رتاپای تێكدابوو. ئه‌وه له‌و كاته‌دا بوو كه برسییه‌تی هێرشی بۆ هێنابووین و له‌وه ناخۆشتر من یه‌كه‌م كه‌س بووم گه‌یبوومه ئه‌ویٚ و له سه‌ره‌تاوه وامده‌زانی جامێك سووپ چاوه‌ڕوانم ده‌كا. به‌خۆشییه‌وه میشێل كۆمانژیك و مێریك خواردنیان بۆ هێنابووین. ئه‌وجار له له‌توپه‌ته‌كانی خێوه‌ته دڕاوه‌كه‌ی خێوه‌تگای دوو، خێوه‌تێكمان دروست كرد و تا به‌یانی شه‌ش كه‌س له پاڵ یه‌ك خزاین. بۆ ئه‌وه‌ی له ده‌ست ڕنوو ڕزگاریمان بیٚ، كاتژمێر دووی نیوه‌شه‌و وه‌ڕیٚكه‌وتین. له ڕێگا به‌ردیش زۆر به‌رده‌بۆوه كه چه‌ند دانه‌یه‌كمان وه‌به‌ركه‌وت. له شوێنێك كه به‌فره‌كه‌ی زۆر نه‌رم بوو كه‌وتمه نێو قه‌ڵشه به‌فرێكه‌وه و سه‌رم له خواریٚ بوو و لاقم له حه‌وا مانه‌وه، وامده‌زانی ده‌خنكێم، هاواریشم بۆ نه‌ده‌كرا به سه‌ختی به ته‌نافه‌كه خۆم هه‌ڵكێشا و لاقه‌كانم ڕاست كرده‌وه، ئه‌وجار سه‌رم له سه‌ریٚ بوو. وه‌ك منداڵێكم لیهاتبوو به‌خۆشییه‌وه دوایی هات. ژۆگاش له ڕێگا لاقی وه‌رگه‌ڕابوو و به‌و جۆره گرفته‌كان كۆتاییان پێهات و هه‌ر ئاواش ڕه‌وه‌زه‌كانی باشووری ڕۆژهه‌ڵاتی نانگاپاڕباتیش، چوونه ژێر پیٚ و هێز و توانای مرۆڤه‌كانه‌وه كه ئێمه‌ش هێز و توانای مرۆڤه‌كانمان هه‌بوو و به‌و جۆره دۆستی خۆشه‌ویستمان بۆ هه‌میشه له شوێنێك له سه‌ره‌وی خێوه‌تگای تایبه‌ت له‌نێو قه‌برێك خست و بۆ تاهه‌تایه مالاواییمان لێكرد.

كۆڵه‌پشتێك له ڕژدێكدا

لۆتسه تێكۆشان له سه‌ر ڕه‌وه‌زه‌كانی باشوور ساڵی ١٩٨٥

مانگی ژووییه‌ی ١٩٨٥، كاتێك له نانگاپاڕبات گه‌ڕامه‌وه ماندوویه‌تییه‌كی زۆرم له خۆمدا به‌دی كرد، سیٚ لووتكه به دوای یه‌كدا و بیٚ حه‌سانه‌وه به‌زاندبوو و ئه‌وه‌ی ڕاستی بیٚ تا ڕاده‌یه‌ك وازم بۆ شاخه‌وانی نه‌مابوو. كاتێك ئاگادار بوومه‌وه
كه یانه‌كه‌مان له كاتۆویسی خه‌ریكی كۆكردنه‌وه‌ی كه‌لوپه‌لی پێویست بۆ وه‌سه‌ركه‌وتنی سه‌ختترین ڕێگای ڕه‌وه‌زه‌كانی لۆتسه بوون كه

تا ئەو کات هیچ کەس لەو دیوارەوە وەسەر نەکەوتبوو، ئەگەرچی زۆر ماندوو بووم بەلام نەمویست چاوپۆشی لێبکەم و هەولم دا لە گرووپەکەدا بەشدار بم، چونکە لۆتسە یەکەم هەشت هەزاری بوو بۆ من کە نە لە ڕێگای تازە و نە لە زستاندا بەزاندبێتم. لەوەی کە بۆ جارێکی تر باروبنە تێکنێم زۆرم بۆ هاسان نەبوو. ئەوجار داوام لێکردن کە دوای مانگێک بڕۆمە لایان و هەرکە گەیشتمە خێوەتگای تایبەت، تێگەیشتم کە هێشتا بەتەواوی ماندوویەتیم نەحەساوەتەوە و ڕەوەزەکە بەو جۆرە ئێمە وەخۆ ناکا. ئەوڕووداوەم سالانێک لەمەوبەر هەست پێکردبوو کاتێک لەگەل ویتیک لە ژێر دیوارەی گاشەڕبڕۆمی چوار ڕاوەستابووم، بەوجۆرە هەموو گرووپەکە بەباشی تێدەکۆشان و لە هەولی ئەوەدا بوون کە خێوەتگای چوار هەلدەن، منیش خۆم زۆر لە لووتکە ڕانەدەدی، بەهۆی حال و وازم، وام پێ باش بوو لە گرووپی یەکەمدا بەشدار نەبم و زۆرتر لە خێوەتەکانی خوارێ کارم دەکرد. یەکەم ڕۆژی دەستبەکار بوونمان حەوتوویەک دوای هاتنی من بۆ خێوەتگای تایبەت بوو کە لە لایەن هایزێر نوواک، ویلیسکی و داسال، دەست پێکرابوو. خێوەتەکەیان لە بەرزایی ٨٠٠٠ میتریدا هەلدابوو و لە شوێنەکە دەستبەکار ببوون و وایان دەزانی بەو ڕێگایەدا باشتر وەسەر دەکەون بەلام لە بەرزایی ٨١٠٠ میتری ڕێگایان لێ بەسترابوو، دوای هەولوتێکوشانێک بڕیاریان دا بڕۆنە نێوەڕاستی ڕەوەزەکەوە. لەوێ بەدواوە منیش دەستبەکار بووم و لەگەل پاولۆسکی و هۆلدا، شەو لە خێوەتگای پێنجەم هەتا بەیانی ماینەوە. وا بڕیار درا کە لە خێوەتگای پێنجڕا تا شوێنی دیاریکراو کە ٢٠٠ یان ٣٠٠ میتر تەناف ڕایەل کەین بەلام بەهۆی سەختی ڕەوەزەکە لە ڕۆژێکدا توانیمان تەنیا هەشتا میتر تەناف جێبەجێ کەین. لە نیشانەکانی سەختی ڕێگا دەتوانم بلێم پلەی Vی بدرێتێ.

هەر بە سەر ئەو تەنافەدا هاتمە خوارێ و بۆ لای خێوەتەکەمان وەڕێ کەوتم. سەرم کە هەلێنا و ئاوڕم داوە چاوم بە کۆلەپشتێک کەوت کە بە سەر لێژایی ڕەوەزەکەدا خللۆر ببۆوە. ڕێگاکە جۆرێک بوو کە ئەگەر وشیار نەبایەی هەر ئەوندە بەس بوو هەلخلیسکابای، دەتوانم بلێم سێ سەد میتر هەلدەدێردرای. لەوێ هەلەمووتێکی یەکجار زۆر سەختی تێدا بوو کە لە خێوەتگای تایبەتڕا بەباشی دەبیندرا. لەگەل

خێوەتگای تایبەت پەیوەندیم گرت بەڵکوو چاویان پێی بکەوێ، بەلام لە نێو دەروونمدا هەستم بەوە دەکرد کە ڕافاییل کە کەمتەمەنترین کەسی گرووپەکە بوو مردووە. لە خێوەتگای پێنج لەگەڵ، پاولۆسکی بووم کە ئەو ڕۆژە بەهۆی نەخۆشی هەر لە خێوەتەکە مابۆوە. هەواش زۆر خۆش بوو، هەموو کاتی ڕۆژەکە هەتاوی بوو، ئاسمان شین و منیش بە ئارامی لە خێوەتەکەمان دانیشتبووم. لە بەرزایی ٨١٠٠ میتری هێشتا سەختی کۆتایی پێنەهاتبوو. ڕایەڵکردنی ٣٠٠ میتر تەناف و زیاتر لە پێنج کیلۆمیتریش ڕێگا کە هەتا ئەو کاتە کە کۆتایی مانگی ئۆکتۆبر بوو ئەو کارە دوو مانگی خایاندبوو. مانگی نۆوامبەریش بەڕێوە بوو، کەدەبوو بە وەرزی سەرما. لە لایەکی ترەوە نەماندەتوانی هیچ داوایەکیان لێبکەین، چونکە ئەوان لە خوارێ بەدوای ڕافاییلدا دەگەڕان. ئەوجار پێم ڕاگەیاندن کە ئەگەر بەڵێن وابێ گرووپی تر بێتە سەرێ، ئێمە بۆ حەسانەوە دەگەڕێینەوە خوارێ وابزانم ناتوانین بەو شوێنەدا وەسەرکەوین. ئەوە بۆ یەکەم جار بوو من لە کێو داوای چوونە خوارم دەکرد. ئەوجار هەموو شتێکم بۆ ئەوان ڕوون کردەوە. سێ لاوی فەڕەنسیش لە گرووپی وینسینتەکان و لە سەر ڕەوەزەکە کاریان دەکرد کە کەلوپەلی زۆر باش و ئامرازی زۆر تایبەتیان پێبوو بەلام لە هیمالییادا زۆر شارەزا نەبوون و دەیانهەویست بە شێوەیەکی ئالپی یانی بەبێ ئامرازی پێویست بەو ڕەوەزەدا وەسەر کەون، بەلام من لە توانای ئەوانم ڕانەدەدی کە بەو شێوەیە کار بکەن. ئارتۆر کە لە سەر تکنیک و ئەو کەلوپەلانەی کە پێیان بوو زۆری بیر دەکردەوە، هەر بەو هۆیەش لە سەر ئەو بڕوایە کە دەتوانن بە ڕەوەزەکەدا وەسەر کەون، لە پەیوەندییەکی ڕادیۆیی بە ئێمەیان ڕاگەیاند کە جارێکی تریش هەولێک بدەین و فەڕەنسییەکانیش لەوانەیە لەگەڵمان هاوڕێ بن.

بەو شێوەیە هەموو شتێکمان لە خێوەتگای پێنج بەجێ هێشت و گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت. هێشتا مەیتی ڕافاییل نەدۆزرابۆوە، وابزانم لە نێو قەڵشە سەهۆڵەکاندا مابۆوە. ئەوجار بڕیار درا دوو گرووپی وەسەرکەوتن هەڵبژێرین، یەک بۆ ڕایەڵکردنی تەناف و دووهەمیش بۆ بەزاندنی لووتکە، بەلام هیچ کەس نەیدەویست لە گرووپی یەکەمدا کار بکا و دەست لە لووتکە هەڵگرێ.

ئەوجار بڕیارمان دا هەر گرووپ توانایی خۆی نیشان دا. لە نێو

فەرەنسییەکانیشدا هەر وینسێنت بوو کە ڕازی بەوە بوو کە کارمان لەگەڵ بکا. ئەو لەگەڵ ئارتور هایزر لە خێوەتەکانی چوار و پێنج مابۆوە و بەهۆی ماندوویەتی زۆر دەیهەویست چەند ڕۆژێک بۆ حەسانەوە بمێنێتەوە. منیش لەگەڵ مانەوەی ئەو لەو شوێنەدا نارەزایەتی خۆم دەربڕی و پێم گوت بەرزایی ٨٠٠٠ میتری جێی حەسانەوە نییە و هەتا لێرە بمێنییەوە دەبێتە هۆی ماندووبوونی زۆرتر و لەدەستدانی هێز و توانات، یان هەر ئێستا دەستبەکار دەبی یان کۆ دەکەیەوە و دەڕۆیەوە خوارێ. ئارتور دەیهەویست وینسێنت ڕازی بکا و لە دوورەوەش لێم دیار بوون دەنگیشیان بەیەک دەگەیشت، ئەو هەر لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە ڕۆژێک زیاتر بحەسێتەوە، بەلام من هەر لە سەر داوای خۆم بووم. بەلام ئێستاش نازانم ئەو شێوازە چ بوو لە خۆم نیشان دا. کەسێک کە هەموو کات و ساتێک بیری لە لووتکە دەکردەوە ئێستا لێرە بە هیچ جۆر ڕازی نەدەبوو. هەرچەند بیر دەکەمەوە نازانم بۆچی ئاوام لێ بە سەر هاتبوو. لەو کاتەدا میرواساڵ لە پشت سەرم ڕاوەستابوو بەلام هیچی نەگوت. ئارتوریش زۆری پێ سەیر بوو لە دواییدا گوتی ئەگەر ئێوە ڕازی بان بەرنامەم درێژە دەدا. بەو جۆرە کاری ڕەوەزەکانی لۆتسەش کۆتایی پێهات و بەرەو خوار بووینەوە. هەرکە گەیشتینە خێوەتگای تایبەت، بەهۆی مردنی ڕافاییل، کوڕەکە زۆر تایبەت نەبوو و غەم و پەژارە هەموویانی ئازار دەدا. هەر بەو هۆیەش لە سەر کۆڵکێشەکان ڕانەوەستاین و زۆر زوو وەڕێکەوتین و لە ماوەی یەک ڕۆژدا ڕێگای حەوتوویەکی کۆڵکێشەکانمان تێپەڕ کرد و خۆمان گەیانەدە لوکلا. بەهۆی بەختەوەریم جێگایەک لە فڕۆکەدا مابۆوە و بەوجۆرە توانیم خۆم بگەیەنمە کاتماندو. و بەو جۆرە لە ماوی یک ڕۆژونیودا لە بەرزایی ٨٠٠٠ میتری هاتمە ١٨٠٠ میتری کە ئەوەش بە شێوەی خۆی بۆم دەبوو بە ڕێکوردێکی تازە. هێشتا نەگەیشتبوومە پێتەخت کە ناوی من و ویلیسکییان بۆ بەزاندنی کێوی کانگچین چونگا لە زستاندا نووسیبوو. بەلام من هەر لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە بگەڕێمەوە ماڵێ بۆ حەسانەوە. ئاندرێ ماجنیک، بەڕێوەبەری گرووپەکە سەری سووڕ ما لەوەی کە من داواکەم ڕەت کردوونەتەوە. بەلام ڕەخنەی لێ نەگرتم، بارەکانیان لە ئەقیانووسدا لە ڕێگا دابوون و من گەڕامەوە لێهستان بۆ ماڵێ.

ئێستاش بۆم بۆتە پرسیار کە چۆن بوو دەستم لە ڕەوەزەکانی لۆتسە هەڵگرت؟ ئایا بەهۆی مردنی ڕافاییل بوو؟ ئەویش شکێکی تێدا نەبوو لەوانەیە هۆی ماندوویەتی زۆریش هەر هۆکار بێ، چونکە لەساڵێکدا چوار بەرنامەی گەورەم بەڕێوە بردبوو، دوو لووتکە لە زستاندا و هەروەها نانگاپاڕبات و ڕەوەزەکانی لۆتسەش. بەلام بەجۆرێک کاری ڕەوەزەکە و لووتکەکەم بە هی خۆم نەدەزانی، چونکە برایان هەموو کارەکانیان بەڕێوە بردبوو، کاتێک کە من چووم بۆ لایان تەنیا خێوەتەکانی چوار و پێنج بوو و کاری منیان تێدا وەبەر چاو دەهات.

ئەوجار تەلەفۆنی ماڵمان ئیتر دەنگی لێوە نەدەهات و پتر لە کاتی حەسانەوەدا بووم و خۆم بەکارەکانی ماڵێ خەریک دەکرد یان جاروبار لە ئیستبنا دەچوومە چارداغەکەم. زۆرتر لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە بحەسێمەوە کە دوو منداڵە چکۆڵەکانم لەو بوارە زۆریان یاریدە دەدام. بەلام وێنەیەک هەرگیز لە بەر چاوم ون نەدەبوو کە لەوانە بوو هیچ کات نەتوانم لە دەستی ڕزگار بم، وێنەیەک لە لێژێکی پڕ لە بەفر و سەهۆڵدا کە لە ژێر تیشکی خۆری هیمالییادا دەدرەوشاوە و کۆلەپشتێک بە سەر ئەو ڕژدەدا خللۆر دەبۆوە.



## بەشی ١١

**حەسانەوەیەک بۆ هەمیشە**

**کانگچین چونگا، زستانی ١٩٨٦ سێهەمین لووتکەی جیهان**

کاتی پشوودان هەرچەندە جوان و خۆش بێ خاڵی کۆتاییشی پێوە دیارە. ڕۆژی دوازدەهەمی سیپتامبەر لێهستانم جێهێشت و بە وڵاتانی مسکۆ و دیهلیدا بەرەو کاتماندۆ وەڕێکەوتم. ویلسکیم لەگەڵ بوو و بە پاس بۆ لای ڕۆژهەڵاتی نیپاڵ درێژەمان پێدا و دوای دوو ڕۆژ ڕێپێوان خۆمان گەیاندە شاخەوانانی گرووپی کانگ چین چونگا. ئارتۆر هایزێر بەهۆی ئەوە کە هێندێک لە بارەکان نەگەیبوونە جێ، هێشتا لە شار مابوونەوە. من و هاوڕێکانم بە هێندێک کەڵوپەلی پێویست و بە بارێکی سووکەوە لەگەڵ کۆڵکێشەکان وەڕێکەوتین. ئەو لووتکە ٨٠٠٠ میترییە کە لە ڕۆژهەڵاتی کێوەکاندا جێگیر بووە، دیمەنێکی جوانی بە دارەکانی مۆز و خورما ڕازاندۆتەوە کە ئەوەش بۆتە تایبەتمەندییەک کە کێوەکانی ئێوێرێست و لۆتسە ڕازاوەتر بێ بەڵام سامناکتر لەوان دێتە بەر چاو.

لە بەرزایی ٥٠٠ میترییەوە دەستبەکار بووین و لە دوای تێپەڕکردنی هەموو دیمەنە سەرسەوزەکان هەتا بەرزایی ٤٠٠٠ میتر، خۆمان گەیاندە خێوەتگای تایبەت لە ٥٢٠٠ میتری لە سەر سەهۆڵەکان کە لە سەرەتاوە لە لایەن ژۆک پییاسیسکی و تاقمێک لە شاخەوانانی ترەوە هەڵدرابوو. زۆری نەمابوو بۆ ساڵی تازە و بە خۆشییەوە لاقەکانم کە لە بەرنامەی لۆتسەدا سەرما بردبوونی هەستم بە چاکبوونەویان دەکرد و ئەوە زۆر تایبەتە کە کەسێک بتوانێ توانای خۆی هەڵسەنگێنێ و لە خۆی ڕاببینێ کار بکا. ژمارەی ئەو لووتکانەی کە بەزاندبوومن دوو دانە لە میسنێر کەمتر بوون و ئەو هەستە باشتر ئێمەی بۆ تێکۆشان هان دەدا کە بتوانم ئەو مەودایە کەم کەمەوە. وەک گۆڵی تۆپێن هەر دەهات و بە لووتکەکانەوە زیاد دەبوو و کارەکە ئاڵۆزتر دەبوو. کەشوهەوای مانگی دیسامبر زۆر سارد بوو بەڵام دیمەنێکی جوانی بەخۆیەوە گرتبوو و باشی نەدەهات. بەوجۆرە هەوای خێوەتگای تایبەت ٢٥ پلە لە ژێر خاڵی نیشان دەدا، و من ویپلسکی بە زووترین کات خۆمان گەیاندە خێوەتگای یەک و بێ ڕاوەستان خێوەتگای دووشمان تێپەڕ کرد و بارەکانمان لە بەرزایی ٧٠٠٠ میتریدا جێهێشت و بەرەو خوار بووینەوە. ڕۆژێک پێشتر سەرەتای ساڵی تازە بوو کە بۆشکەی کەلوپەلەکانی خواردنمان کەمێک درەنگ گەیبووە لامان و ئەو ڕۆژە کە بۆمان گەیی توانیمان جێژنێکی باش بۆ خۆمان بگرین. ئەگەرچی هەموو بەیەکەوە نەمانتوانی جێژن بگرین چون هێندێک لە هاوڕێیانمان لە خێوەتەکانی سەرتردا مابوونەوە و ئەوەش بەرگری لەوە بوو کە دوو ڕۆژ بێ هۆ کاتی تێپەڕبوومان بەدەست بێنینەوە بۆیە بەو شێوەیە بەرنامەمان داڕشت کە ئەوان بمێننەوە و لەوە زیاتر وەدوا نەکەوین. من و پانکیویچ چێشتمان لێنا و ئەو توانی بەو شتانەی کە لە نێو بۆشکەکاندا بە دەستی هێنابوو کیکێکی زۆر باش دروست بکا و بیڕازێنێتەو کە دەبوو بە شێوەیەکی خۆماڵی جێژن بگرین و ڕاوەستین هەتا یەکەم ئەستێرە دەبینین کە ئەویش لە کێوەکانڕا باشتر دەبیندرا هەتا شار. بایەکی توندی دەهات و خێوەتەکەی دەلاژاندەوە. بۆشکەکانمان بە وێنەی مێز و کورسی دامەزراندبوو. ئەوجار یەکەم ئەستێرەش وەدی هات و ئێمەش بە شێوە و نەریتی خۆماڵی دەستمان

بە دوعا و پاڕانەوە کرد٠ جێژنمان گرت و تا ئەو کاتەش کیکێکی ئاوامان نەخواردبوو٠ دەستمان کرد بە بیرەوەری گێڕانەوە و چاشمان لەگەڵ کیکەکە دەخواردەوە تا لە گەروومان گیر نەبێ٠ بایەکەشی هەر دەهات و توند دەبوو، بارینی بەفریش دەستی پێکرد کە بوو بە هۆی چەند ڕۆژ وەدواکەوتنمان لە کار و تێکۆشان٠

بەهۆی خۆڕاهێنان بە کەشوهەوای مەڵبەندەکە من و کریستۆف ویلیسکی بەیەکەوە هاوتەناف بووین و بەو جۆرە ژووک و پییامیسکیش بەیەکەوە کاریان دەکرد٠ کانگچین چونگا، بە بەرزایی ٨٥٩٨ میتر دەبێتە سێهەمین لووتکەی بەرزی جیهان٠ ئەو لووتکە گەورەیە کە چوار لووتکەی ٨٠٠٠ میتری لێدەبێتەوە٠ لووتکەی باشووری بە بەرزایی ٨٤٧٦ میتر و لووتکە نێوەڕاست بە بەرزایی ٨٤٩٦ میتر و لووتکەی سەرەکیش ٨٥٩٨ میتر٠ لووتکەی یالۆنگ کانگ کە لە لای ڕۆژئاواوەیە بە بەرزایی ٨٤٢٠ میترە٠ ڕێگای باشووری ڕۆژئاوا بە هاوین زۆر سەخت نییە، بەڵام لە زستاندا زۆر حاڵ و هەوایەکی تایبەتی پێوە دیارە٠ لووتکەی کانگچین چونگا بە شێوەیەک دەتوانین بە هی لێهاستانییەکانی بزانین، چونکە یەکەم جار لیهستانییەکان لووتکەی باشوور و لووتکەی نێوەڕاستیان بەزاند و توانیان ڕێگایەکی تازەش لەسەر لووتکەی یالونگ کانگ بکەنەوە و چالاکی ئێمەش لە زستاندا دەبوو بە بەڵگەیەکی تر بۆ لێهستانییەکان کە ناوی ئەو کێوە بەخۆیەوە دەگرت٠ ڕۆژی یەکەمی ساڵ بەماڵینی بەفر لە سەر خێوەتەکان و دوای ئەوە بە هێندێک کایە و خۆشڕابواردن تێپەڕ کرد و لە کۆتاییدا بە چاوانی ماندوو لە کاتژمێر هەشتی شەو خەومان لێکەوت٠ ڕۆژی دوایی هەتا شوێنی خێوەتگای دوو چووینە سەرێ و خێوەتەکەمان ڕێکوپێک کرد٠ بەهۆی بای توند لەو شوێنە خێوەتەکان بەفریان لە سەر نەمابوو٠ ئەوجار خێوەتگای سێهەمیشمان لە بەرزایی ٧٢٠٠ میتری هەڵدا٠ ئەگەرچی هەر مانگێک لە بەرنامەی لۆتسە تێپەڕ ببوو بەڵام دیار بوو من و کریستۆف زۆر باش بە کەشوهەواکە ڕاهاتبووین و لە بەرزایی ٧٨٠٠ میتری تەنیا خێوەتەکەمان هەڵد و بەو هۆیە پییامیسکی و ژووک گەڕانەوە خێوەتگای سێهەم٠ لەو ڕێگایەشەوە نەمانتوانی لێکۆڵینەوەیەک بکەین گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت٠ گرووپێکیشمان لە هەموو کاتەکان لە

هەوڵی گوازتنەوەی بارەکاندا بوون بۆ خێوەتەکانی سەرەوە تا لە کاتی پێویست بتوانین بۆ لووتکە وەڕێکەوین یان ئەگەر لە دەستمان بێ لووتکە ببەزێنین. خێوەتگای چوارمان بۆ شوێنی دەستبەکار بوونمان هەڵبژارد و بڕیارمان دا خێوەتێکی تر لەگەڵ خۆمان بەرین تا بتوانین هەر چوارمان بەیەکەوە لووتکە ببەزێنین، بەڵام ژووک زۆر لە ئێمە وەدوا کەوتبوو و کۆخەیەکی توندیشی گرتبوو ئەگەرچی لە زستاندا ئەو کۆخەیە تایبەت بوو لە ڕێپێوانی ڕۆژی دوایماندا توانای گرووپەکەمان بۆ ڕوون بۆوە کە دەبێ کێ هەڵبژێرین. پییامیسکی نیو کاتژمێر لە دوای ئێمە خۆی گەیاندە خێوەتگای چوار و ژووکیش کاتژمێرێک درەنگتر لەو گەیشتێ. وا دیار بوو نەماندەتوانی لە توانای ئەو ڕابیینین، ئەگەرچی لە ژێر چاوەدێری دوکتۆردا بوو و بەپێی دەستووری دوکتۆرەکە دەرمانەکانیشی خواردبوو. بەڵام بەو جۆرەش لێمان ڕانەدەدی و کۆخەکەشی چاک نەبۆوە. لە خێوەتگای چوار خێوەتەکانمان لە ژێر بەفر هێناوە دەرێ و ڕێکو پێکمان کردن. تا ئاندرێ و پییامیسکی خێوەتیان هەڵدا، ئێمەش چامان لێنا کە دوو کاتژمێری خایاند. ئەو شەوەش بەهۆی کۆخەی ئاندرێ نەمانتوانی بخەوین. بە پەیوەندی لەگەڵ خێوەتگای تایبەت توانیمان لەگەڵ دوکتۆر قسە بکەین تا دەرمانی بۆ دیاری بکا و لەگەڵ چا بیخواتەوە، چونکە لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە زۆر جار ئاو لە لەشیدا کۆ دەبێتەوە و ئەگەر لە ڕیخۆڵەدا بێ، لە بەرزاییدا دەبێتە هۆی نەخۆشی دەروونی بە ناوی ئێدێمی ڕیویی کە نەخۆشییەکی زۆر ترسناکە لە بەرزاییەکاندا. لەو کاتەدا هەموو شتێک ئارام بوو چووینە نێو کیسە خەوەکانەوە و ڕاکشاین بەڵام هەر لە بیری نەخۆشیی ئاندرێدا بووم.

لە ئاندرێم پرسی کە بەیانی چ دەکەین و بەرنامەمان چۆنە؟ ئاندرێ لە سەرەتاوە قسەی لە سەر نەخۆشی خۆی کرد و گوتی من بەیانی دەگەڕێمەوە خوارێ. پییامیسکی گوتی منیش دەگەڕێمەوە خوارێ. ئەوجار وا دیار بوو هەموو شتێک ڕوون ببۆوە، منیش گوتم ئەگەر وایە ئێمەش دەبێ بەرەو لووتکە وەڕێکەوین.

دوای هێندێک بەدەستهێنانی ئاو و ویشکردنەوەی گۆرەوێکان، کاتژمێر ٥/٤٥ خولەکی بەرەبەیانی کە هێشتا بەتەواوی هەوا ڕووناک

نەبۆوە، ڕۆژی یازدەی ژانوییە لە خێوەتەکانمان وەدەرکەوتین. گوتم زۆر باشە ئێمە وەڕێدەکەوین، لەوەدا بوو پیپامیسکی لێمان وەدەنگ هات و گوتی چونکە دەگەڕێنەوە خوارێ، حەزدەکەین کەمێکی تر بخەوین. زۆر بە ئەسپایی درێژەمان بە ڕێگا دا ئەگەرچی هەردووکمان لاقەکانمان بێهێز بوون. هێندێک کە ڕۆیشتین کریستۆف لە شوێنێک ڕاوەستا و دەستی کرد بە جوولاندنەوەی لاقەکانی و پاشان درێژەمان بە ڕێگا دا. سەرکەوتن لە بەرزاییەکی ٨٠٠٠ میتری لە زستاندا ڕێگایەکی زۆر بوو. خۆمان بە تەنافەوە گرێ نەدابوو و هەرکەس بە دڵی خۆی درێژەی بە ڕێگا دەدا. زۆر جار لە ژێر بەفرەکەوە چاومان بە تەناف دەکەوت. کریستۆف وەپێشم کەوتبوو و زووتریش لە من گەیشتە سەر لووتکە و لە سەر من ڕانەوەستا و زۆر زوو گەڕاوە خوارێ. لە سەر لووتکە دوو دانە بووکەنایلۆنی کوڕەکانم دەرهێنا و بە ناوی دابەشکردنی خۆشەویستییەکان لەگەڵ یەک وێنەم لێگرتن. کریستۆف لە دواییدا لەو بارەوە دەیگێڕاوە و دەیگوت بەڕاستی نازانم چۆنم لێ تێپەڕ بوو، بەلام دەزانم نیو کاتژمێر لە سەر لووتکە چاوەڕوانت بووم و کاتێک چاوم بە تۆ کەوت نەمتوانی یەک خولەکیش خۆم ڕاگرم و بە زووترین کات بەرەو خوار بوومەوە.

لە سەر لووتکە مێشکی مرۆڤ لە بارەی ڕووداوکان جۆرێکی تر بیر دەکاتەوە. لێرەدا دەتوانم بەو جۆرە بۆتان باس بکەم کە لە هەموو کاتەکاندا بێسیمێکی یەک کیلۆییم لەگەڵ خۆم دەبردە سەرێ تا بتوانم لە سەر لووتکە لەگەڵ خێوەتگای تایبەت پەیوەندی بگرم. بەلام بەهۆی تاقەتکردنی قەوەکانی بەسەریاندا نەدەچوومەوە نەمتوانی پەیوەندی بگرم ئەگەرچی هەر لەو شوێنە بوو کە بۆخۆم دامنابوون یانی لە گیرفانی کۆلەپشتەکەم، بەلام وام بیر کردەوە پەیوەندی‌گرتن لەگەڵ خێوەتگای تایبەت زۆر گرینگ نییە، لە کۆتاییدا بە دڵتەنگی بەرەو خوار بوومەوە و خۆم گەیاندە کریستۆف و لە سەرمایەکی بێئاماندا خۆم لە کیسەخەوەکە خزاند. لەو شوێنە بوو کە چاوم بە بێسیمەکە کەوت و بەرزاییش ڕووداوی زۆری پێوەیە کە زۆرێک لەو پرسیارانە بێ وەلام دەمێنێتەوە. بێسیمم دەرهێنا و هەواڵی بەزاندنی لووتکەم دانێ بەلام هەستێکم بە خۆشحاڵی ئەوان نەکرد. لە پەیوەندی

لەگەڵ خێوەتگای سێهەمدا تێگەیشتم کە حاڵی ئاندرێ زۆر باش نییە و ئەگەرچی بەرەو خوار ببۆوە بەڵام نەخۆشییەکەی بە ڕادەیەک بوو کە نەیتوانیبوو لە سەر پێی خۆی ڕاوەستێ و خۆی بگەیێنێتە خێوەتگای سێ. ئەو جار پییامیسکی بەتەنێ دەگەڕێتەوە خێوەتی خوارێ و لەوێ داوای یاریدە دەکا بۆ بردنە خواری ئاندرێ و بەو شێوەیە هایزر پانکیویچ و لوودویک ویلژینسکی لەگەڵ خۆی دەباتە سەرێ و دوکتۆریش دەرمانی زۆری بۆ دادەنێ وای بۆدەچن کە لەوانەیە نەخۆشییەکەی ئێدێمی ڕیویی بێ و لە خوارێڕا کەپسوولی ئۆکسیژێنی بۆ دەبەنە سەرێ. هیچ کەس باوەڕی نەدەکرد کە ئاندرێ ئاوای لێ بە سەر هاتبێ. ئێمە لە خێوەتی چواردا مابووینەوە کە بەڵێن وابوو بەیانی زوو بڕۆینە خوارێ و لە بردنەخواری ئاندرێدا یاریدەیان بدەین کە لە نیوەشەودا هەواڵی دڵتەزێنی ئەندرێیان پێڕاگەیاندین. ئەو کە لەگەڵ پییامیسکی بەیەکەوە لە خێوەتێکدا بوون دەوروبەری کاتژمێر ٩ی شەو کەمێک باش دەبێ بەڵام کاتژمێرێک پێش ئەوی کە پییامیسکی ویستبووی چای تازەی بداتێ، ئیتر هیچ وەڵامێکی لە هاوڕێکەی نەبیستبوو و کۆتایی بە تەمەنی هاتبوو. ویلژینسکی ئەو هەواڵەی بەکورتی بە ئێمە ڕاگەیاند، ئێمەش هیچمان بۆ وەڵام نەبوو و لە پەیوەندی لەگەڵ خێوەتگای تایبەت تێگەیشتین کە دەبێ چبکەین. وەڵامی ئاندرێ ماچینگ ئەوە بوو کە گوتی بەرنامەی کۆتایی پێهاتووە و هیچ کەس نابێ بیر لە لووتکە بکاتەوە و هەموو کەلوپەلەکانی خێوەتگای چوار کۆ کەنەوە و لەگەڵ خۆتان بیهێننە خوارێ. لە خێوەتگای سێهەم لەگەڵ مەیتی بێگیانی ئاندرێ بەرەوڕوو بووین. پانکیویچ و هایزێریش لەوێ بوون و پێش ئەوەی ئێمە بگەینە خوارێ پییامیسکی کە حاڵی باش نەبوو بردبوویانە خوارێ. ئاندرێ دەتگوت خەوی لێکەوتووە و لە نێو کیسە خەوەکەدا ڕاکشابوو و چمان لە دەست نەدەهات من لە سەر ئەو بڕوایە بووم کە دەبێ بیبەینە خوارێ، بەڵام بەو هەموو ماندوویەتییە و لە بەرزایی ٧٤٠٠ میتریدا چۆن دەمانتوانی ئەو مەیتە قورسە بە نێو ئەو هەموو قەڵشە سەهۆڵانەدا بەرینە خوارێ. بۆخۆمان بە سەڵتی بۆمان سەخت بوو بەوێدا تێپەڕ بین. هاتینە سەر ئەو بڕوایە کە گرووپی یاریدەدەر کە لە خێوەتگای تایبەت نیشتەجێ بوون بێن و یاریدەمان

بدەن، کە دەبوو چاوەڕوانی وەڵامی ئەوانیش بین کە ئایا دەتوانن ئەو کارە بەڕێوە بەرن؟ ئەوەی ڕاستی بێ بە قسە هاسانە و بە کردەوە دیاری دەکا و بۆ بردنە خوارێ مەیتەکە حەوتوویەکی دەخایاند و لەوانەش بوو هەر لە ڕێگادا لەو قەڵشە سەهۆلانە تێپەڕ نەبین و بکەوینە نێو یەکێک لەوانەوە. ئەوجار هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە بردنە خوارێش هەر کەلکی نییە و بڕیارمان دا کە هەر لەوێ پرسەیەکی خۆماڵی بۆ بگرین و هەر لە شوێنی خێوەتگای سێهەم لە جگایەک بینێژین و بەجێی بێڵین. ڕێوڕەسمەکە لە لایەن ئێمە چوار کەسەوە بەڕێوە چوو و ٥٠ میتر لەولای خێوەتەکە قەڵشتێکمان دۆزییەوە کە زۆر تایبەت بوو، مەیتەکەمان بۆ لای وێ ڕاکێشا. هەوا زۆر خۆش بوو و هەتاو دەدرەوشاوە و دەتگوت کێوەکانیش ئەویان خۆشدەوێ و نەیاندەویست لەو کاتەدا بیرەوەری تاڵی بۆ وەدی بێنن. کە بەتەواوی لێمان ڕوون بوو کە ئیتر ئاندرێ ناتوانێ ڕاست بێتەوە بۆ ئێمە زۆر تاڵ بوو. ئێمە هەر لە هیمالییادا بەیەکەوە نەبووین، بەڵکوو هاتوچووی بنەماڵەییشمان هەبوو. «یا مەریەمی مقەدەس»

پێشتر وامدەزانی کە ئەو نەخۆشییانە هەمووی لەنێو شارەو سەرچاوی دەگرێ، و کێو ئەو نەخۆشییانەمان لێ وردەگرێتەوە کە چی تازە تێگەیشتبووم کە چەندە لە هەڵەدا بووم. بۆی پاڕامەوە و گوتم خودایە ڕوح و ڕەوانی شادکەی و لە گوناهەکانی خۆش بێ. ئەوجار تەنافمان دا خوارێ و لەدواییدا کوڵێنگەکەی کە ناوی خۆی لە سەر نووسرابوو لە سەر مەیتەکەمان دانا. ویستمان شتێک بڵێین و تەنیا گوتم خوداحافیز ئاندرێ و ئیتر نەمتوانی هیچی تر بڵێم کوڵی گریانم هەستابوو و هەستم بەوە دەکرد کە کێوەکانیش لە غەمی ئێمەدا بەشدار بوون و گشتیان دەگریان. بەو تیرەگانەی ڕێگامان نیشانە دەکرد، سەلیبێکم دروست کرد و لە سەر قەبرەکەم چەقاند.

مانگێک دوای بەرنامەکە چاوم بە نێو وێنەکاندا دەگێڕا، وێنەیەکم وەبەر چاو هات کە لە نێوان خێوەتگای دوو و سێ گیرابوو و کە لەوێدا کریستۆف و پییامیسکی و ئاندرێ لە نێو ئەو وێنەدا بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو دەهاتنە بەرچاو کە لە نێوان تیرەگی نیشانەی ڕێگا و تەنافەوە وێنەی سەلیبێک لە سەر پشتی ئاندرێ دروست ببوو کە

هەر وەک ئەو وێنەیە دەچوو کە ئێمە دروستمان کردبوو و لەسەر قەبرەکەمان دانابوو· ئایا هەر ئەو ڕووداو بوو کە لە سەرەتاوە بۆی دیاری کرابوو؟ ئێمە نەماندەزانی! بەیانی ئەو ڕۆژە لە نێوان من و ئاندرێ ماچینگ کێشەیەک هاتە پێش کە هەر لەوێ کۆتایی هات و بە دوای ئەودا من و کریستۆف و ئارتۆر بەرەوخوار بووینەوە· ئەوە سێهەمین جار بوو کە ئێمە لە بەرنامەکانی شاخەوانیدا کوشتەمان دەدا·

کاتێک گەیشتمە فرۆکەخانەی وەرشۆ، یەکێک لەو کەناڵە تەلەویزیۆنانەی کە بینەری زۆر بوو، ئەگەرچی زۆریش ئازاردەر بوو ئێمەی خستە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوە کە ئێمە هەر ڕووداوەکەمان وەلام داوە و گەڕامەوە بۆ شارەکەی خۆمان یانی ئەو شوێنەی کە بنەماڵەکەم چاوەڕوانیان دەکردم· لەوێش هەواڵنێرەکان لە تریبوونی کارگەرانی کاتوویس کە دەیانەویست چۆنیەتی بەڕێوەچوونی بەرنامەکەی ئێمە بنووسنەوە هاتن بۆ لام· منیش هەموو ڕووداوەکەم جۆرێک بۆ گێڕانەوە کە لە چوار ژمارەدا بلاوی کەنەوە· دوای سێ حەوتووش بەڕێوەبەری گرووپ ماچینگ و هەموو بەشداربووانی گرووپەکە گەڕانەوە کە ماچینگ شکایەتی لە هەواڵنێرەکە کردبوو کە گوتبووی بۆچی ئەوان لە سەر بەڕێوەبەری بەرنامە ڕانەوەستاون کە وتوویژی لەگەڵ بکەن· ئەوجار لاپەڕەیەکی تریش بەو گۆڤارە زیاد بوو و ماچینگ لەوێدا زۆربەی گوناهەکانی خستبووە ئەستۆی من و ویلیسکی ، بەلام زورم لەلا گرینگ نەبوو و گوێم نەدایە و درێژەم بە کاری خۆم دا· ئەگەرچی ئەو بەرنامەیە زۆر ناخۆش و تاڵ بوو و زۆری تێکشکاندبووم و ئاخرین کارێک بوو کە دەبوو بەڕێوەم بردبا و نەشدەکرا بیدەمە دەست هیچ کەس، چاوپێکەوتن لەگەڵ بنەماڵەی ئاندرێ بوو· ئەوان لە هەموو شتێک ئاگادار بوون ڕووداوکەیان لە لایەن هەواڵنێرانەوە بەباشی زانیبوو· بە هەر جۆرێک با دەبوو ئەو بارە گرانە بە تەنیا هەڵگرم و لە حالێکدا کە ئاندرێش مردبوو دەبوو چووبام، چووم و چاوم بە خێزانی و کچە چکۆڵەکەی و دایک و براکەی کەوت· هەر برایەکی لەوێ بوو چونکە براکەی تریشی نەمابوو و ئەویش هەر لە کێو مردبوو·



## بەشی ١٢

K٢ بانگهێشت کرابوو. بەدوای کەسێکی تریشدا ددگەڕان کە بێ هیچ بیانوویەک وەڵامی ڕاستم دانەوە و ددستم لە هەموو لێکۆڵینەوەیەک هەڵگرت: ئەوجار کاریل ماریا و هێنریک کۆفێر. بەڕێوەبەری بەناوبانگی بەرنامەکانی هیمالییا ددیهەویست حەفتاهەمین ساڵوەگەڕی تەمەنی لە K٢ جێژن بگرێ: شاخەوان نەبوو بەڵام تەمەنێکی زۆری لە نێو بەڕێوەبەرایەتی بەرنامەکانی هیمالییادا تێپەڕ کردبوو: ئەو جیاواز لە شاخەوانانی تر بوو: شاخەوانان بۆ وەدەستوگرتنی بەڕێوەبردنی بەرنامەیەک سەرەتا فێرکارییەکەی ددبینن و لە دواییدا بەڕێوەبەرایەتی وەدەستو ددگرن: لە ڕاستیدا بۆ هاتنە نێو گرووپەکە هێندێکی شەرت و بەڵێن دانابوو کە بەو جۆرە بوو ئەگەر ناومان لێنابا دیسیپلینی ئاڵمانی. لەوانە بوو کەس پێی خۆش نەبێ: مەسەلەن ئەو وێنە و فیلمانەی کە هەڵددگیرانەوە ددبوو بیددینەوە ددست ئەو. یان ددبوو هەموو بە تێکڕایی لە گواستنەوەی ٥٥٠ کیلۆ بار بۆ خێوەتگای سێهەم و ١٢٠ کیلۆ تا خێوەتگای دووهەم بەشدار بن: لە سەرەتاوە

هەتا ئەو ڕۆژە هیچ بەڵگەیەکم بەو جۆرە ئیمزا نەکردبوو، بەلام سالانێک بوو بە ئاوات بووم بە ڕێگای باشووری K٢دا وەسەر کەوم و پێموابێ ئەگەر کەسێک لە پێش من بەو ڕێگایەدا وەسەردەکەوت بەڕاستی پێم ناخۆش دەبوو. تادێژ پییۆترفیسکی بە ناوی یەکێک لە گەورەشاخەوانان و ئەو کەسەی کە لەگەڵ شاخەوانی زاوادا بۆ یەگەم جار لە زستاندا لووتکەی ٧٤٩٥ میتری نۆوشاقیان بەزاند، بە مانای ئەوەیە کە بۆ یەکەم جار لە لایەن ئەو دوو کەسەوە و یەکەمین ٧٠٠٠ی کە لە زستاندا بەزێندراوە کە ئەو کەسە بوو زۆربەی داواکارییەکانی منی بە هێرلیگ کۆفێر سەلماندبوو، ئەگەرچی ئەو لەگەڵ شاخەوانانی لاو زۆری نێوان خۆش نەبوو. بەداخەوە لە بەرنامەی لۆتسەی ساڵی ١٩٧٤دا یەکێک لە هاوڕێیانی تادێژ بە ناوی لاتالۆ گیانی لە دەست دابوو کە ئەو کات لە نێو ئەو جۆرە ڕووداوانە زۆربەیان بە دوای تاوانباری ڕووداوەکەدا دەگەڕان کە ئەوجار ناوی تادێژ هەڵبژێردرابوو تا ئەو ڕادەیە کە دەستی لە شاخەوانیش هەڵگرت. تەنانەت کاری ببووە کتێب نووسین و پێی سەلماندن ئەگەرچی دەستیان پێ لە شاخەوانی هەڵگرتووە بەلام کەس ناتوانێ پێش بە قەڵەمەکەی بگرێ. بەلام دوای تێپەڕبوونی سالانێک لە ڕووداوەکە لە بەرنامەی مەڵبەندی تیریچمیردا هاتە نێو گرووپی ئێمەوە. ئەو لە بەرزایی ٧٧٠٠ میتریدا بە باشی کاری دەکرد و ئەو لەو شاخەوانانە بوو کە هیچ کات پێی نەنا نێو بەرزایی ٨٠٠٠ میترییەوە. لە سەرەتاوە کاری من لەو بەرنامەیەدا بەدەست هێنانی ٢٠ کۆتی تووک و ٢٠ کیسەخەو بوو، کە یەک میلیون ئیسلوتی پارەی لێهستان بوو و یانەکەشمان پوڵی بلیتەکەی بۆ دابووم. لەگەڵ تادێژ لە کراچی ئەو سێسەد کیلو بارەی کە لە لایەن کەشتییەوە هاتبوو وەرمانگرتەوە و چەند ڕۆژ بە هۆی کاروباری بەڕێوەبەرایەتی وەدوا کەوتین. بۆ هەر کارێک داوای پارەیان دەکرد و ئێمەی لێهستانیش تەنانەت ڕووپییەیەکیشمان حیساب دەکرد. لە پەیوەندییەکدا لەگەڵ هێرلیگ پێم گوت هەر داوای پارەمان لێدەکەن، لە وەلامدا گوتی هەرچی دەیانەوێ بیاندەنێ تەنانەت ئەگەر پێنج هەزاریشیان ویست، ئەگەر دووبارە گرفتتان هەبوو ڕازییان کەن. لێرەدا بوو کە جیاوازی نێوان ئەو بەرنامەیە و بەرنامەکانی ترم دەهاتە بەر چاو کە زۆر جار بەهۆی

چەند شتێکی چکۆڵەوە هەزاران شەڕمان لە نێواندا دەبوو. هەرچی ویستبامان بە تایبەت بۆمان دەهات و دەمانخوارد و لە باشترین هۆتێلدا دەخەوتین و ئیتر پێویست بەوە نەبوو وەک جاران گیانمان لە مەترسی بهاوێین یان بۆخۆمان چێشت لێنێین. بە شێوەی دەستوور دەبوو ئێمە پێلاو یان کەوش و گۆرەوی کۆڵکێشەکانیشمان دابین کردبا، بەلام گرووپی هێرلیگ کۆفێر، هەریەکەی جووتێکی ئادیداس دابوونێ، ئەگەرچی هێشتا وەریاننەگرتبوو لە پێشدا فرۆشتبوویان و هەر بە کەوشەکانی خۆیان و یان بە پێی پێخواس بە سەر بەفریشدا کۆڵکێشییان دەکرد. گرووپی هێرلیک کۆفێر سێسەد جووتیش گۆرەوی خوری سوویسیشی دابوونێ کە ئەویشیان بە نرخێکی هەرزان فرۆشتبۆوە لەو گۆرەوییانەی کە بەئاوات بووم جووتێکم هەبێ. ئەگەرچی بەغیل نەبووم بەلام تازە تێگەیشتبووم کە کەل‌وپەلی منیش زۆرتر وەک کۆڵکێشەکان دەچوو هەتا شاخەوانان. لە درێژەی ئەو بەرنامەیەدا ئەگەرچی جیاوازی زۆر دەبیندرا، بەڵکوو شێوازی تریش دەهاتە بەر چاو کە بەڕێوەبەری گرووپەکان چۆن هێرلیک کۆفێریان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا، ماڵوێران دەیدا و ڕێزیشی لێ دەگرتن، هەر بەو هۆیەش بوو کە دەستبەرداری هێرلیک کۆفێر نەدەبوون. چێشتی حازر، چێشت‌لێنەر، جێ‌خەوی باش و خێوەتی حازر، بەو جۆرە هەرچی پێویستە لەوێدا بۆیان ئامادە بوو. ٢٤ جار بۆ هیمالییا چووبووم بەلام هیچ کات بە وردی نەیڕوانیبووە ئەو جۆرە شێوازانە و لێرەدا من بووم ئازارم دەدی و دەمهەویست بەرۆکی ئەو مفتەخۆرانە بگرم کە تادێژ گوتی ناڕەحەت مەبە ئێوە چکارتان بەو کارانە داوە. هەر لە سەرەتاوە چەند هەلیکۆپتێری بۆ ناوچەکە قسە لێکردبوو کە ئەوەش ببوو بە هۆی ڕەزامەندی و خۆشحاڵی هەمووی ئێمە، چونکە بۆ خۆڕاگری گرووپەکە لە ڕووداو و زوو دەستوێڕاگەیشتن و متمانەی زۆرتر دەهاتە بەر چاو و هەر شتێک ویستبات بە زووترین کات بۆت دابین دەکرا. بەو جۆرە نەبوو کە بۆ خواردن هەر چەند ژەمێک دیاری کرابێ بەڵکوو هەر کات برسیت بایە دەتتوانی بچییە نێو خێوەتی چێشتخانە و دەست بە خواردن بکەی. هەلبەت نامهەوێ بەسووک بڕوانمە ئیمکاناتی لێهستانییەکان، بەلام لێرە پێویست بە دەستپێوەگرتن نەبوو و تەنانەت

دەتوانم بڵێم دەمانتوانی پێداویستییەکانی تایبەت بە خۆشمان دابین کەین و کەسیش لێی‌نەدەپرسییەوە.
لە گرووپی کارل هێرلیگ کۆفێر بەهۆی ئازادی تەواو لە نێو گرووپەکە، من زۆر ڕازی بووم. لە یەکەمین قسەکانی تایبەت بە بارودۆخی شاخەوانی نێو ڕێگامان لەگەڵ شاخەوانانی ئورووپایی کە یەکێک لە هاوڕێیانی سویسی بوو زانیم کە تا چ ڕادەیەک دونیای شاخەوانی ئێمە لەگەڵ ئەوان جیاوازە هەروەها تێگەیشتم کە ئەوان هیچ کات لە بیری کاری تازە یان ڕێگای تازەدا نین تەنیا پێویستیان بەوەندەیە کە خۆیان بگەیەننە لووتکە و بە زووترین کات بەرەو خوار ببنەوە و بۆ هێندێکیشیان هەر ئەوندە بەس بوو کە ناویان لە نێو بەرنامەی $K_2$دا ببێ و خۆیانی پێهەڵکێشن و هەر ئەوندەشیان پێویست بوو کە بڵێن لە نێو بەزاندنی $K_2$دا ناویان هەیە. لێکۆڵینەوەشیان زۆر پێخۆش بوو، بەلام گوێیان بە کار نەدەدا. ئەگەر ویستبێتم شاخەوانی نێوان ئورووپاییەکان و لێهستانییەکان هەڵسەنگێنم، دەتوانم بڵێم ئۆتۆمبیلی ئەوان لە جادەی ڕاستدا زۆر توندوتۆڵە بەلام لە ڕێگای پێچوگەودا زوو وەردەگەڕێ، بەلام ئەو جۆرە ڕێگایانە تایبەتە بە ئۆتۆمبیلەکانی لێهستان و وەک تانک پێیدا تێپەڕ دەبێ. ئەو بەرنامەیە وا دیار بوو کە ناوی هێرلینگ کۆفێری بەرێتە ژێر پرسیار و کۆتایی بە بەرنامەکانی بێنێ کە من سەرم لەوە سووڕ مابوو کە چۆن ئەو گرووپە ناشارەزایانەی هێنابووە ئەو مەڵبەندە کە ئێمە دوو لێهستانیش ڕەگەڵیان کەوتبووین و بۆ ئێمە هێندێک ناجوور بوو. با لێرەدا لەو گەڕێین، ئەوانی‌تریش دوو دوو بەیەکەوە ناکۆکییان هەبوو و تازە دوو گرفتی تریشمان لە پێشدا بوو کە یەکیان ڕێگای باشووری $K_2$ و ڕێگایەکی تازە لە برۆدپیک.
بەو جۆرە ناڕازی نەبووین هەر لەوە دوودڵ بووین کە ئایا دەتوانین لە بارەی ڕێگای تازەدا قسەیان لەگەڵ بکەین یان ئەو بەڕێزانە توانای ئەو کارانەیان هەیە یان لە دەستیان دێ؟ تادێژ دەستی بە قسە کرد و گوتی ئەگەر نەمانتوانی بە ڕێگای باشووردا وەسەر کەوین دەتوانین ڕێگای تایبەت‌دا بچینە سەر. هەر قسەی دەکرد و وێنەکانی $K_2$یان پێ نیشان دەدایین و منیش هەر لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە ڕازییان کەم کە بە ڕێگای باشووردا بڕۆین، وابزانم هەتا ڕادەیەکیش تادێژم هێنابووە

سەر ڕێ گرینگتر لەوانە ئەوە بوو کە بزانین هێرلیگ کۆفێر دەڵێ چی و دەیەوێ چ بکا. لە بارەی ڕێگاکەدا قسەم بۆ کرد و گوتم من لەپێشدا لەو ڕێگایە کارم کردووە و ڕاشمگەیاند لەو کەوییە بەفرانەی کە لە ڕێگادان خۆمان دەپارێزین. هیچی نەگوت و وەک بەڕێوەبەرێکی باش گوتی من ڕێزم هەیە بۆ بیروبڕوای تۆ. ئەو بێ هیچ قسەیەک داواکەی ئێمەی سەلماند و ڕاشکاوانە هەردووکمانی بۆ یەکەم کەسانی بەزاندنی لووتکە هەڵبژارد. کارل بەهۆی خوو نەگرتن بە کەشوهەوای مەڵبەندەکە وەدوا کەوتبوو، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە چەند ڕۆژێک درەنگتر هاتبووە خێوەتگای تایبەت. گرووپێک بە ڕێگای تایبەتدا بۆ لووتکەی برۆدپیک وەڕێکەوتبوون و تەنانەت سێ کەس سویسی و ئاڵمانیییەک ڕێگای بەرنامەی ئێمەیان هەڵبژاردبوو، هەر لەگەڵ کاتی بەرنامەی ئێمە ئینگلیسی و فەرەنسییەکان کە ویندا ڕۆتکیویچ لەگەڵ ئەوان بەشدار بوو، ئامریکایی و ئیتالیاییەکان و گرووپێکیش لە لێهستان و بە بەڕێوەبەرایەتی یانۆژ مایەر و شاخەوانانی کۆریای باشوور و ئۆتریش و شاخەوانێک لە ئیتالیا بە ناوی ڕیناتۆ کارساتۆ کە هەمیشە بەتەنیا بە کێوەکاندا دەگەڕا. ئەو گرووپانەی کە ناوم هێنان هەموو لە هەوڵی بەزاندنی لووتکەدا بوون.

ڕۆژی دوایی دەستمان لە خێوەتگای تایبەت هەڵگرت و بۆ لای خێوەتگای یەکەم وەڕێکەوتین. سویسییەکان هەر لە سەرەتاوە ورەیان بەردابوو و دایم دادەنیشتن و مەودایان لەگەڵ ئێمە زۆرتر دەبوو، ١٠٠ میترێک لە ئێمە وەدوا کەوتبوون کە گوێم لە هاواریان بوو کە گوتیان ئێمە دەمانەوێ بگەڕێینەوە. منیش بانگم کردن و گوتم خەجاڵەتی بکێشن، هەر نەبێ هەتا خێوەتگای یەکەم وەرن، لەوێش بەیەکەوە قسە دەکەین. لە خێوەتگای یەکەم لە بەرزایی ٦٠٠٠ میتریدا چۆنیەتی سویسییەکان ڕوون بۆوە. ئەوان ڕێگاکەیان بەسەختی ناو هێنا و بەراوەردیان کرد و گوتیان هەموو هێز و توانایان لەو ڕێگایەدا لە دەست داوە. هەوڵم دا ئەوان لە ڕاستیی ڕووداوەکە تێبگەیەنم بەو مانایە کە ئەوان پێویستیان بە خۆڕاهێنانی زیاتر لەگەڵ کەشوهەوای مەڵبەندەکە بوو و ئەو جۆرەی بیر دەکەنەوە هەڵەیە و ڕێگای تایبەتیش ئەوندە هاسان نییە و لەوانەیە هێندێک لێرە ئاسانتر

بێ. هەرچەند هەوڵم لەگەڵ دان گوێیان نەدایە، بەو گوێیەدا دەچوو و بەوی تردا دەهاتە دەرێ. بەیانی ڕۆژی دوایی بێدا و ڕالف، دوو هاوڕێی سویسی ئێمەیان جێهێشت و بەرەو خوار بوونەوە. ئێمە چوارکەس ماینەوە و ئەو ڕۆژە دەبوو ڕێگایەکی پڕ بەفر و بەرداویمان تێپەڕ کردبا. لەوەدا بوو کە پتری قورسایی لەشم لە سەر کەوییە بەفرەکە بوو، لاقی چەپم لە سەر لایەکی‌تردا جێگیر ببوو، بەو هۆیە قورسایی کەوتە سەر پزۆکە و ڕنوو خزی و ڕۆیشتە خوارێ. بەو جۆرە سێهەمین کەسی سویسییەکانیش زۆر زوو باروبنەی تێکنا و بارە زیادییەکانیشی لە سەر بەفرەکە دانا و بەجێی هێشتین و بەرەو خوار بۆوە. ئەوجار ماینەوە سێ کەس، کەمێکمان تەناف ڕایەڵ کرد و گەڕاینەوە بۆ خێوەتگای یەکەم. ئەگەر سوویسییەکان نەهاتبان دەبوو بۆ یاریدە، لە کۆڵکێشەکانی ئەوان کەلک وەرگرین. لێرەدا هێرلیگ کۆفێر چۆنیەتی کارەکەی ڕوون کردبۆوە، یانی ئەوان لەگەڵ ئێمە کاربکەن، یان بگەڕێنەوە بۆ ولاتەکەیان.

ئەوەی ڕاستی بێ کەڵوپەلەکانیش بۆ هەموو ڕێگاکان دابەش نەکرابوون. وا باشە ئەوەش بڵێین کە هێرلیگ کۆفێر بەتەواوی نارەزایەتی خۆی لە سەر ڕێگای تایبەتی K٢ ڕاگەیاندبوو، چونکە بەڵگەی پێویستیشمان بۆ ئەو ڕێگایە وەرنەگرتبوو. لێرەدا منیش پێم‌خۆش نەبوو شوێن بە شوێن بارەکان بگوێزمەوە و دەمهەویست بە شێوەیەکی ئاڵپی بەتوندی ڕێگا تێپەڕکەم کە بەو شێوەیە هەبوونی کەسانی زۆر یان گرووپی گەورە پێویست نەبوو و ئەوە شتێک بوو کە بەڕێوەبەری گرووپەکەی ئازار دەدا. چۆنیەتی هێرلیگ‌کۆفێر باش نەبوو و بڕیاری دا شوێنەکە جێ بێڵن، بەلام بەر لە ڕۆیشتن جارێکی تر ڕایگەیاند کە من و تادێژ بەڕێوەبەرانی گرووپەکەین و ئەوەشی بە سوویسیەکان گوت کە ئەگەر ناتوانن لەگەڵ ئەوان کار بکەن دەبێ بگەڕێنەوە ماڵێ. هەروەها چاوەڕوانی ئەوەشمان هەر نەدەکرد کە ڕایگەیاند و گوتی لە کاتێکدا کە من لێرە نیم بەرپرسیی هەمووی ئێوە بە ئەستۆی بەڕێوەبەرانی یەکەم و دووهەمە.

هەرکە هێرلیگ کۆفێر لە لامان ڕۆیشت هێندێک بێ ئەوەی

بەڵگەی پێویستیان پێبێ بە ڕێگای تایبەتدا بەرەو لووتکە وەڕێکەوتن، بەوجۆرە گرووپەکە بە چەند گرووپی چکۆڵە دابەش بوو. ڕۆژی دوایی من و تادێژ خۆمان گەیاندە بەرزایی ٦٤٠٠ میتری، ئەو شوێنەی کە جارێک لەگەڵ ویتیک هەتا ئەوێ چووبووین. تۆنی فرۆیدیش هاوڕێی ئالمانیمان کەمێک ناساز بوو و زگی باشی کار نەدەکرد. خۆم گەیاندە شوێنێک و کەمێک ناڕەحەت بووم، جێگایەکم بۆ مانەوەی شەو خۆش کرد. بەیانی ڕۆژی دوایی زۆر زوو دەس‌بەکار بووین و لە ماوی ١٥ خولەک پزووە بەفرەکەمان تێپەڕکرد و خۆمان گەیاندە ژێر ڕەوەزە بەرد و سەهۆڵەکە و ئەو ڕەوەزە ٤٠٠میترییەمان تەناف ڕایەڵ کرد بۆ وەی کە لە دواییدا کارەکەمان هاسانتر بێتەوە. لە خۆشییان زۆری نەمابوو هەڵفرین، لە تادێژم پرسی پێت چۆن بوو و ئێستا چۆن بیر دەکەیەوە؟ ئەویش گوتی وابزانم باشترین ڕێگامان هەڵبژاردووە و کلیلی ڕێگاشمان دۆزیودەتەوە. کاتێک گەڕاینەوە خێوەتەکە، تۆنیی هاوڕێمان خەریکی چێشتلێنان بوو و چاوەڕوانی هەواڵی تازەی ئێمە بوو و چۆنییەتی زگیشی هەر وەک خۆی وابوو و بەو هۆیە دەیهەویست بگەڕێتەوە بۆ خێوەتگای تایبەت. ئەوجار ماینەوە دووکەس. ڕۆژی دوایی هەرچی پێمان بوو کۆمان کردەوە و هەتا کۆتایی تەنافە ڕایەڵکراوەکان کە تا بەرزایی ٧٠٠٠ میتری بوو وەسەر کەوتین. دوای تێپەڕ کردنی شوێنێکی پڕ بەفر، لە بەرزایی ٧٢٠٠ میتری جێگایەکمان بۆ خێوەت دۆزییەوە و هەڵمان دا. ڕۆژی دوایی بەهۆی تێکچوونی هەوا، کەلوپەلی پێویستی شەوانەمان بەجێ هێشت و گەڕاینەوە خێوەتگای تایبەت و خۆمان ساز کرد بۆ بەزاندنی لووتکە و دوای یەک حەوتوو بەفربارین، لەگەڵ یەکەم تاوهەلات لە ڕۆژی یەکەمی مانگی ژوئەن و لە ماوەی دوو ڕۆژ خۆمان گەیاندە بەرزایی ٧٢٠٠ میتری و ڕۆژی سێهەم پێمان نا شوێنێکی نەناسراو و لە بەرزایی ٧٨٠٠ میتریدا خێوەتمان هەڵدا یانی لە شوێنێک کە بە ناوی داری یاری هاکی ناو نراوە. بە وەسەرکەوتنی ڕۆژی دواییمان هەتا بەرزایی ٨٢٠٠ میتری تێگەیشتین کە هەر دەبێ لەو ڕەوەزە ئەستەمەی ڕووبەڕوومان وەسەر کەوین دەنا ڕێگای ترمان نەماوە و بە دوای ڕێگایەکدا دەگەڕاین کە باشترین ڕێگا بێ، چون ئەو ڕەوەزە کاری ڕۆژێک نەبوو و زۆر لەوە ئەستەمتر

بوو کە ئێمە بیرمان لێ دەکردەوە. ١٠٠ میتر بەرزایی بوو و ٣٠ میتری نیشانە سەختی[T]ی هەبوو. «نیشانەی[T] لە کاری سەر بەرد و سەهۆڵ، بۆ شوێنی ئەستەمی دیاری دەکەن.» (وەرگێڕ)

تەواوی ئەو کەرەسانەی کە بە ئێمە بوو سێ بزمار و پێچێکی سەهۆڵ بوو. دوو تەنافی ٣٠ میتریشمان پێبوو کە بتوانین لە شوێنی ئەستەمدا خۆمان ڕزگار کەین. لەوانەیە بۆ باوەڕپێکران نەبێ، بەڵام ئەو بەشە لە کارەکەم یەکێک لە ئەستەمترین کارەکانم بوو. لەو بەرزاییەدا کە هەر ٣٠ میتر درێژایی بوو ڕۆژێکی تەواوی خایاند. دۆزینەوەی جێدەست و شوێنی داکوتانی بزمار و چەند سانتین وەسەرکەوتن بۆ گاڵتە دەبێ، بەڵام ڕاست وابوو. توانای ڕۆیشتنیشمان نەمابوو و زۆر بە ئارامی وەسەر دەکەوتین. هەموو ڕۆژەکە لە پێشێ دەڕۆیشتم و تادێژیش ڕایگرتبووم. بۆ خۆگەیانە ڕێگای لووتکە پێویست بوو ئەو بەشەی ڕێگاکە بە باشی بەتاقی کرێتەوە. شەو تا بەیانی لە شوێنێکی ئەستەم خۆمان مات دا. لە کاتی سەهۆڵ ئاوکردنەوەدا بە هۆی جووڵەیەک تەنیا کەپسوولەکەی گازیشم لێ بەربۆوە خوارێ و لە دەستمان دا هەرچەند بۆ خەویش بەدەنمان پێویستی بە ئاو هەبوو. بەو جۆرە دەبوو بۆ ماوەیەکی زۆر ئیتر بیر لە ئاو نەکەینەوە. بەیانی ڕۆژی دوایی بە ئاوری شەمێک لیوانێکم ئاو دروست کرد کە خواردنی بەیانی ئێمەی ساغ کردەوە. کەلوپەلەکانمان هەر لەوێ بەجێ هێشت و بە بارێکی سووکەوە بەرەو شوێنی تەناف ڕایەڵکراوەکان وەڕێکەوتین. دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر لە سەر ئەو ڕێگایە کە زۆر ئەستەم بوو، بە درێژایی ٦٠ میتر توانیمان کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆ خۆمان بگەیەنینە سەر ڕێگای لووتکە. لەنێو هەورەکاندا لووتکەمان چاو پێکەوت. تادێژ کەمێک درەنگ خۆی گەیاندە من. دووبارە هێندێکی تر لە کەلوپەلەکانمان لەوێ بەجێ هێشت و داوام لە تادێژ کرد کە هەر ئێستا لووتکە ببەزێنن و شەویش بگەڕێینەوە ئەو شوێنە کە ئەویش سەلماندی و لێی قبووڵ کردم. لە ڕێگا چاومان بە جێپێی شاخەوانەکانی سوویسی کەوت کە دوای ڕێگا خۆشەکە بۆ لای باشووری کێوەکە ڕۆیشتبوون و ڕێگایەکی ئەستەمیان هەڵبژاردبوو. بیدا فۆرتسی، و ڕاڵف تیسەمپ بەو ڕێپێوانە ڕێگای ئێمەیان هاسان کردبۆوە و کەمێک لە

سەرتر بەهۆی بارینی بەفر جێپێکەیان پڕببۆوە کە ئەویش بوو بە هۆی دەردەسەرێکی تر بۆمان، بەلام قسەکانی وێندا کە چەند حەوتوویەک پێش لەو شوێنە ببوو زۆر یاریدە دراین، بەلام کاتی تەپومژ هەموو ئەو نیشانە و قسانە دەبنەوە هیچ و دلنیا بووم کە دەبێ بڕۆینە سەرێ. ئێوارە بوو، کاتژمێر شەشی ئێوارە و هەواش بەرەو تاریکی دەچو و کاتژمێرێکی تر هەوا تاریک دەبوو. گەیشتینە نێو دالانێک کە لەوێ چاومان بە پاکەتی سووپی فەڕەنسی کەوت. کەوتمە بیرکردنەوە، وێندا بە منی گوتبوو کە پێش گەیشتنە لووتکە دوو دالانت دێتە سەر ڕێ، کەوایە وێندا شەو لە دالانی یەکەمدا ماوەتەوە. لەو بیرەدا بووم کە ئایا من بەهەلە چووبووم یان لە دالانی یەکەمدا بووین. تادێژ گەیشتە لام و ڕووداوەکەم بۆ ئەویش گێڕاوە. ئەو گوتی ئەوشۆ لێرە دەمێنینەوە و بەیانی زووش بۆ لووتکە وەڕێدەکەوین. زوو نارەزایەتی خۆم دەربڕی چونکە دەمزانی زۆرمان نەماوە بۆ لووتکە و مانەوەشمان لەو بەرزاییە باش نییە و دەبێتە هۆی نارەحەتیمان و گوتم دەڕۆینە سەرێ، هەموو ئەو تالییەمان بۆ ئەوە بوو کە خۆمان بگەیەنینە ئێرە و هەر ئێستا دەبێ کارەکەمان کۆتایی پێبێنین چونکە مانەومان هەتا بەیانی لەو بەرزاییە دەبتێە هۆی لەدەستدانی هێز و توانامان، ئەوکات ناچارین بەرەو خواربینەوە، دەبێ هەرچی زووتر خۆمان بگەیەنینە ئەو پزووە بەفرەی کۆتایی ڕێگا و لەوێ هەموو شتێکمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. کاتێک گەیشتینە سەر پزووە بەفرەکە ڕێگاکە ئاسان بۆوە و لووتکەشمان لێ وەدەرکەوت. هاوارم کرد گوتم وەرە لووتکەکە لێرەوەیە و تەنیا کەمێکمان ماوە. ئەوجار لە سەر وەلامدانەوە ڕانەوەستام و دوای تاوێک گەیمە سەر لووتکە. پشوویەکم دا و هێندێک ماندوویەتیم حەساوە و دەروونم ئارام بۆوە. بە دوای دووربینی وێنەگرتندا دەگەڕام کە لەپڕ تادێژیش بە هانکەهانک خۆی گەیاندە لام. پیرۆزباییمان بە یەک گوت، دەستم لە ئەستۆی کرد و پێم گوت ئەوە یەکەمین ٨٠٠٠ی ئێوەیە؟ قسەکەی منی بڕی و گوتی بۆ ئێوە یازدەهەمینە. تا ئەو کاتە تادێژ لووتکەیەکی ٨٠٠٠ میتری نەبەزاندبوو. ئێستا پێی نابووە سەر دووهەمین لووتکەی جیهان، ئەویش لە ڕێگایەکی تازە و زۆر ئەستەمەوە. دوای گرتنی وێنە لە تاریکیدا بەرەو خوار بووینەوە و

خۆمان گەیاندە ئەو شوێنەی کە کەلوپەلە زیادییەکانمان لێدانابوون. قەوەی چرای نێوچاوانەکەم لێکەوت و ون بوو. ئەگەرچی لە کاتێکی زۆر ئاستەمدا بووین و بەفریش دەباری، لە تاریکیدا ژوورێکم بە بەفر دروست کرد و چاوەڕوان هەتاکوو بەیانی پاڵمان وێک دا.

ڕۆژی دوایی لە کاتێکدا دۆزینەوەی ڕێگا بەهۆی تەپومژ و بەفر بارین زۆر سەخت بوو، بە ڕژدیکی زۆر سەختدا و بە سوود وەرگرتن لە تەناف چووینە خوارێ و دۆزینەوی ئەو تەنافە کۆنەش زۆری یاریدە داین. بە هۆی وەبەر شەو کەوتن بۆ چوارەمین جار لە بەرزاییەکی زۆردا ناچار بووین بمێنینەوە، بەلام ئەوجار ژووری بەفریمان دروست نەکرد و هەر لە قوڵکەیەکدا خۆمان حەشاردا و بەو جۆرە لاقەکانمان هەتا بەیانی بە دەرەوە بوون. ئەو شەوەشمان تا بەیانی بەزیندوویی تێپەڕ کرد. بە ڕووناکبوونی هەوا هەورەکان لاچوون و توانیمان ڕێگایەک بدۆزینەوە کە بەرەو شوێنی خێوەتی ئۆتریشییەکان دەچوو. خۆ کۆکردنەوە لە بەرەبەیاندا کەمێک کات دەبا. بەستنی کرانپۆنەکان کاتێکی تایبەتی ویست لەوەدابوو کە بە تادێژم گوت تا دووبارە هەوا نەبۆتەوە تەپومژ من دەڕۆمە پێش و ڕێگاکە دەدۆزمەوە، ڕاستی تەنافەکەت لە بیر نەچێ لەوانەیە پێویستمان بێ.

ئەویش لێی سەلماندم. ٣٠٠ میتر بە ڕێگادا چوومە خوارێ و خێوەتەکانم چاو پێکەوت و ئەوجار بیر و خەیاڵم ئاسوودە بوو. لە سەر تادێژ ڕاوەستام و چاوەڕوانیم کرد، هەرکە لێم نیزیک بۆوە گوتم باش بوو زوو هاتی، خێوەتەکان دەبینی؟ زووبە تەنافەکە دەربێنە با بڕۆینە خوارێ و ئەو. ڕژدە ناخۆشە تێپەڕکەین ئەوجار گرفتێکمان نامێنێ. لە وەلامدا گوتی تەنافمان پێویست نییە بۆیەش لەبیرم چووە. ناچار بێ تەناف و بە یاریدەی کوڵینگ و کرانپۆن ڕوو بە ڕژدەکە هەنگاو بە هەنگاو چووینە خوارێ کە لەپڕ یەکێک لە کرانپۆنەکانی تادێژ دەرهات و دوای ساتێک ئەوی تریشی لە لاق بۆوە. زۆری حەوڵ دا خۆی ڕاگرێ و کوڵینگەکەی لە بەفر ڕۆکا بەلام نەیتوانی و وەک کەسێک ژێر لاقی بەتاڵ کەن وابوو. ئەگەرچی منیش هیچم لەدەست نەدەهات، زۆر بە توندی بە لای مندا تێپەڕ بوو و بەربۆوە کوڵینگەکەشی لە بەفرەکەدا بەجێ ما و هاواری کرد یوور......ک. هیچم لە دەست نەدەهات، خۆم بە زۆری لە

ڕژدەکەدا ڕاگرت و دوای چەند خولەک هۆشم هاتەوە بەر خۆم. تەنیا لەتکە سەهۆڵەکان بوون کە بە دوایدا خللۆر دەبوونەوە و هیچیتر نەدەهاتە بەرچاو. بە ڕێگای بەربوونەوەی تادێژدا ڕۆیشتمە خوارێ. هێندێک لە پێش خۆم هەردووک کرانپۆنەکانم دۆزییەوە، هەڵمگرتنەوە و بەو هیوایە بووم کە لەوانەیە بتوانێ کەلکیان لێوەرگرێ. ماوەی چەند کاتژمێر بەدوایدا گەڕام بەلام نەمتوانی هیچ هەواڵێکی لە بەدەست بێنم. زۆر ماندوو بووم و بۆ لای خێوەتەکان وەڕێکەوتم. لە پێش خۆم چەند قوتووی کۆمپۆتم دۆزییەوە. بە کەلک وەرگرتن لە ئاور ویستم ئەوان گەرم کەمەوە و لە دواییدا چوومە نێو کیسەخەوکە و وەبیرم هاتەوە کە لەوانەیە ئەو خێوەتە بێسیمی لێبێ. گەڕام دۆزیمەوە و زۆرم دەست تێوەردا و لە هەمان کاتیشدا لە بیری دروستکردنی ئاودا بووم. سێ ڕۆژ بوو دڵۆپێکیشم نەخواردبۆوە. لە بیر خۆمدا پێم وابوو بەهۆی بێسیم بەوانم ڕاگەیاندووە و دەنگە دەنگێکیشم دەهاتە بەر گوێ. کاتێک چاوم هەڵێنا تێگەیشتم کە بیستکاتژمێرە خەوم لێکەوتووە. دووبارە هەوڵم دا لەگەڵ خێوەتگای تایبەت قسە بکەم بەلام بێکەلک بوو. لە دەرەوەی خێوەتەکان یەکێکم چاو پێکەوت کە دەهاتە سەرێ، وامزانی گرووپی پشتیوانین و هاتوون یاریدەمان دەن. لەوەی کە ئەوندە زوو هاتوون بەتەواوی سەرم سووڕ مابوو. بەلام هیچ وانەبوو بەڵکوو شێرپاکانی گرووپی کۆریای باشوور بوون کە بار کەلوپەلەکانیان بۆ دەهێنانە سەرێ و ئەوجار بەسەختی دەبوو ئەوانم تێگەیاندبا. بە هەموو هێز و توانەمەوە هەرچی لە زمانی ئینگلیزی دەمزانی دەستم پێکرد. دوێنێ ڕووداوێک ڕووی داوە و قسەکە هەر یەکێک بوو و هیچم لێ تێنەدەگەیشتن. دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کۆرەییەکم چاو پێکەوت کە زۆری ڕێز لێگرتم. تازە تێگەیشتم کە بێسیمەکە خرابووە و بێکەلکە و کەسیش دەنگی منی گوێ لێنەبووە. ئەوجار بە کەلک وەرگرتن لە بێسیمەکەی ئەو توانیم لەگەڵ خێوەتگای تایبەت پەیوەندی بگرم. کۆرەییەکان یانۆژ مایەریان بۆ بانگ کردم کە خێوەتی

لێهستانیەکان زۆر لەوان دوور نەبوو. هەموو ڕووداوەکەم بۆ گێڕانەوە و سەرەتای شەوێ خۆم گەیاندەوە خێوەتگای تایبەت. یانۆژ لەگەڵ گرووپەکە داوێنی کێوەکەیان هەموو گەڕابوو، بەلام نەیانتوانی مەیتی

یانۆژ بدۆزنەوە. سویسییەکانیش کەمێکی بەدوادا گەڕابوون بەڵام بێکەلک ببوو. هەر لە لای خۆم بیرم دەکردەوە بۆچی ئەو ڕووداوە پێش هات، بۆچی کرانپۆنەکانی هاتنەدەر و ئاواتی مردنم دەخواست. زۆر ماندوو بووم و سەرەڕای ئەوەش هیچ هەواڵێکم لەوە نەبوو کە لەو ماوەیەدا K٢ کوشتەی زۆر لێکەوتۆتەوە کە لە پێش تادێژدا دوو ئەمریکایی بە ناوەکانی ئیسمۆلیش و پنینگتۆن و دوو فەڕەنسیش بە ناوەکانی موووریس و لیلیان بارار بەهۆی ڕنوو و ونکردنی ڕێگا گیانیان لە دەست داوە و بە دوای تادێژدا ١٣ شاخەوانی تریش گیانیان لە دەست دا کە دوو کەسیش لەوان بە ناوەکانی مروفکا و ویتیک ویرژ لێهستانی بوون. ١٠ ڕۆژ بە لاقی سەرما بردوو هەتا ئیسکاردۆ چەتوون بوو. ئەوجار داوای دوکتۆری ئیتالییایم سەلماند و بە هێلیکۆپتێر گەڕامەوە. لە شوێنی خێوەتگای تایبەت چاوم بە ئیتالیاییەک کەوت بە ناوی ڕیناتۆکا سارتۆ کە بە لای باکووری ڕۆژئاوای ڕێگای باکووری کێوەکەدا تا بەرزایی ٨٢٠٠ میتری جارێک وەسەر کەوتبوو و سێ جار هەوڵی دابوو و دیگوت ئەوجاریش دەیهەوێ بۆ ئاخر جار تێبکۆشێ. لەو کاتەدا کە زۆر بەتوندی دەستی منی دەکوشی، گوتی ئەگەر گەڕامەوە بۆ وتووێژی شاخەوانانی لێهستان لە کۆبوونەوەکەتاندا بەشداری دەکەم و دێم بۆ لاتان. لە گەڕانەوەمدا بۆ ئیسکاردۆ، هەواڵی هەواڵنێری ڕادیۆ ڕایگەیاند کە کەسێکی ئیتالییایی لە چوونە سەرێکی بەتەنیادا تا بەرزایی ٨٣٠٠ میتری چۆتە سەرێ و لە گەڕانەوەدا کەوتۆتە نێو قەڵشە سەهۆڵێکەوە. کاتێک دەیهێننە دەرەوە بەهۆی سەختی برینەکەی گیانی لەدەست دەدا.

حەوتوویەک دوای گەڕانەوەم بۆ لێهستان چووم بۆ لای دانکا خێزانی تادێژ و هەموو فیلم و وێنەکانی کە لەوم گرتبوو لەگەڵ هێندێک کەلوپەلی تر کە لەو بەجێمابوون، بۆم بردنەوە. دەستەکانم توانای زەنگلێدانی دەرگای ماڵی ئەوانی نەبوو. هەر کەدەرگای کردەوە و چاوی بە ڕوخساری ماندووی من کەوت هەوڵی دا کە زوو ئەو وێنەیە لە بەر چاوی من و خۆی پاک کاتەوە. چوومە ژوورێ و ڕۆژێکی تەواو لەگەڵ ئەو و جیرانەکانیاندا بووم. ئەگەرچی وا دیار بوو کە هیچیانیشی نەدەناسی و ئەوانیش هیچ لە شاخەوانی تێنەدەگەیشتن

بەلام نەمدەتوانی کە ئەوە بسەلمێنم کە گوناهبار نیم˙ هەمیشە خۆم وەک گوناهبارێک دەهاتە بەر چاو، بەلام ئەوان زۆر بەئەسپایی ئەوەیان بە من گوت کە ئەگەرچی تادێژمان لە دەست داوە بەلام بۆ ئێوە و سلامەتیتان دۆعا دەکەین و خۆشحالّین کە زیندوون˙ وا بزانم لەو کاتەدا باشترین قسەیەک بوو کە دەبوو گوترابا˙



## بەشی کوتایی

**هەر ئەودو تەواو**

**ماناسولو لای باکووری رۆژهەلات، سالی ١٩٨٦**

کەسێک کە مێشکی لە سەردا بێ لەگەڵ تۆ بۆ کێو نایا. هەرکەس بە دەوروبەرتدا هات کۆتایی بە ژیانی هات. ئەوە ئەو گاڵتانەن کە ئارتور هایزێر لەگەڵ کۆکۆشکای دەکرد؛ قسەی دڵی زۆر بوون. لەو دوایانەدا شاهیدی چوار بەرنامەی تاڵ بووین کە هەموو بە ڕووداوی تاڵ و ناخۆش کۆتاییان هات؛ سەیر ئەوە بوو کە کەس قسەی لە سەر بەرنامەکانی پێشتری من کە هیچ ڕووداوی تاڵیان تێدا نەبوو نەدەکرد؛ گەرچی هیچ گوێم نەدایە و قسەکانیشم بە دڵ نەگرت، وەڵامیشم نەداوە و تەنیا بیرم لە لووتکەکانی ماناسولو و ئاناپورنا بەر لە بەرنامەی $K_{٢}$ دەکردەوە؛ لەوەی کە پێشتریش ئارتورم دەناسی داوام لێکرد لەو دوو بەرنامەیەدا هاوڕێیم بکا؛ ئەویش هەر لەو یانەیە بوو کە ئێمە کارمان لێ دەکرد زۆر بە باشی دەمناسی و لە بەرنامەی لای باشووری لۆتسەشدا زۆر بە باشی کارەکانی بەڕێوە بردبوو کە لە بیرم

نەچووبۆوە· پێداویستیەکانی ماڵیمان لە لایەن هێندێک لە سازمان و بەڕێوەبەرایەتییە وەرزیشییەکانەوە دابین کرا· ڕێژەی کەمبوونەوەی لە سەدا پەنجای بلیتەکانمان کارەکەی بۆ هاسانتر کردینەوە·

ویتیک کۆرتیکاش لە کاتماندۆ چاوەڕوانمان بوو· ئەو لە کاتی بەزاندنی لووتکەی $K_2$ لەگەڵ ژاپۆنییەکان دەیهەویست بورجی ترانگۆ ببەزێنێ کە بەرزایی ٦٢٠٠ میترە و زۆر ئەستەمە· لەوی کە هیچ بەرنامەیەکی بۆ پاییز نەبوو داوام لێکرد لە کاتماندۆ بمێنێتەوە و لە بەزاندنی ئەو دوو لووتکە هاوڕێمان بێ· لە لایەکەوە کارلۆس کارسۆلیۆ و ئاویلای میکزیکی لەگەڵ ئیدەک و ڕیشترلوندی ئۆتریشی لە گرووپی ئێمەدا بەشدار بوون کە لەو دواییانەدا توانیبوومان جلوبەرگ و کەلوپەلی شاخەوانی، لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ کارگای درووستکردنیدا بە دەست بێنین کە بۆ یەکەم جار کەلکمان لێ وەردەگرتن· جلوبەرگێک کە لە ژیانمدا ئاواتی بوونیانم هەبوو· دوو بەڵگەی پێویستیشمان بۆ بەزاندنی لووتکەکان بە دەست هێنابوو کە یەکێک لەوان ماناسۆلۆ بوو کە لە بواری تکنیکییەوە ڕاحەت بوو کە بۆ یەکەم کار ئەومان هەڵبژارد·

بە هۆی بارانەکانی وەرزی پاییز و زێرووەکانی نێو ڕێگا، ڕێگایەکی خۆشمان بە نێو دۆلە ترسناکەکاندا هەتا خێوەتگای تایبەت تێپەڕ کرد· بەکەلک وەرگرتن لە ویدیۆفیلم توانیمان بۆ یەکەم جار لە هەموو شوێن و ڕووداوەکان و تەنانەت خەرج و مەخاریجەکانیشمان فیلم هەڵگرینەوە چون دەیانەویست فیلمان لێ بکەن· مەسەلەن پارەی هەر کۆڵکێش ٤٥ ڕوپییە بوو و ئەفسەری یاریدەدەری گرووپەکە ٤٠ ڕوپییەی دابوو بە هەرکامیان· ئێمە هەموومان تۆمار کردبوو، چۆنیەتی باری ماڵیی ئێمە جۆرێک بوو کە دەبوو زۆر وریا باین و هەموو شتێکمان چاوەدێری کردبا· لێرەدا زۆر شتی تریشم وەبیر دەهاتەوە کە هێرلیگ کۆفێر دەیگوت بەهۆی چەند شتی کەم و چکۆلە و کەمبایخ مێشکی خۆتان تێک مەدەن و بیر لە شتی بەکەلکتر بکەنەوە و کاتیشیان لە سەر دابنێن·

لە بەرزایی ٤٤٠٠ میتری شوێنێکی گۆڕ و خۆش بوو بۆ خێوەتەکان و لە وێوە تا داوێنی بەفرەکان ٢ کاتژمێری ڕێپێوان

هەبوو. ئێمە لە هەوڵی ڕێگایەکی تازەدا بەلای ڕۆژهەلات بۆ بەزاندنی لووتکەی ٧٨٩٥ میتری بووین کە هەتا لووتکەی تابێت ٢٦٠ میتری بەرزایی دەما. دوای حەوتوویەک باران بارین وشترلۆند و خێزانەکەی کە گەیبوونە کۆتایی پشوودانیان، لەگەڵ وێنەهەڵگری گرووپەکە تووشی نەخۆشی بوون و ئێمەیان بەجێ هێشت. کاتێک لە خێوەتگای تایبەت بووم جاروبار گوێم دەدا ڕادیۆ و چۆنیەتی هەواڵی بەزاندنی لووتکەکانی مێسنێرم گوێ دەدایە کە بۆ ماکالۆ چووبوو و بەڵگەی پێویستی لۆتسەشی لە گیرفاندا بوو. بەو جۆرە زۆری نەمابوو کە لە پێش مندا کۆتایی بە بەزاندنی هەموو لووتکە ٨٠٠٠ میترییەکان بێنێ، پوڵ و بەڵگەی پێویستی هەبوو، بەختەوەر بوو، بەلام وا باشە ئەوەش بڵێم کە بەڕاستی شاخەوانێکی بە تواناش بوو، هەر بەو هۆیەش چاوەڕوانی پیرۆزبایم دەکرد. ئەوەی ڕاستی بێ سەبریشمان کۆتایی هات و هەواڵی بەزاندنی ماکالۆشم گوێ لێبوو و هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا و هەوڵی هەرچی زووتر بەزاندنیشم لە بیر خۆم بردەوە. لە خێوەتەکەم چوومە دەرێ و ویستم کەمێک بە تەنیا بم. هێشتا کێوەکانی وەک ماناسولۆ، ئاناپوڕنا و شیشا پانگمام لە پێش بوون کە دەبوو بیانبەزێنم. چاوم هەڵێنا و ڕوانیمە کێوە پڕ بەفرەکانی لای ڕۆژهەلاتی ماناسۆلۆ و بەڵێنیم بە خۆم دا کە هەر لە بەیانییەوە دەستبەکار بم. ڕێگا پڕ بەفرەکە چاوەڕوانی ڕنووی لێدەکرا دەبوو کارگا بە کارگا ڕۆیشتباین کە زۆر ترسناک بوو.

ئەگەرچی هیچ هەواڵێکمان لە هەواناسی نەبوو، لە بەرزایی ٦٠٠٠ میتری گەیشتینە شوێنێک کە ترسێکی زۆرمان لە ڕنوو هەبوو. لەوێ ویتیک پرینگاوە و ئارتۆریش ئەگەرچی ڕازی نەبوو بەلام نەیدەویست دەست لەو ڕێگایە هەڵگرێ، هەر مابۆوە کارلۆس، داوای ئەویش زۆر سەیر و سەرسووڕهێنەر بوو، بە ڕادەیەک پێکەنیبووین کە زگم دێشا، دەیگوت ئێوە باش دەزانن کە دۆخی ماڵی میکزیک ئێستا زۆر باش نییە و لەوانەیە بۆ جارێکی تر ئەو هەلەمان بۆ نەڕەخسێتەوە کە بتوانین بێینەوە ئێرە، بەو هۆیە من ڕازیم درێژە بە ڕێگا بدەم. لە لایەکی تریشەوە کەلوپەلی خواردنیشمان کەم هێنابوو، بەو هۆیانە گەڕاینەوە خوارێ و کۆڵکێشێکی بەتوانامان بەڕێکرد بۆ کڕینی کەلوپەلی خواردن.

دوو بۆشکە خواردنیان لێ دزیبووین و ئەوەش هێندێک گرفتی بۆ پێش هێنابووین، هەر بەو هۆیەش لە سەرەتاوە خواردنەکانمان بە سەریەکدا دابەش کرد. زۆربەی شتە وردەکان و نیوەی قوتووە گۆشتێک بۆ پێنج کەس دادەندرا کە خواردنێکی شاهانەی لێ دەکەوتەوە. بە هۆی ئەو ڕووداوەش زۆربەی هاوڕێیان بەتایبەت ویتیک دڵنیگەران ببوو. کارلۆسیش بەهۆی کارتێکەری سەرما لە دەستی گەڕابۆوە خێوەتگای تایبەت و توانیبووی هێندێک خواردن لە گرووپی کلۆمبیاییەوەرگرێ. دوای مانگێک تێکۆشان و بارینی بەفری زۆر، بۆ چوارەمین جار هەوڵمان دا لووتکە ببەزێنین. خێوەتگای دووهەممان لە بەرزایی ٦٤٠٠ میتری هەڵدا و لە نێو خێوەتدا چاوەڕوانی هەواڵی کەشوهەوای خۆش بووین. هەواڵێکم لە ڕادیۆ گوێ لێبوو کە گوتی شاخەوانی بەتوانا، ڕێنهۆڵد مێسنێر توانی لووتکەی لۆتسەش ببەزێنێ و پاڵەوانییەتی هەر چاردە لووتکەی بەرزی جیهان بەدەست بێنێ و بە ناوی یەکەم کەس بناسرێ. بێدەنگی فەرمانی دا و کەس توانای ئەوەی نەبوو کە چی تر لە هەواڵەکان گوێ ڕاگرێ. دوای تاوێک ئارتۆر بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی باشتر، ئیتر پێویست ناکا بۆ لووتکە بەزاندن پەلە بکەین.

ئاخری لە سەرەوەی خێوەتگای دووهەم و لە بەرزایی ٧٠٠٠ میتری پەنایەکمان دۆزییەوە و خۆمان حەشار دا. ئەگەرچی بە باری سووکەوە وەسەر دەکەوتین، بەڵام پەنجا ڕۆژ بوو لە هەوڵ و تێکۆشانی لووتکە بەزاندندا بووین و هیچ دڵنیا نەبووین بیبەزێنین، بەو هۆیە داوام لە ئارتۆر کرد و گوتم وا باشە دەست لەو ڕێگا تازەیە هەڵگرین و هەر بە ڕێگای تایبەتی کێوەکەدا وەسەر کەوین. لە تێکۆشانێک کە لە سەر ڕێگای تایبەتی کێوەکە بەڕێوەمان برد توانیمان تا بەرزایی ٧٤٠٠ میتری وەسەر کەوین. ئارتۆر لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بگەڕێینەوە خوارێ، بەڵام داوای منیان سەلماند و گوتم وا باشە بەهۆی ئەو بایە و نیزیک بوونەوە لە شەو، باشترین کارمان ئەوەیە بۆ زیندوومانمان شەو لەو خێوەتەکەدا بمێنینەوە. وا دیار بوو سەرکەوتنمان لە دەست دابوو. بەیانی ڕۆژی دوایی ئەگەرچی زۆرمان سەرما بوو و هەڵدەلەرزین چاوێکمان بە ڕێگاکەدا خشاند و بەرەو خوار بووینەوە. کارلۆس بەرەوپیلمان هات هەتا پیرۆزبایی بەزاندنی لووتکەمان پێ بڵێ کە زۆرم

خۆش لەو هەڵوێستەی هات ئەگەرچی ئەوەی ڕاستی بێ نەیدودەویست بێ سەرکەوتن بگەڕێمەوە. وام بەباش زانی کە جارێکی تریش بۆ لووتکە بەزاندان تێبکۆشین. کارلۆس وەدەنگ هات و گوتی منیش دێم. ئەوجار پێمڕاگەیاندن و گوتم دەست لە ڕێگای تایبەتی لووتکە هەڵدەگرین، چونکە ئەو ڕەوەزە دووردرێژەی ڕۆژهەلاتی لێدەبێتەوە و هەر بە ڕێگای ڕاستی لای باکووری سەهۆڵەکانی ڕۆژهەلاتی کێوەکەدا وەسەر دەکەوین.

دوای سێ شەو خۆمان گەیاندە شوێنێک کە پێشتر شەوێک لەوێ مابووینەوە. لە ژێر ڕەوەزەکانی لووتکەی ڕۆژهەلات و لە بەرزایی ٧٨٠٠ میتریدا خۆمان حەشار دا. وا باشە ئەوەش بڵێم کە کارلۆس لە وەسەرکەوتندا کەمێک وەدوا کەوتبوو. من بە درێژایی دوو تەنافی ٨٠ میتری لە پێشەوە دەڕۆیشتم و بەهۆی نەهاتنی با کە خزمەتێک بوو پێی‌دەکردین، توانیمان خۆمان بگەیەنینە لووتکەی ڕۆژهەلاتی کێوەکە. بەوجۆرە بەفریش دەستی کرد بە بارین و بەو هۆیە ڕێگامان لێ ون بوو، بەلام بەهۆی هەڵدانی خێوەتەکە لە مردن ڕزگارمان بوو. ئارتۆر بەهۆی ئاوری گاز، بەفری تواندەوە و ئاوی دروست کرد. بەیانی ڕۆژی دوایی کە هەوا زۆر سارد بوو، حاڵی کارلۆس زۆر باش نەبوو. حەبێکم بۆ وەگەڕخستنی خوێن دایە و ویستمان بگەڕێینەوە سەر ڕێگای تایبەتی کێوەکە، بەلام هەر کە سەرم لە خێوەتەکە دەرهێنا دیتم مەودایەکی زۆرمان لەگەڵ لووتکە نییە. زۆرم لە بەر گران بوو بگەڕێمەوە و گوتم دەست لە هیچ شتێک مەدەن، بۆ لووتکە وەڕێ دەکەوین. بیروباوەڕمان زۆر لێک جیاواز بوو، من دەمگوت هەتا لووتکە دوو کاتژمێر دەخایەنێ بەلام ئارتۆر دەیگوت ڕۆژێکمان پێدەچێ. کارلۆس لەگەڵمان نەهات و هەر کە تاو هەلات بەهێزتر بووین و دوای یەک کاتژمێر و ٤٥ خولەک هەردووکمان خۆمان گەیاندە لووتکە و بەهۆی سەهۆڵبەستنی دووربینەکەمان، هەر توانیمان وێنەیەک بگرین. کارلۆس خێوەتەکەی کۆ نەکردبۆوە و خەوی لێکەوتبوو، بەلام ئێمە هیچ گلەییمان لێنەکرد و هەموو کەلوپەلەکانمان کۆ کردەوە و بەرەو خوار بووینەوە. شەو لە دووسەد میتر خوارتر ماینەوە و ئەوجار هەناسەمان باشتر بۆوە، بەلام حاڵی کارلۆس باش نەبوو.

حەبێکی تریشمان دایە و هەر بەلادا دەهات. هێندێکمان لە کەلوپەلەکان لێ وەرگرت و تێگەیشتین کە لە لووتکەی ڕۆژهەلاتەوە هێندێکی بەرد بۆ بیرەوەری لەگەڵ خۆی هێنابۆوە. چۆنیەتی ئەو منی وەبیر حاڵی خۆم هێنایەوە کە لە بەرنامەی مەککینلی بە سەرم هاتبوو. بەو جۆرە ویستم بەردەکانی لێ فڕێدەم کە کارلۆس بە سەرمیدا گوڕاند و گوتی هۆی فڕێیان مەدە ئەوانەمان لە زانکۆی میکزیک پێویستە. لەوەی کە ئەو بەردانە بە کەلکی چی ئەوان دەهات سەرمان سووڕ مابوو. بەلام ئەو ڕووداوەش بوو بە هۆی ئەوە کە کارلۆس حاڵی باشتر بێت و هۆشی بێتەوە بەرەخۆی. کە دەچووینە خوارێ، پێش ئەوی کە بگەینە جێی کلۆمبیاییەکان تووشی دالانێک بووین کە چوار میتری قوولایی بوو و زۆری وەدوا خستین. زۆرمان هەوڵ دا کە بازدەین و لێی بپەڕینەوە بەلام هیچمان زاتی ئەوەمان نەبوو. هەتا کۆتایی ڕۆژ هەر هەوڵمان دا بەلام نەماندەوێرا و لە کۆتاییدا بەوە گەیشتین کە لایەک هەڵبژێرین، یان بازدان یان مردن. ئاخری هەر واشی لێهات، زگمان بە لایەکی داڵەنەکەوە نا و هەرسێکمان پێیدا هاتینە خوارێ و ڕزگاریمان بوو. ڕۆژی دوایە گەیشتینەوە خێوەتگای تایبەت و تازە تێگەیشتین کە چۆنیەتی لاقەکانی کارلۆس چەند شپرزە بووە و دەنگیشی نەکردووە. داوامان کرد هێلیکۆپتێرێک بێ تا بە زووترین کات بگەڕێتەوە خوارێ و بەوجۆرە بۆخۆمان ناچار بووین ١٠٠٠ میتری تر ئەو بەرینە خوارێ. یەکێک لە کۆڵکێشەکان نامەیەکی لە لایەن ڕیزیک واریسکییەوە بۆ هێنابووم کە لەویدا نووسرابوو بەڵگەی پێویستی ئاناپۆرنامان تا ڕۆژی ٢٥ی نۆوامبر بۆ تازە کردوونەوە. بەخت ڕووی تێکردبووین و ئەوجار لەگەڵ کارلۆس بە هێلیکۆپتێر بۆ کاتماندۆ گەڕاینەوە و ئارتۆریش لە خێوەتگای تایبەت کەلوپەلەکانی ڕێکوپێک کرد تا بۆ بەزاندنی ئەو لووتکەیەش خۆمان سازکەین. دوکتۆر یوگۆسلاو زۆر بەباشی عیلاجی لاقەکانی کارلۆسی کرد و بێ ئەوەی بیانبڕێتەوە چارەسەری بۆ دۆزینەوە. منیش لە بەڕێوەبەرایەتی گەشتوگوزاری ولاتی نیپاڵ بەدوای تازەکردنەوەی بەڵگەی پێویست بووم، بەلام تێگەیشتم کە باشتر ئەوە بوو کە بە جێگای ئەوەی بێمە ئێرە، ڕاست چووبام بۆ داوێنی کێوەکە و لەوێوە داواکەم بۆ نووسیبان هەتا لێیان سەلماندبایین. لە کۆتاییدا بە نارەحەتی بەرەو

لێهستان گەڕامەوە. ئارتۆری مالۆیران زۆر ماندوو و شەکەت ببوو و ڕێگای ١٠ ڕۆژی بە سێ ڕۆژ تێپەڕ کردبوو و هاتبۆوە خوارێ. کاتێک تێدەگا کە ئاناپۆڕنایەک لە گۆڕێدا نییە زۆر نارەحەت دەبێ بەلام بەوە خۆشحاڵ بوو کە لووتکەیەکی ٨٠٠٠ میتری لە ڕێگایەکی تازەوە بەزاندبوو. ئەو لاوە ئاواتخوازە دەیهەویست خوێندنەکەی لە زانکۆی سیلسییا کۆتایی پێبێنێ کە زۆر وەدوا کەوتبوو. بە ئارتۆرم گوت لە خوێندن گەڕێ و وەرە با بەیەکەوە ئاناپۆڕنا ببەزێنین. گوتم ئێوە لاون کاتتان زۆرە بۆ ئەوە. یەکەوڕاست گوتی: وەرە با بڕۆین.....



**جەهەننەمی ساردی ئاناپورنا**

**زستانی سالّی ١٩٨٧**

چۆنیەتی کۆکردنەوەی پێداویستییەکانی بەرنامەی ئاناپۆرِنا، کات و ساتی لێکردبووینە جەهەننەم. بەوجۆرە هاوکاریی ئارتور هایزێر و کریزیسک ویلیسکی، دلّنیایان کردبووین. میشێل تۆکادژۆسکی لە وەرشۆ رِدگەلّ ئێمە کەوتبوو و وێندا رِۆتکیویچیشمان هەلّبژاردبوو بۆ هەلّگرتنەودی فیلم کە بیدا بە تەلەفیزۆنی ئۆتریش کە لە باری مالّییەود بۆ ئێمە باش دەبوو. هەلّبژاردنی ویندا هیچ کاری بە بەرنامەی پێشتری تێکەلاوی ژنان نەدابوو، هەر بۆخۆم تواناییەکانی ئەوم هێنابووە ژمار و بە مرۆڤێکی بەتوانام دەناسی کە بەو جۆرە ئێمەی لە هێز و توانای خۆی تێگەیاندبوو. لە نێوان ئەو گێرەوکێشانەی کە لە مالّی خۆماندا هەمانبوون دانیشتبووم. لەپرِ تەلەفۆنی مالّمان زەنگی لێدا. کەسێک لە ئیتالییا بوو کە دەیهەویست لە گرووپی ئێمەدا بەشدار بێ و بۆ ئەو بەشداربوونە ٤٠٠٠ دۆلار بدا. گوتم دەبێ لەگەلّ هاورِێکانم قسە بکەم. بەلام دوای ئەو تەلەفونێک لە لایەن خێزانەکەیەوە کرا کە

داوای لێکردم نەهێڵم ئەو لەو بەرنامەیەدا بەشداری بکا˙ بەشداربوونی ئەو کەسە ئێمەی لە نێو بیر و خەیاڵات هاویشت˙ ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە پێویستمان بە پارە هەبوو˙ ئەوجار پێم گوت ڕێپێوان تا خێوەتگای تایبەتی ئاناپۆرنا ئەویش لە زستاندا کارێکی زۆر باش و بەکەڵکە، ئەویش سەلماندی و گوتی زۆر باشە˙ بەوجۆرە لەگەڵ ئێمە هاوڕێ بوو˙

هەرکە گەیشتینە کاتماندۆ تێگەیشتین کە بەڕاستی نامەکان هەڵە بوون و هیچ بەڵگەی پێویستیش لە گۆڕێدا نییە˙ بەلام بە خۆشییەوە بەهۆی دۆستایەتی ویندا لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی بە هاوارمان گەیی و توانیمان بەڵگەی پێویست بۆ بەزاندنی ئاناپۆرنا وەرگرین و درێژە بە بەرنامە بدەین˙ نەماندەزانی ڕێگاکە بە کوێدایە، لە لایەکەوە لە هەوڵی ئەوەدا بووین کە لە زستاندا بە ڕێگای باشووری کێوەکەدا وەسەرکەوین و لە لایەکی ترەوە لە تێدەکۆشاین بە لای باکووری کێوەکەدا و بە ڕێگای فەڕەنسییەکاندا کە ساڵی ١٩٥٠ پێیدا وەسەر کەوتبوون و تا ئێستا هیچ کەس لە زستاندا نەیتوانیبوو وەسەرکەوین کە زۆربەی شاخەوانان و شێرپاکان لەو ڕێگایەدا گیانیان لە دەست دابوو˙ لە تێکۆشانی گرووپێکی ژاپۆنیشدا کۆڵکێشەکانیان بەر لەوەی بگەنە بەرزایی ڕێگاکە، بارەکانیان دانابوو و وەسەر نەکەوتبوون˙ ئەوەش ببوو بە هۆی ئەوە کە ژاپۆنییەکانیش سەرکەوتوو نەببوون˙ وا باشە ئەوەش بڵێم کە لە ڕۆژدا کاتژمێرێک ئەو ڕێگایە تاوی وێدەکەوێ و ئەوەش بۆ ئەو شوێنە زۆر کەمە˙ ڕێگای لای باشوور لە کاردا ڕێپێوانێکی زۆر کەمی هەبوو بەلام بەزاندنی لووتکە زۆر ئەستەم بوو و بەسەختی بەڕێوەدەچوو بەلام ڕێگای باکووری لووتکە بۆ بەزاندن هاسانە و لە هەمان کاتدا ڕێپێوانەکەی زۆرە و سەرمایەکی یەکجار زۆریشی تێدایە˙ ئەوەی ڕاستی بێ لەو بڕوایەدا بووین کە ڕێگای باشوور لەوانەیە بەهۆی بای وەرزی بەفری لێ نەمابێ و بەفرەکە زۆرتر لە ڕێگای باکوورەوە بێ˙ بەو جۆرە بەڵێنمان دا لە ڕێگای باکووری شوێنی فەرەنسییەکانەوە وەسەرکەوین کە وا بزانم بیرێکی باش بوو˙ یەک لە سێی کۆڵکێشەکان توانیان خۆیان بگەیەننە خێوەتگای تایبەت˙ ئەو کەسەی کە لە ئیتالییاوە هاتبوو، بەهۆی سەختی و بەستنی سەهۆڵ

لە مەڵبەندەکە زۆر ترسابوو و نەخۆشی گورچیلەشی لێ ودیهاتبوو، ناچار گەڕاوە هەرچەند لە بواری ماڵی یاریدەیەکی باش بوو بۆمان لە دواییشدا چەند جار پەیوەندی پێوە گرتین و لە بواری ماڵی یاریدەی داین. خێوەتگای تایبەت لە بەرزایی ٤٢٠٠ میتریدا هێشتا هەڵنەدرابوو کە بە دانی پێنج بەرابەر پارەی زۆرتر توانیمان کوڵکێشەکان ڕازی کەین بۆ لای خێوەتگای یەکەم وەڕێکەوین. سێ ڕۆژ دوای ئەو ڕێکەوتە توانیمان خێوەتگای سێهەمیش هەڵدەین. کارەکەمان جۆرێک بوو کە نەدەبا هەل لە دەست بدەین، هەر بەو هۆیەش هێشتا خێوەتگای تایبەت بەتەواوی کارەکانی بەڕێوە نەچووبوو کە ئێمە بەهۆی ڕاهاتنمان بە چۆنیەتی کەشوهەوا لە بەرنامەی ماناسلۆدا توانیمان کارەکانی خێوەتگای سێ بەڕێوەبەرین. هەر کەس شاخەوان بێ دەزانێ ئەو جۆرە کارانە چۆن بەڕێوە دەچن. بە ڕێگادا دەڕۆی سارده و نێو خێوەتیش هەر سارده و دەرەوش هەر سارد، ئەوەی ڕاستی بێ ئارام و قەرارت نامێنێ.

بەڕێکردنی کیسەخەو و خێوەت بۆ خێوەتەکانی سەرێ هەر درێژەی هەبوو کە بێ ئەو کەلوپەلە زیادییانە توانای بەزاندنی لووتکەمان نەبوو. بەو جۆرە لێرەدا مەجبوور بووم لەگەڵ ئەو کەسەی کە بۆ بەرنامەکەم بانگهێشت کردبوو بووم بە هاوڕێ و بەڵێنمان دا بەیەکەوە لە تەنافێکدا کار بکەین. یانی من و ویندا بڕیارمان دا خێوەتگای چوار و پێنج لەگەڵ ئارتورکرزیک بەیەکەوە هەڵدەین. ئەوجار بۆ حەسانەوە بگەڕێینەوە خواری بۆ ئەوەی خۆمان ساز کەین بۆ کۆتاییهێنانی کارەکە سەرما بە ڕادەیەک بوو کە مردنمان بە چاو دەدی. بەوجۆرە نووکی کرانپۆنەکانیشمان بەباشی لە سەهۆڵەکەدا کاریان نەدەکرد. بۆ دۆزینەوەی شوێنی خێوەت لە بەرزایی ٦٠٠٠ میتری، بۆ ئەوەی کات لە دەست نەدەین، جێگامان هەر بۆ خێوەتێک خۆش کرد و هەر چوارمان لەو خێوەتەدا لەپاڵ یەک خزاین. شەوانە لەتکە سەهۆڵی چکۆلە بەردەبوونەوە و هەموو خێوەتەکەیان لێ کونکون کردبووین. کاتی مانەوەمان لە خێوەتگا هەر دۆعامان دەکرد کە لەتکە سەهۆڵی گەورەمان بە سەردا بەرنەبێتەوە. لە بەرزایی ٦٨٠٠ میتری و ئەو کاتەی کە دەمانهەویست بگەڕێنەوە خوارێ و خۆمان بۆ بەزاندنی لووتکە ساز

بکەین، لەپڕ بیرێک چۆ نێو مێشکمەوە و گوتم هەلێکی باشە و من بەباشی لەگەڵ کەشوهەوا ڕاهاتووم دەمەوێ بەیانی بەرەوەسەر درێژە بە ڕێگاکە بدەم، کەس بەڵێن دەدا لەگەڵم بێ؟ ویندا ڕاچڵەکا و کریزیکیش کە بە ناوی باشترین شاخەوانی توندوتۆڵ ناوبانگی بەدەست هێنابوو و لە ٢٤ کاتژمێردا لووتکەی برۆدپیکی بەزاندبوو، هەردووکیان بەهۆی ڕانەهاتن بە کەشوهەوای مەڵبەندەکە نەیانتوانی بەڵێنم پێبدەن. بەڵام هێشتا چەند چرکە لە داواکەم تێپەڕ نەببوو کە ئارتۆر وەدەنگ هات و گوتی من لەگەڵتدام. لێشم ڕوون بوو کە کریزیکیش توانای ئەو کارەی هەبوو بەڵام بەهۆی هەواڵی ناخۆش و تاڵی مردنی هاوڕێی شاخەوانی سوویسی کە لە دوای بەزاندنی ٩ لووتکەی ٨٠٠٠ میتری بەهۆی نەخۆشی دەروونی و تێکچوونی حاڵی لە نێو خێوەتەکەیدا دەمرێ زۆر ناڕەحەت بوو و نەیدەویست ئەو دەرسە تایبەتانەی ئەو ڕووداوە لە بیر خۆی بباتەوە، هەرچەند زۆر کەس ئەویان بەهۆی دووربوونی لە هاواڵەکەی بە تاوانبار دەزانی و وابزانم نەشیدەویست ویندا بەتەنێ جێ بێڵێ. گوتی من لەگەڵ ویندا دەڕۆمە خوارێ و دوایی دەگەڕێمەوە بۆ لووتکە. هەستم بە تاوان دەکرد، لەڕاست ئەوان وامدەزانی کە داوای من بۆتە هۆی ئەوە کە ئەوانم بەجۆرێک لە کارەکەیان پرینگاندۆتەوە، بەڵام هۆی ڕانەهاتنی ئەوان لەگەڵ کەشوهەوا کەمێک بیری منی ئاسوودە کردبوو.

بەیانی ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئارتۆر خۆمان گەیاندە بەرزایی ٧٥٠٠ میتری و لەگەڵ گۆڕانی کەشوهەوا بەرەوڕوو بووینەوە. وردە وردە بوو بە هەور و هەوا گەرم بوو. بەجێی ئاسمانی شین و سەرمای زۆر و لەوانە بوو ببێتە بارینی بەفر و ونکردنی ڕێگا. لە کاتی شەودا بەفر دەباری و تەپومژ هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو و هەردووکمان تووشی ناڕەحەتی ببووین. داوایەکم لە ئارتۆر کرد کە لە هیچ یاسایەکی شاخەوانیدا نەبوو، گوتم شەوێکی تریش لەو بەرزاییە دەمێنینەوە. لە کاتێکدا هیچمان حاڵمان باش نەبوو، دوای پێشوازی لە داواکەم چۆ نێو خێوەتەکە و دوای ڕۆژێک حەسانەوە، بە دەم بای بەیانییەوە بەرەو لووتکە وەڕێ کەوتین و دوای چەند کاتژمێر لە نێو مژو هەوردا چاومان بە لووتکە کەوت. ٢٠٠ میتر لە خوارەوی لووتکەکە پێویستمان

بە تەناف هەبوو کە بە دوو دالاندا تێپەڕ دەبوو و بۆ گەڕانەوەشمان باشتر بوو.

هەر کاتژمێرێکی مابوو بۆ تاریکبوونی هەوا. کاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ خۆمان گەیاندە لووتکە کە زۆر درەنگ ببوو. زۆر جار ئەو پرسیارە لە من دەکەن کە لەو کاتانەدا چ هەستێکم هەیە؟ ئەوەی ڕاستی بێ زۆر جار بەزاندنی لووتکەم لە بیر دەچێتەوە و هەموو بیر و هۆشم دەچێتە سەر ئەوە کە زوو بەرەو خوار ببمەوە و بەر لە هەوا تاریکبوون بگەڕێینەوە خێوەتەکەمان. لەکاتی شەودا دالانەکەمان تێپەڕ کرد و بە ڕووناکی چرا نێوچاوانەکانمان درێژەمان بە ڕێگادا و تا کاتژمێر ١٠ی شەو بەدوای خێوەتەکەماندا گەڕاین. دیار بوو مەودایەکی زۆرمان لەگەڵ خێوەتەکە نەبوو بەلام بەهۆی بارینی بەفری زۆر نەماندەدیتەوە کە لەپڕ لاقم لەسەر شتێکی نەرم هەڵخلیسکا، کە چاوم لێکرد تێگەیشتم خێوەتەکەی خۆمانە. لەخۆشیان نەماندەزانی چ بکەین، بەخۆشییەوە ڕێگاکە لەوێ بەرەوخوار هەمووی نیشانە کرابوو، بەلام ئەوەش نەدەبوو بە هۆی ئەوە کە ئێمە کەمتەرخەمی بکەین و لەوانە بوو بەهۆی بارینی بەفری تازە لە زۆر شوێنان لە ڕێگاکە ڕنوو بێ کە ئەوەش ببووە هۆی ترسێکی تر بۆمان. هەرکە گەیشتینە خێوەتگای تایبەت، ویندا و کریزیک خۆیان ساز کردبوو و دەیانهەویست بەرەو سەر وەرێ کەون و خۆشیان گەیاندبووە خێوەتگای چوار، بەلام بەهۆی نەخۆشی ویندا ناچار بوون بگەڕێنەوە. ئەگەرچی کریزیک لووتکەی زۆر بۆ گرینگ بوو بەلام نەیتوانی ویندا جێ بێڵێ و لەگەڵی گەڕاوە خوارێ.

دوازدەی فێوریە کۆتایمان بە کارەکە هێنا. خۆشحاڵ بووم کە کریزیک لە من نەڕەنجابوو. شاخەوانێکی ئیتالیاییش لەو بەرنامەدا بەڵگەی زۆری بەدەست هێنابوو. بەخۆشییەوە لەو بەرنامەیەش بێ کێشە و ڕووداوی تاڵ گەڕاینەوە ماڵێ.



## چاردەهەمین هەشت هەزار میتری

**شیشاپانگما، ڕەوەزەکانی ڕۆژئاوا، ساڵی ١٩٨٧**

لە کاتێکی درەنگ گەیشتینە هۆتێلێک لە نیالام و زۆر ماندوو و برسی بووین. دیارە کە یەکەمین پرسیار ئەوەیە کە گوتمان ئەو دەورووبەرە چێشتخانەی لێیە؟ بەڵێ. گوتمان زۆر باش ئەگەر وایە بۆمان ڕاسپێرە زۆرمان برسییە. نا، ئێستا هەموو شوێنێک داخراوە و هیچ جێگایەک نییە. گوتمان ئێمە ڕێگایەکی زۆرمان ماوە و زۆریشمان برسییە و لە بێبەختی ئێمەش چێشتکەری ئەو هۆتێلەش چۆتە سینەما. وا دیار بوو دەبوو خواردن لە بیرخۆمان بەرینەوە و بۆ شەوێک مانەوەشمان لەو هۆتێلە، ئەوەندی کەلک نەبوو کە دووبارە کەلوپەلەکان لێک ئاڵۆز بکەین. ئەوجار چووینە شەقامەکان و لە دەرگایەکمان دا کە دیار بوو چێشتخانە بوو و داوامان لێکرد کەمێکمان برینج و خۆرشت بۆ دروست کا. لە گەڕانەوەدا بۆ هۆتێل ویستیان کاتی لە خەو هەستانی بەیانیش بزانن. وەڵامی من ئەوە بوو، گوتم هەرچەند درەنگتر هەستین باشترە، کاتژمێر هەشت، نۆ. بە سەرسووڕمانەوە وەڵامیان دامەوە و گوتیان ئاوا

درەنگ؟! دیار بوو کاتەکانی ئێرە لەگەڵ شاری پیکەن ڕێکخسترابوو کە ٥ کاتژمێر نێوانی هەبوو· هەشتی بەیانی ئێرە نیوەڕۆی پیکەن بوو و بۆ ئەوان ئەوەیان بۆ نەدەسەلمێندرا و بەوجۆرە گرفتی کاتمان هەبوو·

ڕۆژەکانی دوایی زۆربەی ئەو کەسانەی لە گرووپەکەدا بوون دیاری کرابوون·

لە کۆتایی مانگی ژووەندا بووین کە یانەی ئێمەش لە کاتوویس بەڕێوەبەرایەتی وەئەستۆ گرتبوو و ئەو کەسانەی دیاری کردبوو: یانۆژ مارژ، ڕیزیک واریسکی، وێنەهەڵگر، ویندا ویتکۆویچ، دوکتۆر لۆخ کۆرنیژۆسکی، کارلۆس والسای میکزیکی، ڕامیرۆ لە ئیکوادۆر، ئالێن هینکس لە ئینگلیز و ئیستیڤ ئۆنیچ لە ئەمریکا· وا باشە ئەوەش بڵێم کە دوو ژنی شاخەوانی فەرەنسیش بە ئێمەوە زیاد بوون، کریستین کلۆمب کە لە بەرنامەی K٢ دا لەگەڵ ویندا بوو و مالگۆسیا فۆرمینتی· هەر لە سەرەتاوە هیچی چاکمان بۆ نەدەهات، لە لایەک پارەی زیادی بەهۆی خەرابوونی جادەی نێوان کاتماندۆ و کۆداری کە بەهۆی سێلاو تێکچووبوو· ئەوجار بارەکان وەک جاران بە شێوەی خۆماڵی پێچرانەوە و بەڕێکران و گەیشتینە سنووری سینۆ کە دەبوو بە هاوسێی نیپاڵ· بەو جۆرە ماڵئاواییمان لە نیپاڵییەکان کرد و لەوێ بەدواوە چینییەکان ئەو بەشەی کارەکانیان وەئەستۆ گرت و پێمان نا دنیایەکی تازەتر هەم لە باری چۆنیەتی وڵاتەکەیان و هەم لە باری دابونەریتی خەڵکەکەوە· بەخۆشییەوە شیشاپانگما جیاوازییەکی تایبەتی لەگەڵ هەشتهەزارییەکانی تردا هەبوو، ئەویش ئەوە بوو کەدەتتوانی بە ئۆتۆمبیل هەتا خێوەتگای تایبەت بچی· ئەو بەرزاییە ئەو تایبەتمەندییەی بەخۆوە گرتبوو کە لە بەرزایی ٢٤٠٠ میتری تا ٥٠٠٠ میتری دەتتوانی لە ئۆتۆمبیل کەلک وەرگری· لەو بڕوایەدا بووین لە هەموو بەرنامەکان بۆمان ئاسانتر بێ· لەپڕ دەستووری ڕاوەستان لە لایەن ئەفسەری بەڕێوەبەرەوە ڕاگەیاندرا و ئەو شوێنەی کە لێی ڕاوەستابووین وەک خێوەتگای تایبەت دیاری کرا کە ئێمە زۆرمان پێ سەیر بوو· وامزانی گاڵتەمان لەگەڵ دەکا، پێم گوت دیارە کە خێوەتگا تایبەتەکان لە داوێنی کێوەکان هەڵدەدرێن نەک ڕێگای دوو ڕۆژ و نیو

نێوانیان هەبێ، ئەوەشمان لە بیر بێ کە ئێمە بۆ کێو هاتووین نەک بۆ مەزرا! دیاربوو نەیدەسەلماند و دەیگوت من لەوە زیاتر نارۆمە پێشێ و لە بیری سلامەتی خۆم و کۆلکێشەکاندام. ڕاشکاوانە لە سەرەتاوە کێشە دەستی پێکرد و تازە بەوەش ڕازی نەبوون.

ئێمە بۆ ئەوەی کە سووتەمەنی لە نیپالەوە لەگەڵ خۆمان نەبەین، ڕامانسپاردبووە چین کە ١٠٠ لیترمان بۆ بنێرن، بەلام بۆ بێبەختی ئێمە وەجاغی نیپالی بە سووتەمەنی چینی کاری نەدەکرد و بێ سووتەمەنیش بەرنامەمان بۆ بەڕێوە نەدەچوو و نەشدەبوو هەر بیریشی لێ بکەینەوە. هەرچەند هەولمان دا لە دووکەڵ زیاتر بە نەسیبمان نەبوو تا لەپڕ ئەقلی یەکێک لە شۆفیرەکان بە هاوارمانەوە هات و بە تێکەڵکردنی بەنزین و نەوت بوو بەهۆی وەکارخستنی وەجاغەکانی ئێمە و چێشتێکی گەرممان خوارد. بۆنی سووتەمەنی ئۆتۆمبیلەکان بوو بەهۆی گرفتێکی تر بۆ زۆربەی هاوڕێیان لە بەرزاییدا کە زۆریان وە هەناسەبڕکە کەوتبوون و دەرشانەوە، هێندێک بەهۆی کەش‌وهەوای مەلبەندەکە دەیاننالاند و هێندێکیش جیاواز لەوانیان بە سەر هاتبوو. بەهۆی وەدەست هێنانی سووتەمەنی کەمێک ورەمان بەخۆوە گرت و یاکەکانیش گەیشتنە جێ. دیمەن و ڕوخساری ئەو خەلکە کە بە خۆش‌وتنیش خوویان نەگرتبوو و هەموو ئەندامیان چلک دایپۆشیبوو و وەک ئەوە دەچوو کە هەزار ساڵە هیچ گۆڕانێکیان تێدا وەدی نەهاتبێ. زۆر فەقیرن و بژیوی ڕۆژانەیان بەهۆی یاکەکانەوە بەدەست دێنن. ونبوونی هێندێک لە کەل‌وپەلەکان بوو بە هۆی زیاتر وشیاربوونەوەمان کە پێلاوەکانی کارلۆسیش لە ونبوونەکەدا بوون.

ڕێپێوانمان هەتا خێوەتگای تایبەت سێ ڕۆژی خایاند کە لە سەرەتاوە تووشی بەفر بارینێکی زۆر بووین و هاتنی ڕنوو کارەکەی کەمێک لێ سەختتر کردبووین کە بوو بە هۆی ئەوە هەر جارەی بەلایەکدا یاکەکان لێ‌بخوڕین. دەستمان کرد بە ڕێگاکردنەوە بۆ یاکەکان و هێندێکمان مابوو بۆ خێوەتگا کە لە بەرزایی ٥٦٠٠ میتری ناچار بووین دووبارە پارەی زیادی بدەین بە کۆلکێشەکان تا بارەکانمان بۆ بگەیەننە خێوەتگاکەمان. هۆکاری ئەوەش ڕێگایەکی بەردەلێن بوو کە یاکەکان نەیاندەتوانی تێپەڕ بن و لاقی یەکێکیشیان بریندار

بوو٠ سەرسوورهێنەر بوو کە حاڵی یانۆژ مارژ هەر لەوێ بەجۆرێک تێکچووبوو کە قسەی دەپەڕاند و ناچار بووین ئۆکسیژێنی بدەینێ٠ لە لایەن دوکتۆری گرووپەوە نەخۆشیی یانۆژ ئاوا دیاری کرابوو کە چۆنیەتی گەڕانی خوێنی لەش و توندبوونەوەی خوێن لە دەمارەکانیدا بوو٠ بەو جۆرە هەر ئەوەندەی توانی لە بەرنامەکەدا بەشدار بێ و هەر لە خێوەتگای تایبەت مایەوە و ئێمەی خۆشحاڵ کرد٠ جیا لە ئێمەش گرووپێکی ئیتالیایش لە مەڵبەندەکەدا بوون کە زۆریان نەمابوو کارەکەیان تەواو بێ، بەڵام نەیانتوانیبوو وەسەر کەون، بەهانەشیان ئەوە بوو دەیانگوت بەهۆی بەفری زۆر نەمانتوانیوە سەرکەوتوو بین کە بارینی بەفری زۆر، ڕێگای سەر لووتکەی لێ ون کردبووین٠ بڕێک لە باوەڕ بەدوور بوو و بێجگە لەوەش شیشاپانگما هاسانترین هەشت هەزار میترییە لە نێو لووتکەکاندا و وەک زۆرێک لە حەوت هەزارییەکان دەچێ٠ هەتا لووتکە دەبوو دالانێکی دوازدە کێلۆمیتریمان تێپەر کردبا و ئەوەش بوو بە هۆی ئەوە کە ئێمە داری لێنیشکە لەگەڵ خۆمان بەرین کە بتوانین لە زۆربەی ڕژدەکاندا کەلکی لێوەرگرین٠ (داری لێنیشکە دەبێتە داری ئیسکی یان خلیسکێن) لە هەوڵی ئەوەشدا بووم کە ئەگەر توانیبام دوو ڕێگای تازە هەڵبژێرم و دوو لووتکەی تریشم هەر لەو مەڵبەندە لە بەرنامەدا بوو٠ ویندا لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە سەرەتا ژنێک بێ لووتکە ببەزێنێ٠ ڕۆژی ٢٨ی ئۆکتۆبەر لە کاتی ڕێپێواندا شوێنی خێوەتگای یەکەممان دۆزییەوە و هەڵماندا و لەپڕ دەنگی پچڕانی ڕنوویەکمان گوێ لێبوو و خللۆر بوونەوەی بەفرەکانمان بە چاو بینی کە ئاگاداری کردینەوە و پێی سەلماندین کەهیچ کێوێک هاسان نییە٠ هەر ئەوندە دەزانم کە لەگەڵ ئارتور هەتا ئەو جێگایەی توانیمان بێ پێلاو بە گۆرەوییەوە لە شوێنی ڕنووەکە هەلاتین و دوور کەوتینەوە٠ ئەگەرچی هاوارمان کرد و گوتمان ڕنوو... ڕنوو... بەڵام هیچ هەوڵێکیان بۆ نەدرا تا بەخۆشییەوە ڕنووەکە لە نیزیک خێوەتەکە ڕاوەستا و ئەوانیش سەریان لە خێوەتەکە دەرهێنا و پەشۆکاو چاویان لە ڕنووەکە دەکرد و بەخۆشییەوە ئیتر ڕنوو نەهاتو٠ ڕۆژی دوایی بەهۆی ئەو ڕووداوە خولێکی تەواومان بە دەوری خۆماندا لێدا کە دەتوانم بڵێم یەک کیلۆمیتر دەبوو کە بە داری

لێنیشکە لێی تێپەڕیم. لووتکەی شیشاپانگما کەوتبووە لای ڕاستمانەوە و لووتکەیەکی کە هێشتا نەبەزێندرابوو لە لای چەپی کێوەکە خۆی دەنواند. خێوەتمان لە کۆتایی دالانەکەدا هەڵدا و بە زووترین کات لە سەر لووتکەی نەبەزێندراوی ئیبۆکانگاری دەستبەکار بووین کە بە ناوی هاوسەری شیشاپانگما دەناسرا کە لە بەرزایی ٧٢٠٠ میتری، بەرزایی لووتکەی تەببەتمان وەبەر چاو هات. سەرمای زۆر و بەفر و لەشی ماندوو ئازاری دەداین. لە گەڕانەوەدا کەلکمان لە داری لێنیشکە وەرگرت و خۆمان گەیاندەوە خوارێ و ئەوجار نۆبەی شیشاپانگما بوو. من و ئارتۆر چاومان لە ڕێگای ڕۆژئاوای لووتکەی نەبەزێندراو بوو. ئالینۆ و ئێستیویش چاویان لە ڕێگای باکوور بڕیبوو. ئەو وەسەرکەوتنەمان بۆ هەموو لایەک ئازاد کردبوو کە بە هەر جۆرێک دەیانهەوێ کار بکەن و بە هەر ڕێگایەکدا دەتوانن وەسەرکەون. شێوەی کارەکەمان هیچ وەک ئاسایی نەدەچوو و ئەوەش بەهۆی ئەوە بوو کە بەرگری لە ناڕازیبوونی هاوڕێیان بکەین و هەر کەس بۆخۆی ڕێگای وەسەرکەوتن و هاوڕێی خۆی هەڵبژێرێ. ئێمە دووازدە کەس بووین. هۆی ئەو بڕیارەش ئەوە بوو کە شوێنی شەومانەوەشمان باش بێ و تێیدا بحەسێنەوە و جێگا کەم نەبێ. من و ئارتۆر بڕیارمان دا کە داری لێنیشکەی دیزیک واریسکی هەتا ئەو شوێنەی بتوانین بۆی بەرینە سەرێ کە ئەو لە گەڕانەوەدا بتوانێ سوودی لێوەرگرێ. ئەوجار دەبوو چاوەڕوانی چۆنیەتی دۆخی کەشوهەوا بین. ئیتالیاییەکان بەهۆی بارینی بەفری زۆر نەیانتوانی وەسەر کەون و لە کۆتایی دالانەکەدا گەڕانەوە و مەڵبەندەکەیان جێهێشت. بەوجۆرە کارلۆس هەلی بۆ ڕەخسا و کەلکی لێوەرگرت و زۆرێک لە کەلوپەلەکانی لێ کڕین کە پێلاویشیان لەگەڵ بوو و بەو هۆیە ڕەگەڵ گرووپی بەزاندنی لووتکە کەوتەوە. بەڵام ئێمەش بە دەردی ئیتالیایەکان چووبووین و دوازدە ڕۆژی تەواو بەفرمان بە سەردا باری. چونکە بۆخۆمان چێشتمان لێدەنا، هەر ڕۆژەی جۆرە چێشتێکمان دەخوارد، چێشتی ئینگلیزی، فەڕەنسی و میکزیکی. نامەیەکم لە لایەن خۆمەوە بۆ ئەفسەری بەڕێوەبەر بەرێ کرد و داوام کرد بەڵگەی پێویستی بەزاندنی کێوەکەمان بۆ نوێ کاتەوە. لەگەڵ بەڕێکردنی ئەو نامەیە چۆنیەتی کەشوهەواش گۆڕا و خۆش

بوو و ئێمەش بەوجۆرە بە ڕێگای ڕۆژئاوادا و لە ڕەوەزێکی دەتوانم بڵێم زۆر سەخت نا دەستبەکار بووین کە وەک ڕێگای ژاپۆنییەکان دەچوو کە لە لیهستانە· گرووپێکیش لە ئالمان و ئۆتریش و سوویس، بە بەڕێوەبەرایەتی ئیشتفان ویرنێر هاتبوون· ئەوجار والسا، ویندا، کارلۆس، ڕامیر و واریسکیش بە ڕێگای تایبەتدا لە لووتکە نیزیک دەبوونەوە· بەو شێوەیە لە کاتی جیا جیادا بەرەو لووتکە وەڕێ کەوتین بەلام دەتوانم بڵێم هەموو بەیەکەوە گەیشتینە سەر لووتکەکە· لەو بەرزاییەدا هەموو لە سەر ئەوەی کە لووتکەی ڕاستی کێهەیە شەڕیان بوو و زۆربەیان دەیانگوت هەر ئەوەیە و هێندێکیشیان دەیانگوت ئەو لووتکەیەی ترە کە سێ کاتژمێر لەوێوە دوور بوو و ئەویان بە لووتکەی ڕاستی دەزانی· ئۆتریشییەکان هەر لووتکەی هەوڵێیان بە ڕاست دەزانی، وێنەیان گرت و گەڕانەوە· من و ئارتۆریش ڕێگای لووتکەکەی ترمان گرت و وەڕێ کەوتین· ئەگەرچی ڕێگاکە گۆڕابوو بەلام سێ کاتژمێر لە بەرزایی ٨٠٠٠ میتریدا کارێکی ئاسان نییە· هیچ نیگەرانییەکمان نەبوو چونکە کەلوپەلی شەومانەوەمان لەگەڵ خۆمان هێنابوو· هەتا ئێرەش کارلۆس و ڕامیر لە سەر داوای خۆیان دارەکانی لێنیشکەیان بۆ هێنابووین· ئەوەش بەو هۆیە بوو کە بڕیار درابوو هەرکەس بە دڵی خۆی کار بکا· بە هەموویانم گوت کە بە ڕێگای تایبەتدا بگەڕێنەوە چونکە لەوانەیە وەبەر شەوێ کەون، بەلام بەجۆرێک وەلامیان دامەوە کە گۆیا چراقەوەیان پێیە· خۆمان گەیاندە بستووی نێوان هەر دوو لووتکە· لەو شوێنە قسەمان لەوە کرد کەخێوەت هەڵدەین و بەیانی زوو لەگەڵ زەردەی هەتاو لووتکە ببەزێنین کە ئەو کارەم بە گاڵتە زانی چونکە مەودامان لەگەڵ لووتکە زۆر کەم بوو کە گوتم با وەڕێکەوین بۆ لووتکە· واریسکی زووتر لە من خۆی گەیاندبووە لووتکە و بە دووربینە فەڕەنسییەکەی دەستی کردبوو بە وێنە هەڵگرتنەوە· کاتێک من گەیشتمە سەر لووتکە وێنەی منی بە داری لێنیشکەوە گرت· ئەوانی تریش بەر لە من گەیبوونە لووتکە و گەڕابوونەوە خوارێ· هەتاو ئاخرین تیشکەکانی خۆی بە سەر کێوەکەدا دەپرژاند و وێنەی هەڵگیراوی ئەو کاتە، ڕاستییەکانی بەجۆرێک نیشان دەدا کە بۆم باوەڕ نەدەکرا کە لە سەر لووتکەیەک

ڕاوەستابووم کە ئاخرین ٨٠٠٠میتریی من بوو، بەڕاستی نەمدەزانی کە چلۆن هەستێکم هەیە و نەمدەزانی چۆنی دەربڕم. لەبیرمە جارێک لە نانگاپاربات توانیم بە شێوەیەکی غەمناکەوە هەستی خۆم دەربڕم، بەڵام نازانم بۆچی ئێستا نەمدەویست ئەو کارە بکەم. لەوانەیە بەهۆی ئەوە بووبێ کە چون لووتکە هشت هەزاریەکان کۆتاییان هاتبوو یان لووتکەی تر مابوو بیری لێبکەمەوە. ئەوجار بەئارامی لەو شوێنە دوور کەوتمەوە و لە تاریکیدا بۆ لای خێوەتەکەم وەڕێ کەوتم. ئەو شەوە بەهۆی ونبوونی یەکێک لە تیرەگەکانی خێوەتەکە زۆر تاڵمان لێ ڕابوارد و ڕۆژی دواتریش نۆرەی بەربەرەکانی لەگەڵ تاڵییەکی تر بوو. بە داری لێنیشکە هاتینە خوار، ئەگەرچی بۆخۆم زۆر شارەزا بووم، بەڵام لە سەر بەفری بەستەڵەک نەک لە هەشتهەزار میتری و لە نێو بەفرێکی شل کە هیچ تێیدا شارەزا نەبووم و ٢٠ کیلۆشم بار پێبوو. زۆر بە سەبری دەڕۆیشتم، وەک ئەوەی
کە هەنگاویش هەڵنەهێنمەوە وابوو. ئارتۆر لە پشت سەرمەوە دەهات. ئەو جۆرەی کە لە سەرەتاوە بیرم لێدەکردەوە نەمدەتوانی بڕۆم و خۆم بگەیەنمە خوارێ. ئەوەی ڕاستی بێ کاتژمێرێک زووتر لە ئارتۆر گەیشتمە خوارێ کە ئەویش وردە وردە بە سەر بەفرەکەدا دەهات. وینداش چوارەمین ٨٠٠٠میتری بوو کە دەیبەزاند و والساش یەکەمین ژنی ئامریکای باشوور بوو کە پێی دەنا سەر لووتکەی هەشت هەزار میتری و بە ناوی کەمتەمەنترین ژن لە ٢٣ساڵیدا ئەم پلەی بە دەست دەهێنا.

ڕێگای ئالین وایستۆ لە سەر دالانی باکوورەوە زۆر جوان و ڕازاوە بوو. ڕیزیک واریسکیش یەکەمین لێهستانی بوو کە لە شیشاپانگما وەسەر دەکەوت و من و ئارتۆریش بێجگە لەو لووتکەیە دوو لووتکەی دەوروبەریشمان بەزاندبوو. ئەوجار وەک ڕەگباری موسەلسەل ناوی لووتکە هەشت هەزاریەکانم بە مێشکدا تێپەڕ بوو، چاردە جار هەشت هەزاری و تەواو. بەڵام بەڕاستی ئەو ڕووداوانە کۆتاییان هاتبوو؟ نا بەڕێزان، دنیای دوورودرێژی من هەرگیز کۆتایی نایا و هەمیشە هەیە و دووبارە دەگەڕێمەوە. جارێکی تریش بەو جۆرە ئەو بیرەم بە مێشکدا هاتبوو. کاتێک کە لە نانگاپاربات تێکیشکاندبووم، من دووبارە

گەڕابوومەوە، بەڵام بۆچی؟ چونکە هیمالییا بۆ مرۆڤەکان دروست بووە، بەڵێ حەق بە من بوو…

کریستۆف ویلیسکی لە وتەکەی کە لە نێو کتێبی دنیای دووردرێژی مندا هاتووە، لە بارەی کۆکۆشکا لە کوتاییدا ئاوا دەنووسێ: «ژیانی کۆکۆشکا بە شێوەیەک بوو کە ئاوات و داواکانی ئەویان لە نێو کێوەکاندا پاڵ پێوەدەنا و دەژیا. نە لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە خۆی بە خەڵک بناسێنێ نە ئەوەی لە نێو ڕۆژنامە و ڕاگەیەندراوەکاندا خۆی بنوێنێ، قەت چاویشی لە ناوی پاڵەوانییەتی نەبوو، بەڵکوو بیروباوەڕێکی زۆر پتەو و قایمی هەبوو کە لە تایبەتمەندییەکانی کێوی بەدەست هێنابوو. بوونی کۆکۆشکا لە نێو هەر گرووپێکی شاخەوانیدا با، بەجۆرێک ناوی دەرکردبوو کە هەر ناویان هێنابا هەموویانی دڵنیا دەکردەوە بۆ بەزاندنی ئەو لووتکەی کە لەو بەرنامەیە دابا. کۆکۆشکا دەیهەویست بە لابەلای ڕێگای کانگ‌چین چۆنگا و بەزاندنی ڕەوەزی ڕێگای باشووری لۆتسەدا وەسەر کەوێ کە ژووەنی ساڵی ١٩٨٩ یانەی کاتوویس بەرنامەیەکی بۆ بەزاندنی ڕەوەزەکانی باشووری لۆتسە بەڕێوە برد. ئەو شوێنەی کە من و ئارتۆر هایزێر سێ جار لە ساڵەکانی ١٩٨٥، ١٩٨٧ و ١٩٨٩دا تێکشکابووین و ببووە هۆی ئەوە کە تا چەند ساڵی تریش بیری لێنەکەینەوە، بەڵام بەهۆی بوونی کۆکۆشکا لەو بەرنامەدا و بەتایبەت گرووپی نێونەتەوەیی ڕینهۆل مێسنێریش کە لە تێکۆشانێک هەر لەو ساڵەدا نەیانتوانیبوو وەسەر کەون، ئێمە لێهستانییەکان چوار جار لە سەر ئەو ڕێگایە کوشتەمان دابوو

کە جارێک هەر ٢٠٠ میترمان مابوو کە لووتکەکە ببەزێنین، بەڵام وابزانم گاڵتەی ڕۆژگار ئاوای پێدەکردین کە دەبێ کەسانی تر کارەکە بە ناوی خۆیان کۆتایی پێبێنن، چونکە کۆکۆشکاش هەر لەو شوێنە و لە نیزیک ئەو جێگایەی کە من و ئارتۆر لە ساڵی ١٩٨٧ گەیبووینێ و لە ژێر لووتکەکەدا هەودای ژیانی پسا و وەک ڕووداوێکی دڵتەزێن لە کێودا تەنافەکەی پسا و لە ڕێکەوتی ٢٤ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٨٩ کەوتە نێو هەڵدێری خوارەوی کێوەکە و بۆ هەمیشە تێکەڵ بە سەهۆڵەکانی لۆتسە بوو. لە ڕێوڕەسمی پرسە و سەرەخۆشییەکەیدا خەڵکێکی زۆر لە ناسیاو و نەناسیاو بەشدارییان هەبوو و هۆکارەکەشی توانای کۆکۆشکا بوو کە ئەو هەموو خەڵکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. ئەو ڕۆژە بیرەوەرییەکی زۆر دڵتەزێن بوو کە کلیسای کاتوویسمان بە ئارامی و بەبێدەنگی جێهێشت.

زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | نرخ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٦٦٨ | گەڵای پاییز | عەبدولقادر عەلی مەردان | بیرەوەری | ٥٠٠٠ | ٤٠٠ |
| ٦٦٩ | گەمەی گەرمی سیاسەت دەشلەقێنێ | نوید خۆشناو | گشتی | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٧٠ | دوران های زبان کردی و مجموعه زبان های ایرانی | و. مستەفا ئیلخانی زادە | زمان | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٧١ | خلاصە تاریخ کردستان | احمد قاضی | مێژوو | ٥٠٠٠ | ٤٤٨ |
| ٦٧٢ | بزەی شۆڕش (دیوانی شیعری مامۆستا رلوجی) | کۆکردنەوەی کاوەی کوڕی مامۆستا رلوجی | شیعر | ٣٠٠٠ | ٢٨٠ |
| ٦٧٣ | کاتێك ئەزموونەکان دەدوێن | و.کەریم سۆل | ئەدەب | ١٥٠٠ | ١٢٨ |
| ٦٧٤ | سیلبیەکان٣ | شێرزاد هەینی | گشتی | ٢٠٠٠ | ٢٥٦ |
| ٦٧٥ | مەرگی وەنەوشە | یاسین قادر بەرزنجی | چیرۆکە هەواڵ | ٤٠٠٠ | ٤٣٢ |
| ٦٧٦ | گەمەی مێشك | ئا: رەمزی مەلا مارف | زانیاری | ٧٠٠٠ | ٣٤٤ |
| ٦٧٧ | پیاوی ئەشکەوت دڵێکی هەبوو | شێرکۆ هەورامی | شیعر | ٣٠٠٠ | ٣٣٢ |
| ٦٧٨ | گەردوون ناسی لەبەر سێبەری قورئان و زانست | غەریب عەلی عەزیز | زانستی | ٣٠٠٠ | ١٧٦ |
| ٦٧٩ | گەشتەکەی زینۆفۆن | و: محمد مسعود محمد | مێژوو | ٣٠٠٠ | ٢٦٤ |
| ٦٨٠ | دیاردەو ڕاڵە | ئازاد دارتاش | گشتی | ٢٠٠٠ | ١٩٢ |
| ٦٨١ | تیۆری هاوچەرخ لە کۆمەڵناسیدا | پرۆفیسۆر دکتۆر طاهر حەسۆ زێباری | سۆسیۆلۆجیا | ٤٠٠٠ | ٢٨٨ |
| ٦٨٢ | الادب الشفاهي الكوردي (مرة أخرى) | علي الجزيري | أدب | ٣٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٦٨٣ | پێناسەو ڕاڵەی کۆمپیوتەر | ئارێس نوری ئەحمەد | IT | ٥٠٠٠ | ٥٢٨ |
| ٦٨٤ | کۆدە خوێنییەکانی جەلیل کاکەوەیس | کۆکردنەوەو ئا: ئاکار جەلیل کاکەوەیس | مێژوو | ٢٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٦٨٥ | لە ژێر ساباتی کوردەواری دا | ئەبوبەکر شوان | فۆلکلۆر | ٢٠٠٠ | ٢٥٦ |
| ٦٨٦ | ڕێچکەی سەربەخۆیی | عەلی سام ئاغا | سیاسی | ٢٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٦٨٧ | مێژووی مەسیحییەت لە کەرکوک و باکەرمێ | جمیل عیسی | مێژوو | ٣٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٦٨٨ | کە مێژوو لە بارزانی دەدوێ | زانیار سەردار قرگەیی | مێژوو | ٣٠٠٠ | ٢٥٦ |
| ٦٨٩ | وشە نامە | حەمەساڵح فەرهادی | ئەدەب | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٦٩٠ | دیوانی عاصم | د. کەمال مەعروف | ئەدەب | ٢٠٠٠ | ٢٨٠ |
| ٦٩١ | مانیدو | فەرزین کەریم | سینەما | ٢٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٩٢ | هەبوو نەبوو | و. شۆڕش گوڵکار | گشتی | ٣٠٠٠ | ١٢٨ |
| ٦٩٣ | فەرهەنگی پەسەن (بەرگی یەکەم) | دانانی: محەممەدساڵح پێنجوێنی (چکەڕەش) | فەرهەنگ | بۆ هەردوو بەرگ ١٠٠٠٠ | ٥٢٠ |
| ٦٩٤ | فەرهەنگی پەسەن (بەرگی دووەم) | دانانی: محەممەدساڵح پێنجوێنی (چکەڕەش) | فەرهەنگ | بۆ هەردوو بەرگ ١٠٠٠٠ | ٣٢٤ |
| ٦٩٥ | فۆلکلۆری خۆشناوەتی | محەمەد جەمال توتمەیی | فۆلکلۆر | ٢٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٦٩٦ | تەنیا خەمی گوڵە مێخەکەکانە | جنوور سەعیدی | چیرۆك | ٢٠٠٠ | ١١٦ |
| ٦٩٧ | حەقایەت و قسە خۆشەکانی باوکم | د. ئیدریس عەبدوڵلا | فۆلکلۆر | ٢٠٠٠ | ٣٠٤ |
| ٦٩٨ | سیناریۆکانم | عەدنان عوسمان | سینەما | ٢٠٠٠ | ٢٣٢ |
| ٦٩٩ | ئاسناو | ئیرەج عیبادی | ئەدەب | ٢٠٠٠ | ١١٢ |
| ٧٠٠ | هاوبیان | فازڵ هاوبیانی | مێژوو | ٤٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٧٠١ | توێژینەوەکانی کۆنفرانسی زانستیی زمانی کوردی ١٩ – ٢٢/ئەیلولی ٢٠١١ | ئا: لیژنەی بەدواداچوونی کارەکانی کۆنفرانس | زمانەوانی | ٢٠٠٠ | ٥٢٨ |
| ٧٠٢ | دەستەواژە نوێیەکانی میدیاو پێوەندییکردن | و: بەهزاد حەویزی | ڕاگەیاندن | ٢٠٠٠ | ١٧٦ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ۷۰۳ | جوگرافیای دێ نشینی ( کوردستانی عیراق وەک نمونە) | د. خلیل اسماعیل محمد م. ئەیوب خەلیل ئیسماعیل | جیۆستراتیژی | ۲۰۰۰ | ۲۰۰ |
| ۷۰٤ | وتەکانی ناوبانی کورد و جیهان | ئا – کۆکردنەوەی: مەهدی بێدلوی | گشتی | ۲۰۰۰ | ۲٤۰ |
| ۷۰٥ | بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەو سیاسەتی نێودەوڵەتی | و: هاوڕێ سورخابی | سیاسی | ٤۰۰۰ | ٦٤۰ |
| ۷۰٦ | خۆشی و شۆخی | رەفیق مەلا کەرەم ستونی | گشتی | ۲۰۰۰ | ۱٥٤ |
| ۷۰۷ | دوعاو نزای مەناسیکی حەج و عومرەو زیارەتی مەدینەی مونەوەرە | محەممەد ئەمین جەمیل موفتی | ئایینی | ۳۰۰۰ | ۲۰۸ |
| ۷۰۸ | موقد الثلج الاسطورة في الشعر الكوردي الحديث | ناجح المعموري | أدب | ۳۰۰۰ | ۱۸٤ |
| ۷۰۹ | تیمۆجین – ناخەرین ساموورای | ڤینۆس فایەق | ئەدەب | ۲۰۰۰ | ۱۱۲ |
| ۷۱۰ | الوسائل البديلة عن القضاء، لحل النزاعات | زينب وحيد دحام | قانونی | ۳۰۰۰ | ۲۰۰ |
| ۷۱۱ | فۆتۆشۆپ CS5 | ن. ئا: نەریمان بەهرام محەمەد | IT | ٦۰۰۰ | ۲۸۸ |
| ۷۱۲ | دیوانی میرزا ئەولقادری پاوەیی | کۆکەرەوەو نووسینی موحەممەد رەشیدی ئەمینی | شیعر | ۳۰۰۰ | ٥۲۰ |
| ۷۱۳ | نەوت و دیکتاتۆریی (ئابووریی سیاسیی وڵاتانی هەناردەی نەوت) | و: د. شەماڵ حەویزی | ئابووری | ۳۰۰۰ | ۹٦ |
| ۷۱٤ | ئەزموونی من لە خەرمانی ئەدەب و وەرگێڕانەوە | ئیحسان سابیر خەیات | ئەدەب | ۲۰۰۰ | ۲۱٦ |
| ۷۱٥ | زمانی ئاڤێستا سەرچاوەی زمانی سانسکریت و رەنگ ڤیدلوە کوردی ئەمڕۆ | ئیسماعیل ئەیوبی | مێژوو | ۲۰۰۰ | ۱٦۰ |
| ۷۱٦ | هەورازەکانی دنیا | رەزا سەیدگوڵ بەرزنجی | چیرۆک | ۲۰۰۰ | ۹٦ |
| ۷۱۷ | ئاخاوتنەکانێ دەربارەی کورد | و: جەمال گردەسۆری | ئەدەب | ۱۰۰۰ | ۱۰٤ |
| ۷۱۸ | بێدەنگی شەوان | ئاسۆ حەسەن | هونەر | ۳۰۰۰ | ۳۰٤ |
| ۷۱۹ | بەندیخانەی بلوسۆتین | ئازاد کەریمی | کورتە چیرۆک | ۳۰۰۰ | ۱٥۲ |
| ۷۲۰ | العوامل الأقتصادية والأجتماعية والمالية وأثرها على التنمية الأقتصادية | الهام وحيد دحام | اقتصاد | ۳۰۰۰ | ۱٤٤ |
| ۷۲۱ | گوندەکەم | حەمەکەریم هەورامی | شانۆگەری | ٤۰۰۰ | ٤٤۰ |
| ۷۲۲ | دیوانی تاریق تاڵەبانی | تاریق تاڵەبانی | شیعر | ۲۰۰۰ | ۳۰٤ |
| ۷۲۳ | ئەفسانەکانی بەر ئاگردان | شاخەوان عەلی حەمەد | فۆلکلۆر | ۲۰۰۰ | ۲٤۸ |
| ۷۲٤ | وەچەرخانە کردارییەکان لەبواری سیاسەتدا | ماجید نووری | فکری سیاسی | ۳۰۰۰ | ۲٤۸ |
| ۷۲٥ | بەیتی سیسەبان | مێمن عومەر خۆشناو | فۆلکلۆر | ۲۰۰۰ | ۱٥۲ |
| ۷۲٦ | القفز في محيط هادر | رحاب حسين الصائغ | نقد | ۲۰۰۰ | ۱٥۲ |
| ۷۲۷ | مارکس و ئازادی | و. دانا شوانی | فەلسەفە | ۲۰۰۰ | ۸۰ |
| ۷۲۸ | کوڕی چیا | و. موکەرەم رەشید تاڵەبانی | کۆ چیرۆک | ۳۰۰۰ | ۱٤٤ |
| ۷۲۹ | مێژووی بزوتنەوەی بابی و بەهاییەکان | هاشم هاسی کاکەیی | مێژوو | ۳۰۰۰ | ۱۰٤ |
| ۷۳۰ | الكرد في كتابي اليعقوبي والطبري | د. أحمد عبدالعزيز محمود | دراسة | ۳۰۰۰ | ۱۲۸ |
| ۷۳۱ | کەسایەتی لەنێوان سەرکەوتن وسەرنەکەوتن | و. جیهان عومەر | کۆمەڵناسی | ۳۰۰۰ | ٤۲۸ |
| ۷۳۲ | بکوژان دەگرییەن | و. ئاری سویجی کۆیی | چیرۆک | ۳۰۰۰ | ۲۰۰ |
| ۷۳۳ | القتل بدافع الشرف | فساد محمد علي المرزاني | قانون | ۲۰۰۰ | ٤۷۲ |
| ۷۳٤ | هەسارتوە ومرم* زریا –۲– | رەئوف مەحموودپوور | لێکۆڵینەوە | ۲۰۰۰ | ٤۰۸ |
| ۷۳٥ | کەلەشێری مل ڕووت و ڕەنگدانەوە سیاسییەکانی | شوان نافع خورشید | شانۆگەری | ۲۰۰۰ | ۱۰٤ |
| ۷۳٦ | گوڵ و گیا – ۱ | قادر باوەجان | زانستی رووەکناسی | ۱۰۰۰۰بۆ هەردووبەرگ | ۳۹۲ |
| ۷۳۷ | گوڵ و گیا – ۲– | قادر باوەجان | زانستی رووەکناسی | ۱۰۰۰۰بۆ هەردووبەرگ | ۳٦۸ |
| ۷۳۸ | بیرەوەرییەکانی جێرزی کوکوشکا | و. عوسمان هاشمی زاد | یادەوەری | ۳۰۰۰ | ۱۹۲ |